به ڕۆحی مەزنی

" مەولانای شارەزووری "

پێشکەش بێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

## کەسایەتییە دیاریەکانی ناو ڕۆمانەکە :

١. موهتەدا
٢. مەنسووری عەتتار
٣. مەریەمی مەلەکووتی
٤. میهری
٥. مەعسومە
٦. مەلای گەورە
٧. نازداری مەلەکووتی
٨. سمکۆ
٩. کاك عەبدوڵڵای مەنگوری
١٠. مەلا عاسی
١١. ڕاز
١٢. ڕاوێژ
١٣. شاروخ
١٤. جوتیار
١٥. یوسوف
١٦. سەیوان
١٧. مامۆستا ئەحمەد
١٨. خاڵە مەولود
١٩. فاتیمە
٢٠. لاڤە
٢١. سێبەر خان
٢٢. ئالان
٢٣. کەمال
٢٤. شاسوار
٢٥. نەسرین خان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ١ -

## مەنسووری عەتتار

" مەنسووری عەتتار " یەکێك لە ناودارانی شارەکەی خۆی بوو، بە ئیش و کاری عەتتاری یەوە خەریك بوو، خاوەنی بنەماڵەیەکی ناودار و خانەدان بوو، باپیرانی – یەك لە دوای یەك – بەشداری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردستانیان کرد بوو ، " مەنسوور " پیاوێکی ژیر و عەتتارێکی لێزان بوو، لە "ئەستەمبوڵ و حەڵەب و دیمەشق"ە وە بۆنی جۆراوجۆری بە کوپە و مەرکانەی گەورە بۆ ڕەوانە دەکرا و ئەویش بە جوانترین شێوە و زانستییانەترین ڕێگا ماددە سەرەتاییەکانی تێکەڵ دەکرد و بۆنی سەیر و فێنکی لێوە بەرهەم دەهێنا...

کەسانێك هەبوون هەوڵیان دەدا – لە چەند ڕێگەیەکەوە – نهێنی ئەو پیشەیەی لێوە فێر ببن و پاشان کێبەرکێی بازاڕی ئەوی پێ بکەن، بەڵام نهێنی ئەو تێکەڵ کردنانە تەنانەت نزیکترین کەس لە "مەنسوور"ە وە پەی پێ نەدەبرد و نەیان دەتوانی ڕێژە و جۆر و ڕادەی تێکەڵ کردنەکان شارەزا ببن، " مەنسوور " بە هەموو ئەوانەی دەیانویست نهێنی پیشەکەی لێ بدزن دەیوت : وەرن ئێوەش دوکان دابنێن و من هەموو جۆرە بۆنێکتان پێ دەدەم و بازاڕتان بۆ دەکەمەوە...

" مەنسور " دەستی زۆربەی عەتتارەکانی ناوچەکەی گرت بوو ، ئەو بوو فێری کەسابەتی کرد بوون ، بە بەردەوامی بە پێدانی بۆنی جۆراوجۆر کە خۆی بەرهەمی دەهێنا کۆمەکی دەکردن، بەڵام چەند کەسێك لەوانە چاوچنۆك بوون و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەیانویست نهێنی ئەو زانستە دەگمەنەی بۆنی دڵڕفێنی پێ بەرهەم دەهێنێت فێر بن ، هەموو ئەو کەسانە هیچیان دروێنە نەکرد و لە کار و کاسبی بازاڕیشدا پاشەکشێیان کرد، مەگەر کەسانێك دەستی خۆیان بخستبایەتە ناو دەستی "مەنسووری عەتتار " و وەك بازرگانێکی لێزان و مامۆستایەکی عەتتار کاری لێوە فێر بوونایە...

عەتر و بۆنی " مەنسوور " بە ئەندازەیەك ناوبانگی دەرکرد بازرگانیی پێچەوانەی بۆ دروست بوویەوە و زۆرجار هەر ئەوانەی لە ئەستەمبوڵ و حەڵەب و دیمەشقەوە کەرەستەیان بۆ دەنارد داوایان لێ دەکرد دوای دروست کردنی بۆنی ناوازە لەو کەرەستانە جارێکی تر "مەنسوور " بۆیان ڕەوانە بکاتەوە ، چونکە لە لای ئەوان بۆنەکانی ئەو داواکارییەکی زۆری لەسەر بوو، جارێك لە حەڵەبەوە دەستەیە عەتتار کۆ دەبنەوە و دێنە سەردانی " مەنسوور " و چەند شەو و ڕۆژێك لە لای دەمێننەوە تاکو لە نهێنی زانستی تێکەڵ کردنی ئەو بۆنانە تێ بگەن و بتوانن لە دوای گەڕانەوەیان بۆ خۆیان دروستی بکەن، دەڵێن "مەنسوور "پێی وت بوون: (گەر بەدیار چاوتانەوە و لەبەردەمی ئێوەدا بۆنێك دروست بکەم دواتر دەتوانن وەکو ئەوەی من ئامادەی بکەنەوە ؟)

ئەوانیش دەڵێن: تەنها یەکجار لەبەردەم ئێمەدا کارەکەت ئەنجام بدە و بڕ و ڕێژەکانمان پێ بڵێ)

ئەویش پێیان دەڵێت: بەڵێن دەدەن دوای ئەوە هیچی ترم لێ داوا نەکەن؟)

ئەوانیش دەڵێن : بەڵێن بێت...

" مەنسوور " دەیانباتە تاقیگە فراوانەکەی تەنیشتیماڵەکەیان و پێنج کەمۆڵەی گەورەی عەتر لە ڕەفەکاندا دادەگرێت و لە هەریەکەیان بە ڕێژەیەك دەچۆڕێنێتە کەمۆڵەیەکی خاڵی یەوە و پاشان بۆ ماوەی نیو کاتژمێر سەری کەمۆڵەکە دادەپۆشێت و ئەوجا سەری بەرز دەکاتەوە ، هەندێکی لە دەستماڵێك دەدات و بە لوتی عەتتارەکانیدا دەدا، پاش کەمێك هەموو خەویان لێ دەکەوێت و کاتێك بە ئاگا دێن هیچیان دەربارەی ماددەکان و ڕێژەی تێکەڵ کردنەکان لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بیر نەماوە ، لەو کارەی "مەنسوور"ە وە عەتتارەکان بۆیان دەرکەوت "مەنسوور" زۆر زاناترە لەوەی ئەوان بیریان لێ دەکردەوە ، بۆیە بە ڕێگەیەکی تر بۆی دێن و دوو خاڵ دەخەنە بەردەمی: یەکەمیان پێ فرۆشتنی نهێنی ئەو زانستە بە پارەیەکی زۆر، دووەمیان ماڵەکەی بهێنێتە حەڵەب و خانو و دوکانی لەسەر ئەوان بێت و هەر هەموو پێکەوە بازرگانی بە بۆن بکەن ، لە وەڵامیاندا " مەنسوور " دەڵێت: ناتوانم ولاتی خۆم بەجێ بهێڵم ، فرۆشتنی ئەو زانستەش ناپاکی و پەیمان شکێنییە بەرانبەر بەو بەڵێنەی بە مامۆستاکەم داوە ، چونکە داوای لێ کردووم نهێنی پیشەکە بپارێزم و تەنها یەك کەس — ئەویش ئەگەر پێویست بێت — ئەو کارە لە منەوە فێر ببێت ، دیاری کردنی ئەو کەسەش دیسان لە دەستی مندا نییە...

بازرگانەکان بۆ ولاتی خۆیان دەگەڕێنەوە و تەنها بەڵێنی ئەوەی لێ وەردەگرن بە بەردەوامی کۆمەکیان بکات و لەو جۆرە بۆنە نایابانەیان بۆ بنێرێت ، " مەنسوور " یش داوا لەوان دەکات لە ناردنی کەرەستەی خاو و ماددەی سەرەتایی دەستیان نەگۆڕن و هەروەکو جاران بۆی ڕەوانە بکەن...

" مەنسووری عەتتار " چەندین نەخۆشی بە بۆن چارەسەر دەکرد، جۆرە بۆنێکی دروست دەکرد مرۆڤی خەمۆکی دەهێنایە پێکەنین و سەما و سروور، دەیتوانی لە ڕێگەی بۆنەوە ئەو ژن و مێردانەی بەرانبەر یەکتری سارد و بێ مەیلن گەرمیان بکاتەوە و خۆشەویستی بخاتەوە نێوانیان ، بەهۆی جۆرە بۆنێکەوە شەوق و هیوای بە پیرە مێردەکان دەبەخشی و نەی دەهێلا ڕووبەڕووی خەمۆکی و تەنهایی تەمەنی پیری ببنەوە، بۆنی گەنجانەی دروست دەکرد و هەموو گیانیانی پڕ لە خۆشی و جوانی دەکرد، کەسی تووش بوو بە نەخۆشی " دوو کەرتبوونی کەسایەتی " لە لای " مەنسوور " بە بۆنێکی تایبەت ئارام دەکرایەوە و دەبوویەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی...

ناوبانگی " مەنسوور " بۆ بۆنی دڵ ڕفێن هەروەك بۆنە خۆشەکانی بە هەموو لایەکدا پەرش و بڵاو بوو بوویەوە ، لە " شام و ئێران " دا مەنسووری عەتتار دەناسرا و قسە و باس لەسەر بۆنەکانی دەکرا بە تایبەت دوای هاتنی ئەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کۆمەڵە عەتتارە و بڵاوکردنەوەی ئەو ڕووداوە سەیر و سەمەرەی لە عەتتارەکان ڕووی دا و " مەنسور " بە بۆن خەوی لێ خستن...

جارێك " شاژن " ی ئێران چەند پیاوێکی خۆی ڕەوانەی لای "مەنسووری عەتتار " دەکات ، ئەوانیش داوای لێ دەکەن بانگهێشتێکی شاهانە قبوڵ بکا و سەردانێکی " ئێران " بکات ، "مەنسوور " ترسێك گیانی دادەگرێ و دەچێتە لای " پیری مەزن " و لەو بارەوە پرس و ڕای پێ دەکات ، ئەویش مۆڵەتی دەدا و پێی دەڵێت: دەتوانیت بەدەم بانگهێشەکەوە بڕۆیت ، بەڵام لە بیرت بێ ئەوەی پێت دراوە زانستێکی زۆر تایبەتە و بەهرەیەکی خوداییە و مامەڵەی دونیایی لەگەڵ دەسەڵاتداراندا لەسەر ناکرێت ، بە عیززەتی شاهانەوە برۆ و بە سەربەرزییەوە بگەڕێرەوە ، ئەگەر کارێکت بۆ کرد و ویستت بەرانبەری لێ وەر بگریت ئەوا داوای بەردانی ئەو گوندنشینانە بکە بە تاوانی پشتگیری کردن لە نەیارانی " شا " ی ئێران زیندانیی کراون...

" پیری مەزن " لە بنەماڵەیەکەوە هات بوو بە زانست و عیرفان بەناوبانگ بوون، ئەوان ئەو سەرچاوەیە بوون بە بەردەوامی ئارامی و ئاسودەییان بەسەر مەردووماندا پەخش دەکرد ، ئاوێکی سازگار بوون سارا و بیابانیان پاراو دەکرد، نوورێکی ڕۆشنی سەر لوتکەی چیایەك بوون لە شەوە نووتەکەکاندا هەزاران ڕێبواری وێڵیان ڕێنموویی دەکرد...

" مەنسوور " لەگەڵ ئەو چەند پیاوەدا بۆ " ئێران " بەڕێ دەکەوێت و پاش چەند ڕۆژێك دەگەن و پێشوازییەکی گەرم و گوڕ دەکرێ و دەیبەنە جێگەی حەوانەوە ، بۆ بەیانی " شاژن " پیاوێك لە دووی دەنێرێت و بۆ کۆشکەکەی دەبەن ، دوای بەخێرهاتن "شابانوو" پرسیاری نهێنی ئەو زانستەی لێ دەکات و ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەوە زانستێکە تایبەتە بە خۆم و ناتوانم لای کەس باسی لێوە بکەم، چونکە بەڵێنم بە مامۆستاکەم داوە بۆ کەسی نەخەمە ڕوو...

" شابانوو " پرسیاری مامۆستاکەی دەکات ، لە وەڵامدا "مەنسوور" دەڵێت: ناتوانم ناوی بهێنم و دیسان ئەوەش ئەمانەتە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شاژن پێی دەڵێت: زانینی ئەو نهێنییە و ناوی مامۆستاكەت لای من گرنگ نییە ، ئەوەی لە لام گرنگە ئەوەیە ماڵت بهێنی بۆ " تاران " و لێرە كار و كاسبی بكەیت ، هەرچی تۆ دەتەوێ من بۆت جێبەجێ دەكەم: خانوو، دوكان، تاقیگە، شاگرد... هەموو ئەوانە لە خزمەتت دادەنێم..)

ئەویش لە وەڵام دا دەڵێت: خاتوون ، من ناتوانم ولاتی خۆم بەجێ بهێڵم ، خودا بۆ ولاتی خۆمی دروست كردووم ، گەر بەشی ئەم ولاتە بوومایە لێرە نیشتەجێی دەكردم ، بێ حیكمەت نییە لە نیشتمانێكی هەژاری وەك ولاتی خۆمدا لە دایك بووم...

وەلامەكەی مەنسوور بە دڵی " شابانوو " نابێت و بە توانجەوە پێی دەڵێت: خەڵكی ئێوە گوند نشین و دواكەوتوون لە كوێ دەزانن بۆنی خۆش بەكار بهێنن ؟! بۆن تایبەتمەندی خەڵكی شار و پێشكەوتووە...

" مەنسوور " لە وەلامدا دەڵێت: ئێمە كە دەزانین دروستی بكەین بڵێی نەزانین بەكاری بهێنین ؟!

" شاژن " هەست دەكات قسەیەكی ڕەق و بێ تامی لە ڕووی ئەم عەتتارە كوردە كردووە ، بۆیە بە قسەكەی خۆیدا دەچێتەوە و دەڵێت: مەبەستم سووكایەتی كردن نەبوو بە میللەتەكەت ، نەخێر تەنها دەمویست بڵێم لە شارە گەورەكاندا بازاڕی بۆن و كاری عەتتاری سەركەوتووە...

مەنسوور دەڵێت: خاتوون ، ئێمەی میللەتی هەژار تەنها خودامان هەیە..

" شاژن " وا هەست دەكات ئەم عەتتارە زیاد لە بەڕەی خۆی پێ ڕادەكێشێت، بۆیە پێی دەڵێت: من تۆم بۆ ئێرە نەهێناوە باسی سیاسەتم بۆ بكەی ، تۆ تەنها عەتتارێكی و بەس...

مەنسوور – هەندێك بە توندی – : خاتوون ، تۆ دەزانیت من بۆخۆم نەهاتوومەتە ئێرە بەڵكو ئێوە لە دووی منتان ناردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا من غەریبم و خەڵكی ولاتێكی ترم...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" شاژن " هەندێك بایدایەوە و وتی: تۆ میوانی ئێمەیت و بەخێر بێیت، ئێستا پێم بڵێ دەتوانی چ جۆرە بۆنێكمان پێشكەش بكەیت تاكو توانا و زانستی خۆتی تیا بنوێنیت ؟

مەنسوور: هەر بۆنێكی سەراسیمە دروست بكەم هیچ ئازایەتییەكی منی تێدا نییە و گەورەیی بۆ مامۆستاكەمە و من تەنها شوكری خودا و ئەوم لەسەرە..

شاژن: هەرچۆنێك بێت، دەمەوێت توانای تۆ لە عەتتاریدا ببینم...

مەنسوور: بۆ دروست كردنی چ جۆرە بۆنێك منت بانگهێش كردووە، دەروونی خۆت والاّ بكە و نهێنی خۆتم بۆ بدركێنە...

كە " شاژن " ئەو قسەی " مەنسوور " ی بیست زانی ئەم عەتتارە كوردە – لە پاڵ زانستی وردی عەتتاریدا – كابرایەكی دەروونناسە و كەسێكی سادە نییە وەك ئەوەی ئەو وێنای كرد بوو ، بۆیە سەیرێكی یەكێك لە پیاوەكانی كرد و ئاماژەی دا بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە، ئەوانیش چوونە دەرەوە و تەنها خانمێكی بەردەستی " شاژن " مایەوە و پاش ماوەیەك لە بێدەنگی " شاژن " وتی: برای عەتتار تۆ كەسێكی شارەزا و لێزانیت و زۆر بە جوانی لە مەبەستی هاتنەكەت گەیشتووی ، من گرفتێكم هەیە و دەبێ بۆم چارەسەر بكەیت...

مەنسوور: ( چ جۆرە گرفتێك ؟)

شاژن: ( من بەرانبەر بە " شا " ساردم و دەمەوێت بەو جۆرە نەبم، وام بیستووە تۆ دەتوانیت بۆنی سەیر و سەمەرە دروست بكەیت و بەهۆیەوە خۆشەویستی بخەیتە نێوان ژن و مێردەوە)

مەنسوور: ( دەمەوێت زۆرتر گوێت لێ بگرم)

" شاژن " بە دوور و درێژی باسی پەیوەندی ژن و مێردایەتی نێوان خۆی و " شا " ی بۆ كرد و پاشان وتی: ( هەموو ئەم قسانە نهێنین و چوونە دەرەوەیان دەبێتە هۆی تیاچوونت، خۆت دەزانی ئەم باسانە پەیوەندی بە ئەمنی دەوڵەتەوە هەیە و لێرە و لەوێ دركاندنی باسی سەرە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: (خاتوون ، باس نەکردنی ئەم قسانە و نەبردنە دەرەوەی لە لایـەن منەوە لە ترسی هەڕەشە و گوڕەشەی تۆ نییـە و ناشـزانم ئـەمنی دەوڵـەت یـانی چی ، باس نەکردنی نهێنییەکان تەنها لەبەر یەك شتە ئەویش پارێزگـاری کردنـە لە ئەمانەتی مەردوومان ، من ساڵانە دەیان و سەدان شتی لەو جۆرە دێتـە بـەر دەستم ، پزیشك و حەکیم مەحرەمە و وەك باوك و برا و خوشك و دایك گـوێ بـۆ نەخۆشەکان دەگرێت)

شاژن: (باوەڕت پێ دەکەم)

مەنـسوور: (گـەر ئـەو گرفتـەت بـۆ چارەسـەر بکـەم تـۆ چ بـەڵێنێك بـە مـن دەدەی؟)

شاژن: (داواکاریت چی یە؟)

مەنسوور: (بەردانی کۆمەڵێك گوند نشین بە تاوانی کۆمەکی کردنی نەیارانی " شا " حوکمی زیندانی هەتا هەتاییان بە سەردا دراوە)

شاژن: (داوایەکەت جێبەجێ کردنی ئاسان نییە)

مەنسوور: (هەموو شتێك هەر چەند گران بێت لای خاتوونی گەورە ئاسانە)

شاژن: ( لە پاڵ بەهرەی عەتتاریدا زمانیشت پاراوە)

مەنسوور: (" شاژن " خەڵکی نەزان بانگهێشتی کۆشکی خۆی ناکات)

شاژن: ( ئەمەشت لەوی تر بەهێزتر بوو)

مەنسوور: (مرۆڤ کەسی گەورەی لە پشت بێت هەمیشە بەهێزە)

" مەنـسوور " مەبەسـتی لـە کەسـی بـەهێز " پـیری مـەزن " بـوو، بـەلاَم لەبەرئەوەی " شاژن " لەسەر مەدح و سەنای مەردوومان ڕاهات بوو وای دەزانی مەبەستی لە کەسی بەهێز " شاژن " خۆیەتی ، بۆیە بە بزەیەکی کاڵ وەلاَمـی " مەنسوور " ی دایەوە و وتی: (من هـەوڵی خـۆم لـە لای " شـا " دەخەمـە گـەڕ، بەلاَم گەر پێشتر بۆنەکـەی تـۆ بـە دەسـتم بگـات دەبێتـە هـۆی سـەرکەوتنم لـە کارەکەم دا)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەنسوور " لە قسەکەی " شاژن " حاڵی بوو ، ئەو مەبەستییەتی بڵێت: بۆنەکەم فریا بخە بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵ " شا " دا کەشێك برەخسێنم و تیایدا داواکەی تۆی پێ بڵێم...

" مەنسوور " دەترسا دوای پێدانی بۆنەکە کاریان پێی نەمێنێت و پەلی بگرن و فڕێی بدەنە دەرەوە ، بۆیە بیری لە دوو شت کردەوە، یەکەمیان: دەبێت بڕێکی زۆر کەمی لەو بۆنە بۆ دروست بکات و پاشانیش بەڵێنی لێ وەربگرێت بۆ بەردانی ئەو گوندنشینانە و بۆ ئەو مەبەستە هەوڵی خۆی بەتەواوی بەگەڕ بخات ، مەنسوور ئەوەی بە بیردا هات "شاژن " ناتوانێت داواکەی جێبەجێ نەکات ، چونکە نهێنی ژن و مێردایەتی ئەو و " شا " ی کەوتۆتە ژێر دەست ، سەرێکیش بیری لەوە دەکردەوە " بلێی " شاژن " بۆ شاردنەوەی ئەو نهێنییە ناپاکی لەگەڵ بکات و بیکوژێت؟! باشتر وایە نهێنی دروست کردنی بۆنەکە نەخاتە ژێر دەستی و تەنها بەشی یەکجاری بۆ دروست بکات...

پاش ئەو بیرکردنەوە وردە بە " شاژن " ی وت: ( تۆ دەبێت کەسێك بۆ من تەرخان بکەی بۆ ئەوەی لەگەڵم بێتە بازاڕ و لای عەتتارەکان ماددە خاوەکانی دروستکردنی ئەو بۆنە بەدەست بخەم.. )

شاژن: ( لە دەرەوە دوو کەس لە خزمەتی تۆدان و بۆ ئەو کارە چاوەڕوانن )

مەنسوور: (تەنها یەك کەسم بەسە)

شاژن: (با دوو کەس لە خزمەتت دا بێت)

" مەنسوور " داوای مۆڵەتی لە " شاژن " کرد و لەگەڵ دوو پیاوەکەدا چوونە بازاڕ ، ئەو ماددانەی کە پێویست بوون بە دەستی هێنا وچوار پێنج ماددەی تری ناپێویستی بەگەڕ خست تاکو سەریان لێ تێك بدات ، چونکە وای هەست دەکرد یەکێك لەو دوو پیاوە عەتتارێکی زۆر لێزانە و بۆ دزینی نهێنی دروست کردنی بۆنەکە "شاژن" بە دووی خستووە ، هەموو ماددەکانی هێنایەوە بۆ جێگەی حەوانەوەی ، لە سێ کەمۆڵەدا دەستی بەتێکەڵ کردنیان کرد، بەجۆرێك ڕێژە و جۆری ماددەکان و شێوەی تێکەڵ کردنەکەی ئاڵۆز کرد بە پەنجا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

عەتتاری لێزان نهێنییەکە نەدەزانرا و پەی پێ نەدەبرا ، پاشان لەو گشت بۆنە تەنها بەشی یەکجار بۆن کردنی جیا کردەوە، لە دەست مالێکی نا و بۆ شاژنی برد و پێی وت: (هەرچەند ئەم برە زۆر کەمە ، بەلام گەر ئەو کۆمەلە گوند نشینەم بۆ بەر بدەی لەم بۆنە بەهێزتر و کاریگەرترت بۆ دروست دەکەم )

شاژن: ( ئەی بۆ ئەم جارە دروستت نەکرد؟)

مەنسوور دەیزانی بۆچی " شاژن " ئەو پرسیارە دەکات ، بۆیە وەلامێکی دروستی دۆزییەوە و وتی: (مادده ڕەسەن و کەرەستە ئەسلەکانی خۆمم لەبەر دەستدا نییە)

شاژن: ( یانی لەم " تاران "ە مەزنەدا لەو بۆنانەی تۆی تێدا نەبوو؟ !)

مەنسوور: ( ئەو بۆنانەی لە ژێر دەستی مندایە بەشێکی لە حەلەب و دیمەشق و ئەستەمبولەوە بۆم دێت و بەشێکی تریشی لە گول و گولزاری ولاتی خۆمان دروستی دەکەم )

شاژن: (من سبەینێ لەسەر بەندییەکان وەلامت لێ دەگێرمەوە و ئەم شەویش نهێنی ئەم بۆنە سیحرئامێزەی تۆ دەردەکەوێت)

سبەینێ " شاژن " لە دووی " مەنسوور " ی نارد و لەگەل هاتنە ژوورەوەیدا "شاژن" هەستایە سەر پێ و فەرمووی لێ کرد ، مەنسوور لە دلی خۆیدا وتی: ( دیارە بۆنەکەی پێکەوتووە ، بۆیە وا ئەوەندە بەگەرمی پێشوازیم لێ دەکا )

" شاژن " ڕووی لە مەنسوور کرد و وتی: ( بەڕاستی تۆ کەسێکی زانا و بە توانای ، نەم دەتوانی باوەڕ بکەم کە بۆنی خۆش مرۆڤ دەگۆڕێت ، بەلام ئەو بۆنەی تۆ پێی سەلماندم ، خاوەنشکۆ لە من سەراسیمە بوو بوو ، ئەو هەرگیز منی بەوجۆرە نەبینی بوو ، چەند جارێك لە قاقای پێکەنینی دا ، پرسیاری نهێنی ئەو گەرم و گوڕییەی لێ کردم ، منیش باسی بۆنە دلڕفێنەکەم بۆکرد ، بەلام ناوی تۆم لا نەهێنا ، لە کۆتایدا داوایەکەم پێ گەیاند و ئەویش بە میهرەبانی خۆی بڕیاری لێخۆش بوونی بۆ دەرکردن ، تا تۆ دەگەڕێیتەوە زێدی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خۆت ئەوانیش دەگەنەوە ناو خانەوادەی خۆیان ، بەلأم دەبێت بەڵێننامە پڕ بكەنەوە جارێكی تر خیانەت بە مەملەكەتی " شا " ی مەزن نەكەن)

مەنسوور: (خاتوون، ئەوەندەی من بزانم ئەوانە جوتیار و كاسبكارن و پەیوەندییان بە سیاسەتەوە نییە و نەبووە)

شاژن: (هەرچۆنێ بێت دەبێ ئەوانە سوپاسی مەقامی بەرزی شاهانە بكەن كە لێیان بوراوە و ڕزگاری كردوون) ، پاشان " شاژن " باسەكەی گۆڕی: ( بەڕاست كەی بڕێكی زۆرترمان لەو بۆنە سەیرە بۆ دەنێریت؟)

مەنسوور: (هەر ئەم شەو بڕێكی زۆرترت بۆ دەنێرم)

" شاژن " سوپاسی " مەنسوور " ی كرد و داوای لێ كرد ناوبەناو سەردانی بكات و بە بۆنە خۆشەكانی بەهرەمەندی بكات ، " مەنسوور" بەڵێنی دووبارە سەردان كردنەوەی نەدا و خواحافیزی لێ كرد و بەو دەستكەوتە گەورەیەوە بۆ لای " پیری مەزن " گەڕایەوە ، ئەو هەموو سەربوردەكەی بۆ " پیری مەزن " گێڕایەوە و مژدەی بەربوونی گوند نشینەكانی پێ ڕاگەیاند..

" مەنسووری عەتتار " عاریفێكی مەزن بوو ، جێگەی پرس و ڕای ئەهلی دڵ بوو ، هەر لە گەنجییەوە ڕێگای سەیر و سلوكی گرتبووە بەر و لەو كاروانەشدا ڕێگای زۆری بڕی بوو ، بەڵكو نزیك بوو بە شوێن و جێگەی سەرقافڵە و هەنگاوەكانی نزیك بوو بە هەنگاوەكانی "پیری مەزن " .

ئەو خۆشەویستیی بۆ " پیری مەزن " گەیشت بووە ڕادەیەك ئۆقرە و ئارامی لێ بڕا بوو ، كاتێ لێی دوور دەكەوتەوە شەوق و تامەزرۆبوونی بۆ " پیر " سەوداسەری دەكرد و دەبوایە لە شارەكەی خۆیەوە بۆ لای "پیر " بەگەڕ بكەوتبایە و خۆی بگەیەندبایەتە كانیاوی ئارامی ، كە دەگەیشتە بەرەوە نەدەحەوایەوە و وەك پەپوولە بە دەوری "پیری مەزن " دا باڵەتەپێی دەكرد...

بازاڕێكی سەراسیمە و جیهانێكی پڕ لە مەستی! ئەمەیە حەقیقەتی ئەو مەملەكەتەی عاشقان ڕووی تێ دەكەن و بۆ تەنها ساتێكیش ڕۆحیان لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

باڵەتەپێ ناکەوێت ، لە مەشرەبی ئەهلی دڵدا سەرمەستی و ئۆقرە لێ بڕان سروشتی هەموو ئەو کەسانەیە پێ دەنێنە مەملەکەتی عیشقەوە...

هەموو جارێك پیری مەزن دەیوت:

" مەیدانی مە مەیدانی عیشقە نە جەدەل ،

عاشق دوورە لە هەوا و دەردی مەلەل ،

مەیدانی مە مەیدانی عیشق و مەیە ،

لە دەروونا ناڵەیە وەکو نەیە...."

مەنسووری عەتتار جێگەی سەرنجی شەو و ڕۆژی "پیری مەزن" بوو ، ئەو هەمیشە بیری لە " مەنسوور " دەکردەوە ، لە قووڵایی دڵی خۆیدا ئەوی دانا بوو ، ئەم حاڵەتە ڕۆحی یەش "مەنسوور " ی مەست و عەوداڵ کرد بوو ، ئەو لە لایەن "پیر"ەوە پەلکێشی مەیخانەی دڵی "پیر" کرا بوو ، لەو جێگەیەش جگە لە نۆشینی مەی و بادە چیتر هەیە ئارامی بە مرۆڤ ببەخشێت..!

" پیر " کە " مەنسوور " ی دەبینی دەیوت:

وەرە سەیری هەناوم چەند بەجۆشە

وەرە مەیخانەی دڵم مەی بنۆشە..

ئەوەی " مەنسوور " ی مەست و عەوداڵ کرد بوو ئەو مانا قووڵانە بوو "پیر " هەندێك جار بە دێڕێك هۆنراوە گوزارشتی لێ دەکردن ، ئەو بۆ زیاتر سووتاندنی " مەنسوور "پێی دەوت:

دەمەوێ ببم بە میوانی دڵت

کەچی تۆ دەرگام لە ڕوو دادەخەی ؟!

هیجر و بێ مەیلی بۆ خۆشەویستان

بۆ ئەویش سینەی سافت ڕادەخەی !

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور گریان و لەرزین هەموو گیانی داگیر دەکرد و ئەو سێ نیوە دێڕە هۆنراوە عەرەبییەی دەوتەوە کە دەڵێت:

مرضت و أنت طبيب

فهل لي من ودك نصيب

و أنت دون العالمين حبيب..

( نەخۆش کەوتم ، تۆ حەکیمی گیانمی ، ئایا لە خۆشەویستی خۆت بەشم دەدەی ، کە جگە لە تۆ هیچ خۆشەویستێکی ترم نییە ؟)

" پیری مەزن " لە نامەیەکی عاشقانەدا بە مەنسووری سووتاوی وت بوو:

خۆم دایە ژێر باڵی عیشقێك

وام دەزانی

بەر لە هەموو عاشقانت

دەبم بە میوانی دڵت...

کاتێ هاتم

میوانان مەییان دەنۆشی

دەرگا بە ڕووما داخرا

دەریان کردم بە سەرخۆشی...

" مەنسوور " ی پەروانە لە وەڵامی نامەکەی " پیر " دا نووسی بووی:

میوانانم بەجێ هێلا

سەرقاڵی نۆشی خۆیان بن

- بۆ پێشوازیت -

منت لە خانەی دڵی خۆم

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

وەدەرناوە ،
بێ دڵ ماوم - بێ ماڵ و حاڵ -
عاشقێکی ڕووت و ڕەجاڵ..
زۆر دەمێکە لە دووت وێڵم
دەرگای دڵم دەلەرزێنی و
خۆت ون دەکەی ،
گوایە بۆ کەلاوەی دڵم
فەرمووم لە تۆ نەکردووە !
ئادابی میوان پەزێریم
بە دڵ بەڕێ نەبردووە
گوڵم نازانی جێگەی تۆ
وێرانەی دڵی من نییە ؟
بۆ سوڵتانی مەملەکەتێ
ئەو شوێنە لام بێ ڕێزی یە...
خۆت ون مەکە ،
بەهانەم بۆ مەهێنەوە ،
لە هەر کوێ بی دەتدۆزمەوە
خۆم دەکەمە قۆچی قوربانی بەری پێت ،
سەرم دەخەمە سەری ڕێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەنسووری عەتتار " داوای دەستی کچی خاڵی خۆی – بەناوی مەعسومە خاتوون– کرد ، دوای زیاتر لە دوازدە ساڵ تەمەنی ژن و مێردایەتی هێشتا منداڵ نەکەوتبووە نێوانیانەوە ، مەعسومە خاتوون ی هاوسەری " مەنسوور " جۆرێك بێ هیوایی لەخۆی – بۆ منداڵ بوون – لە لا دروست بوو بوو ئەوەش خەم و ئازاری لا خولقاند بوو ، بەڵام هێشتا لە قاپی بەزەیی خودا بێ هیوا نەبوو بوون و بەردەوام لە پاڕانەوەدا بوون...

" مەنسوور " دوو بەرە خانووی دروست کرد بوو ، یەکێکیان بۆ خۆی و هاوسەرەکەی و ئەویتریان بۆ مانەوەی " پیری مەزن " و میوانەکانی کە ساڵێ یەکجار بە مەبەستی بەسەرکردنەوەی موریدان و دۆستانی خۆی سەردانی شارەکەی " مەنسوور " ی دەکرد ، بە درێژایی ئەو ماوەیەی دەمایەوە " مەنسوور " نەی دەهێلا ڕوو لە هیچ شوێنێکی تر بکات ، بۆیە داوای لە خۆشەویستانی "پیری مەزن " دەکرد با ئەوان بێن و لەو جێگەدا سەردانی " پیر " بکەن و لای بمێننەوە ، چونکە " مەنسوور " ماڵەکەی خۆی بە ماڵی " پیری مەزن" دەزانی ، سوێندنی دەخوارد و دەیوت: ( ڕۆژێك لە ڕۆژان وام نەزانیوە خاوەنی ماڵ و پارەم ، بەڵکو هەمیشە " پیر " م بە خاوەنی هەموو ئەوانە زانیوە ، ئەم ماڵەش تیایدا دەژیم وادەزانم ئەوە خاوەنەکەی و بەمنی بەخشیوە ، ئیتر بۆ دەبێت خزمەتی " پیر " و میوانەکانی منەت و شاباشی تێدا بێت.. "

هەرواش بوو " مەنسوور " لە دڵەوە ئەو قسانەی دەکرد ، ئەو پیاوێکی وەفاداری بە ئەمەك و بە نمەك بوو، هەموو ئامۆژگاری و ڕێنموویيەکانی " پیر " ی لە یاد بوو، هەر لە گەنجییەوە " پیری مەزن" دەستی گرت و ڕێگەی خێر و چاکەی نیشاندا ، لە دونیای کەسابەتی عەتتاریشدا زۆر شت لە "پیر"ەوە فێر بوو بوو، بەڵکو مامۆستای هونەری عەتتاری مەنسوور " پیری مەزن " بوو، ئەو بوو نهێنی ئەو بۆنە دڵ ڕفێنانەی فێر کرد ، لەگەڵ ئەوەشدا " پیری مەزن" نەی دەویست ناوی بهێنرێت ، تەنها " مەنسوور " و چەند کەسێکی زۆر کەم ئەو ڕاستییەیان دەزانی...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە یەکێك لە سەردانەکانیدا بۆ شارەکەی مەنسوور شەوێك " پیری مەزن " مەنسوور و مەعسومەی هاوسەری بانگ کرد و پرسیاری منداڵی لێ کردن ، ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان: ( تاکو ئێستا خودا نەیداوە و هەندێکیش لە خۆمان بێ هیوا بووین )

" پیری مەزن " لە وەڵامیاندا وتی: ( دەرگای بەزەیی خودا دانەخراوە ، خودا بە پیری و نەزۆکی منداڵی بە حەزرەتی " ئیبراهیم " و حەزرەتی " زەکەریا " بەخشی ، هەر ئەو خودایە دەتوانێت منداڵ بە ئێوە ببەخشێت )

پاشان سێوێکی پێدان و وتی: ( بە یەکسانی بیکەن بە دوو لەتەوە و هەریەکەتان لەتێکی بخوات ، بەڵکو خودا منداڵێکتان پێ ببەخشێ و منداڵەکەش یەکێك بێت لە موردادانی ئەو...

ئەم مژدەیەی " پیر " جێگەی دڵ خۆشی " مەنسوور و مەعسومە " ی هاوسەری بوو ، بە تایبەت مژدەی منداڵێك مورادی خودا بێت ، چونکە لای ئەهلی عیرفان کەمن ئەو کەسانەی دەبن بە مورادی خودا ، لە فەرهەنگی ئەهلی دڵ دا مورید کەسێکە بە دوای خودا دا وێڵە و خودادۆزی دەکات و دەیەوێت پێی بگات ، بەڵام موراد کەسێکە خودا بۆخۆی پەلی دەگرێت و سەرۆکاری دەکات ، خودایە ڕێگاکانی عیرفانی پێ تەی دەکات تا بە دیداری خۆی شادی بکات...

پاش ساڵێك لە مژدەکەی " پیر " خودا کوڕێکی پێ بەخشین و دوای هەفتەیەك " مەنسوور " و هاوسەرەکەی هەڵیان گرت و بردیان بۆ لای " پیری مەزن " ، ئەویش دوای نزا و پاڕانەوە لەبەر خودا بۆ منداڵەکە و دایك و باوکی ناوی لێنا " موهتەدا "و ، پاشان وتی:

"موهتەدا " ش مورادی خودایە...

" موهتەدا " تەمەنی دوو ساڵان بوو " پیری مەزن " دونیای بەجێ هێڵا و کەسێکیش نەبوو لە دوای ئەو جێگەی پڕ بکاتەوە ، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ڕۆحییەی لە دوای مردنی " پیر " ڕووی تێ کردبوون موریدان لە هەرشارێکدا جێگەیەکیان تەرخان کرد بوو بۆ ئەوەی هەفتەیە جارێك تیایدا کۆ ببنەوە و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

یادی خودای تیادا بکەن ، ماڵی "مەنسووری عەتتار" یەکێك بوو لەو ماڵە دەگمەنانەی زانایان و موریدانی " پیر " ی تیا کۆ دەبوویەوە و یادی خودای تیادا دەکرا و زانستە شەرعییەکانی تێدا تاوتوێ دەکرا ...

" مەنسووری عەتتار " و خێزانەکەی ماڵێکی میوانپەزێری خانەدان بوون ، لە ماڵیاندا هەفتەیە جارێك جوانترین میوانداری بۆ میوانەکان ئامادە دەکرا و بە دڵێکی گوشاد وپڕ لە میهرەبانییەوە پێشکەشیان دەکردن ، " مەنسوور " پێی خۆش بوو بە دەستی خۆی خزمەتی میوانەکان بکات ، بەڵام چەند گەنجێکی رۆح سووك خزمەت کردنەکەیان دەگرتە ئەستۆ و نەیان دەهێشت " مەنسوور " ئەو کارە بکات...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

– ٢ –

## موهتەدا:

## زانست و عیرفان ، ئەرکی مامۆستایی

" موهتەدا " ی مـودەڕیس پیـاوێکی تەمـەن "بیـست" سـالانی ڕەقـەکاری موو ڕەش بوو ، ڕووخسارێکی سپی بـە لای ڕەنگـی زەرد دا دەی ڕوانـی ، لـە سیما و شێوەیدا نەجابەت و پێکەوتویی دەبینرا ، ئەو کـوڕە تاقانـەی دایـك و باوکی بوو ، بۆ جوانخاسی و لێ هاتوویی لە ناو ژناندا باو بوو دەیانوت : یـەك مندالّت ببێ و " موهتەدا " دا بێت...

خۆشەویستی دایك و باوکی بۆ " موهتەدا " بێ سنوور بوو ، زۆرجـار بـابی بـە " مەعـسومە " ی هاوسـەری دەوت : ( ئـافرەت ، دەترسـم خۆشەویـستی زۆرمان بـۆ ئـەم تاقـە کوڕەمـان ڕووبـەڕووی لـێ پرسـینەوە و تاقیکردنـەوەی خودامان بکاتەوە..)

ئەویش دەیوت : (باوکی " موهتەدا " خۆشەویستی ئێمە بۆ ئەم کوڕەمان سروشتی یە و بە دەستی ئێمە نییە ، ئەوە سۆزێکە خودا لە دلّ و دەروونماندا دایناوە ، گرنگ ئەوەیە لەسەر ئـەو بەخشـشە مەزنـە شـوکری خـودا بکـەین ، ئێمە لە مندالّ بێ هیوا بوو بووین ، بەلاّم دوعای " پیری مەزن" بۆ ئێمـە گـیرا بوو ، شوکر بۆ تۆ ئەی خودایە ئێمە ناتوانین سوپاسـی بـەهرە و نیعەتـەکانت بکەین..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەر لە منداڵی یەوە " موهتەدا " لە فەزایەکی لێوان لێو بە ئایین و عیرفانی ئایینیدا پەروەردە بوو ، سەردەمی منداڵی بە قوتابخانە و خوێندنی زانستە ئایینییەکانەوە بەسەر برد ، ئەو منداڵێك بوو کەمتر لەگەڵ حەزی منداڵی خۆی دا دەژیا ، کاتەکانی لە ناو قوتابخانە و حوجرە و دیوەخانە بەرینەکەی بابیدا بەسەر دەبرد ، ئەو دیوەخانەی شەوانە بە زانایان و عاریفان دەرازایەوە و تا درەنگانێکی شەو زانستی دڵ و سەرجەم زانستە شەرعییەکانی تری تیادا باس دەکرا...

" موهتەدا " مێرد منداڵێك بوو زۆر حەزی بە خزمەت کردنی میوانەکانی بابی بوو، بەڵکو جۆرێك لە هۆگری لەگەڵ میوانەکان و سەرجەم ئەو باس و خواسانەدا بۆ دروست بوو بوو، شەوان لەگەڵ سەرکردنە سەر سەریندا دەکەوتە نێو جیهانێکی ترەوە ، کۆی ئەو بابەتە رۆحییانەی لە دیوەخانەکەی بابیدا باسی لە بارەوە دەکرا بە دڵ و رۆح دەیژنەوت و تاوتوێی دەکرد و رادەی دروستی و نادروستی ئەو قسانەی بۆ دەردەکەوت ، پلە و پایەی سەرجەم ئەو کەسانەشی نیشان دەدرا قسەیان لە بارەی عیرفانەوە دەکرد ، کێشانە و پێوانەکانی دونیای عیرفان بەو جۆرە نەبوو کە لە دیوەخانەکەدا باسی لێوە دەکرا ، تەنانەت ئەو کەسانەی هەمیشە سەری باسەکانیان دەگرتە دەست و قسەیان بۆ دەوروبەر دەکرد پلەوپایەی عیرفانیان زۆر نزمتر بوو لەو کەسانەی هەمیشە گوێیان دەگرت و بێدەنگییان هەڵ دەبژارد ، پیاوە هەژارەکەی دەم دەرگاکە – لەو جیهانەدا – مامۆستای ئەو زانا گەورەیە بوو هەمیشە لەسەرەوە جێگەی بۆ دادەنرا و هەتا ئەو لە مەجلیسدا بوایە کەسێك رووی نەدەهات دەمی بکاتەوە ، جارێك ئەو زانا ئایینییە لە گەرمەی قسە و باسدا بوو " موهتەدا " لێی هاتە دەنگ و وتی: ( مامۆستا ئەوەی تۆ باسی لێوە دەکەیت بەو جۆرە نییە، بۆچی بە هەڵە شتەکان باس دەکەی ؟)

ئەو قسەیە بە بێ ئەدەبییەکی گەورە لە دانیشتنەکەدا لێك درایەوە و لۆمەی " مەنسوور " ی بابی " موهتەدا " یان کرد کە بۆچی رێگە دەدا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

منداڵە " دە " ساڵانەکەی بێتە مەجلیسێکی ئاوا شکۆدارەوە ، چۆن دەبێت ئەو منداڵە بیٚ ئەدەبی بەرانبەر زانایەکی مەزن بنوێنێت؟!

زانا ئایینییەکە دەور و بەری هێور کردەوە و داوای لیٚ کردن بێدەنگ ببن ، پاشان بە زمانێکی شیرین بە " موهتەدا " ی وت : (کوڕی خۆم " موهتەدا " تۆ ڕاست دەکەیت لە بۆچوونەکانمدا من هەڵەم کرد و نەم پێکاوە ، بەلاٚم پێم بڵیٚ چۆنت زانی من بە هەڵەدا چووم ؟)

" موهتەدا " بوێرانە هاتە وەلاٚم و وتی: (بە ڕەنگی وشەکانت دا دەزانم )

لێرەدا دیسان ژاوەژاوێکی تر سەری هەڵدا و زانا ئایینییەکە داوای پاراستنی ئارامی دانیشتنەکەی کرد و وتی: ( تێناگەم ! چۆن؟ بۆم باس بکە..)

موهتەدا : ( ئەو وشانەی لە دەمی بەڕێزت دێنە دەرەوە ڕەنگیان هەیە ، هەر قسەیەك تیایدا بە هەڵەدا چووبیت ڕەنگی وشەکانی ڕەشن، ئەو قسانەی پێشتر کردنت هەموو ڕەنگیان ڕەش بوو)

زانا ئایینییەکە پیاوێکی مەزن بوو هەستایە سەرپیٚ و هات بۆ لای "موهتەدا " و ناوچاوانی ماچ کرد و وتی: ( سوپاس بۆ ئەو خودایەی بە منداڵێك هەڵەی زانایەك ڕاست دەکاتەوە)

" موهتەدا " دەستی زانایەکەی گرت و ماچی کرد ، پاشان بابی داوای لە لیٚ کرد ئەوان بەجیٚ بهێڵێت و بچێت بۆ ژوورەکەی خۆی..

مامۆستا ئایینییەکە ڕووی لە پیاوانی دیوەخان کرد و وتی: (ماوەیەك لەمە و بەر شەوێك ئاگادار کرام و پێیان وتم : " لەو دانیشتنەدا چاودێرمان لەسەر داناوی و ئاگاداری دانە بە دانەی قسەکانت بە " لە ڕاستیدا ئەو قسانەی " موهتەدا " لێی هاتە دەنگ لای خۆم ساغ نەبوو بوونەوە و تەنها قسە بوون ، مانا و مەرام و دروستی و نادروسـ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

عەتتار " ئەو چاودێرە بوو خودا بەسەرمەوە داینا بوو، دەپارێمەوە خودا تەمەن درێژی بکات و لەسەر ئەم ڕێگەیە بەردەوامی بکا..)

بەو چەند قسەیە دانیشتنەکەی ئەو شەوەیان کۆتایی پێ هات و "مەنسوور " یان لە دیوەخانەکەدا بە تەنها بەجێ هێلاْ ، ئەویش دیوەخانەکەی جێ هێشت و ڕۆیشت سەرێکی دا لە ژوورەکەی "موهتەدا "، بینی خەریکی خوێندنەوەی وانەکانی قوتابخانەیە و هێشتا نەنوستووە ، بابی چووە ژوورەوە و پرسیاری ئەو ڕووداوەی لێ کرد و پێی وت: ( کوڕم من زۆر شەرمەزار بووم کاتێ تۆ ئەو قسانەت بە زانای پایە بەرز وت )

موهتەدا: ( بابە پێیان وتم ئەو قسەیە بکەم!)

بابی: (کوڕم کێ پێی وتی ؟)

موهتەدا: (پیاوێکی ڕیش سپی هەر دەتوت " پیری مەزن " ە..)

بابی: (جا کەی تۆ " پیری مەزن " ت بینیوە؟!)

موهتەدا: (دایکم وێنەکەی نیشان داوم..)

بابی: ( لە کوێدا وەستا بوو؟)

موهتەدا: ( بۆچی بابە تۆ نەتبینی؟ خۆ لە تەنیشتی تۆدا دانیشت بوو ، زۆر لە تۆ ورد بوویەوە ، تۆش سەیری ئەوت کرد..)

بابی: ( کوڕم گەر ئەم جارە بینیت ئاگادارم بکە)

موهتەدا: ( ئەگەر ڕازی بوو ، باشە)

بابی: ( ئێستا درەنگە و بنوو تاکو بەیانی زوو بە ئاگا بێیت..)

موهتەدا: ( باشە بابە..)

" مەنسوور " لە ژوورەکە هاتە دەرەوە و کەوتە بیرکردنەوە لە "موهتەدا "، تێگەیشت نهێنی ئەو بینینە چی یە و " موهتەدا " ی کوڕی بەرە و کوێ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەنگاوی پێ هەڵ دەگیرێت ، قسەكانی " پیری مەزن " ی كەوتەوە یاد كە دەیوت : " داواكارم خودا مندالێكتان پێ ببەخشێت مورادی خودا بێت " ، ئەو كارە سەیر و سەمەرانەی "موهتەدا" تەنها لە كەسانێك دەوەشێتەوە مورادی خودا بێت ، بەلام پێویستە ئاگاداری بێت و چاودێری حاڵەتەكەی بكات....

" مەنسوور " شەو و ڕۆژ "موهتەدا" ی خستە ژێر سەرنجی خۆیەوە بە بێ ئەوەی دەست بخاتە تێو ئەو قەدەرەی " موهتەدا " ی ئاراستە دەكرد، ئەو دەیویست بزانێ "موهتەدا " بە چ ئاقارێكدا دەبرێت ، نەی دەویست ڕۆژانە بانگی بكات و لێ پێچینەوەی لەگەڵدا بكات یان بەو جۆرە ئەو دەیەوێت هەڵس و كەوت بكات ، بۆیە ئازادییەكی تەواو بە "موهتەدا " درا بوو ، بەلام ئازادییەك كەسێك شەو و ڕۆژ چاودێری دەكات تا بزانێت چۆن لە فەزای ئازادییدا ئەو منداڵە هەڵس و كەوت دەكات و ئاراستە وەردەگرێت ، " مەنسوور " باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو ئەو منداڵە بۆ قەدەرێك دروست كراوە ، بۆیە هەركاتێت بیویستبایە دەستێوەردانێكی ژیانی منداڵەی بكات شەوانە دەهاتنە گیانی و ئازاریان دەدا و هەڕەشەیان لێ دەكرد بۆ ئەوەی جارێكی تر دەست تێوەردان لە ژیانی منداڵەكەدا نەكاتەوە...

ڕۆژێك چەند كەسێكی نەناسراو دەبن بە میوانی "مەنسوور" و داوای لێ دەكەن "موهتەدا " بهێنێت بۆ ئەوەی چاویان پێی بكەوێت ، ئەویش دەچێت "موهتەدا " بهێنێت ، بەلام تا دەگەڕێتەوە دەبینێت میوانەكان دیار نەماون ، "مەنسوور" شپرزە دەبێت و دەست بە گەڕان دەكات ، بەلام "موهتەدا " بە بابی دەڵێت: ( بابە میوانەكان ڕۆیشتن ، نەتبینین كاتێ ئێمە هاتینە ژوورەوە ئەوان لە ژوورەكە چوونە دەرەوە؟! )

"مەنسوور" حاڵی دەبێت ئەوانە كەسی ئاسایی نەبوون و تەنها بۆ دیداری "موهتەدا " هاتوون...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

جارێك باس و خواسی " مەنسوور و موهتەدا " بە نێوان چەند كەسێكدا گوزەر دەكات ، یەكێك لەوانە دەڵێت: پاكێتی ئەو خێزانە بۆ حەلاڵ خۆری دەگەڕێتەوە و پێ ناچێت لە هەموو تەمەنیاندا تێكەڵ بە حەرام بوو بن ، یەكێكیان دەڵێت: من بۆ ڕاستی و دروستی ئەو قسانەی ئێوە خواردنێكی حەرامیان بە دیاری بۆ دەبەم تاكو بزانم وەری دەگرن یان نا ، پیاوەكە ڕۆیشتە بازاڕ و مەنجەڵێك ماستی لای ماست فرۆشێك هێنا بەبێ ئەوەی پارەكەی بدات ، پاشان هەڵی گرت و بە دیاری بۆ ماڵی "مەنسووری عەتتار"ی برد ، تەقە لە دەرگا درا و "موهتەدا " ڕۆیشت بەدەم دەرگاوە ، كابرای بە مەنجەڵە ماستەكەوە لەبەر دەرگا بینی، فەرمووی لێ كرد و ئەویش لە وەڵامدا وتی: ( نایەمە ژوورەوە ئەم مەنجەڵە ماستەم بە دیاری بۆ ئێوە هێناوە و لێم وەربگرن )

موهتەدا: ( بیبەرەوە بۆ خۆت ، ئێمە ماستمان هەیە)

پیاوەكە: (ئاخر بۆ ئێوەم هێناوە)

موهتەدا: ( ئاخر نامانەوێت)

پیاوەكە: (بۆچی خۆ دیاری وەرگرتن ناشەرعی نییە؟)

موهتەدا: ( ناشەرعی چی یە؟ دیاری لە تۆ وەرناگرین )

پیاوەكە: ( بۆچی لە منی وەر ناگرن؟ من چیمە وا دیاریم قبوڵ ناكەن ؟)

لەو قسانەدا بوون " مەنسوور " بۆخۆی هات بەدەم دەرگاوە و فەرمووی لە پیاوەكە كرد ، ئەویش وتی: ( ماڵتان ئاوەدان بێت تەنها ئەم مەنجەڵە ماستەم بە دیاری بۆ هێناون ، بەلاَم كوڕەكەت لە جێگەی سوپاس كردنم سووكایەتیم پێ دەكات )

مەنسوور: ( داوای لێبوردنت لێ دەكەم ئەوە منداڵە نازانێت ، لێی مەگرە)

پیاوەكە: ( بەهەرحاڵ ئەم دیاری یە كەم بایەخەم لێ قبوڵ بفەرموو)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"مەنسوور" ماستەکەی لێ گرت و زۆر سوپاسی پیاوەکەی کرد، تکای لێ کرد بێتە ژوورەوە ، بەلأم داوای لێبووردنی کرد ، "مەنسوور" بەرلەوەی خواحافیزی لە پیاوەکە بکات مەنجەڵە ماستەکەی دایە دەستی " موهتەدا " و داوای لێ کرد بیباتە ژوورەوە ، ئەویش لە دەستی گرت و لەبەرچاوی بابی و پیاوەکەدا مەنجەڵە ماستەکەی قلْپ کردەوە و بە شێوەیەکی هەڕەشە ئامێز بە کابرای وت: ( جارێکی تر ئێمە تاقیمەکەرەوە)

" مەنسوور " ی بابی شەرمەزاری دای گرت و هەندێك لە "موهتەدا" تووڕە بوو، بەلأم "موهتەدا " مەنجەڵەکەی بۆ کابرا هەڵدایەوە و بە بێدەنگی چووە ژوورەوە ، بابی زۆر داوای لێبوردنی لە پیاوەکە کرد و شەرمەندەیی خۆی بۆ دەربڕی ، کابراش ڕاستی و نهێنی هێنانی ئەو مەنجەڵە ماستەی بۆ " مەنسوور " باس کرد ، داوای لێ کرد لەسەر ئەو کارە لە کوڕەکەی زوویر نەبێت ، چونکە ئەو کارەی تەنها بۆ تاقیکردنەوە کردووە و ئامادەیە بچێت پارەی مەنجەڵە ماستەکە بە دوکاندارەکە بدات...

" مەنسوور " خواحافیزی لە پیاوەکە کرد و هات بۆلای "موهتەدا" و پێی وت: ( کوڕم چۆنت زانی ئەو کابرایە تاقیمان دەکاتەوە و پارەی ئەو مەنجەڵە ماستەی نەداوە ؟)

موهتەدا: ( بابە من لە ژوورەکەم دانیشت بووم پیاوە ڕیش سپییەکە هات و هەموو ئەو شتانەی لەسەر ئەو کابرایە پێ وتم)

مەنسوور: ( ئەی من نەموت ئەگەر ئەم جارە پیاوە ڕیش سپییەکە هات ئاگادارم بکە ؟ ! )

موهتەدا: ( بابە ناتوانم ! )

مەنسوور کوڕەکەی لە ئامێز گرت و تێر بە خۆیدا راکێشا...

شەوێك " مەنسوور " بە ئاگا هات و بینی " موهتەدا " لەسەر جێگەی نوستنی نەماوە ، ڕۆیشتە باخچەکە و چاوێکی گێڕا و کوڕەکەی نەبینی ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گەڕایەوە ژوورەکانی پشکنی و دیسان نەی بینییەوە، دواتر هەڵی کردە سەربانی ماڵەکەیان و بینی " موهتەدا "ڕوو بە ئاسمان هاتووە بە چۆکدا و لە بێدەنگییەکی پڕ لە ئارامیدایە ، پەلاماری دا و پەلی گرت و بەرزی کردەوە ، لە باوەشی خۆی نا و هێنایەوە بۆ ناو جێگەی نوستنی...

" مەنسوور " تا بەیانی بە دیاریەوە دانیشت ، بەلام " موهتەدا " لە خەوێکی قووڵا بوو، بۆ سبەینێ بابی پرسیاری ئەو ڕووداوەی شەوی لێ کرد ، بەلام دیار بوو هیچی لە بیر نەما بوو ، بۆیە بابی باسەکەی لێ گۆڕی تاکو ترس نەچێتە گیانیەوە....

" مەنسووری عەتتار " لە وەرزی بەهاردا زۆرجار " مەعسومە " ی خێزانی و " موهتەدا " ی هەڵ دەگرت و بۆ گەشت و سەیران دەگەڕانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان و چەند ڕۆژێکیان بەخۆشی بەسەر دەبرد ، بابی مەنسوور: (عوبەیدوڵلا) لەو گوندەدا چەند مڵکێکی کڕی بوو، ساڵانە لە ڕێگەی چەند جوتیارێکەوە بەرهەم دەهێنران و بەشەکەی خۆی بۆ خزمەتی مزگەوت و خوێندنگەکان و هەژارانی شارەکەی تەرخان کرد بوو ، لە دوای "عوبەیدوڵلا " مەنسووری کوڕی لە دەستووری بابی لای نەدا و بەرهەمی ئەو زەویانەی بۆ هەمان مەبەست تەرخان کرد بوو...

لە سەیرانێکدا بۆ ئەو لادێ یە لە جێگەیەکی پڕ لە گوڵ و گوڵزاردا بارگە و بنەیان خست ، ئەفسوونی جێگەکە بێ سنوور بوو، هەتا چاو هانا بکات سەوزی هەموو دەشت و دۆڵ و چیای داپۆشی بوو، بەهارێکی تەڕ، ناوە بەناوە پەڵە هەورێك لە ئاسماندا گڕی دەخوارد و تاوێك بارانی نەرم بەسەر زەویدا دەباری و لێوی گوڵ و گیای تەڕ دەکردەوە ، هەوایەکی تێکەڵ بە نمەی باران بەسەر گژ و گیادا گوزەری دەکرد و بیری وشك و دڵی مردووی زیندوو دەکردەوە ، ئەوان لە دامێنی چیایەکدا بارگەیان خست بوو، لە لاپاڵی چیاکەوە ئاوێکی سپی خێرایی هاتنەخوارەوەی کەفی دەچڕاند و بەسەر گژو گیای سەوزدا جاری دەبوو، لەو جێگ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەندازەیەك مەست و مەدهۆش دەبوو بە چەندین کاتژمێر نەدەهاتەوە هۆشی خۆی و لە دەوروبەری خۆیدا نوقم دەبوو، ئەوان سەرلەبەیانی گەیشتبوونە ئەو جێگەیە و تا دوانیوەڕۆیەکی درەنگ حەزی خواردن و خواردنەوەیان نەمابوو...

" موهتەدا " لە دایك و باوکی دوورکەوتەوە و بەرەو دارستانی خۆرهەڵاتی چیاکە ڕۆیشت ، سەیر لەوەدا بوو دایك و باوکی سەیریان دەکرد و پرسیاریان نەدەکرد کوڕەکەیان بۆ کوێ دەچێت ، ئەو تا لە چاوانیان ون بوو لێیان دوور کەوتەوە ، پاش ماوەیەك " مەنسوور و مەعسومە " بە ئاگا هاتنەوە و پرسیاری " موهتەدا " یان لە یەکتر کرد، بابی هەستا و بۆ دۆزینەوەی کوڕەکەی ڕووی لە دارستانەکە کرد، ماوەیەك بە ناو درەختەکاندا چاوی گێڕا و لە ناکاو "موهتەدا" ی لە پاڵ دارقەزوانێکدا بینییەوە ، هەردوو دەستی لە قەدی دارقەزوانەکە ئاڵاند بوو ، بە کوڵ دەگریا و لەبەری دەپاڕایەوە ، " مەنسوور " لە دار قەزوانەکە نزیك بوویەوە و بینی لە شێوەی پیرە مێردێکدایە و پرچ و ڕدێنێکی سپی بەرداوەتەوە و سەری داخستووە بەسەر " موهتەدا " دا ، ئەو نەیتوانی بە تەواوی لە " موهتەدا " و دارقەزوانەکە نزیك ببێتەوە ، لەو جێگەدا بە چۆکدا هات و کاتێك بە ئاگا هاتەوە سەری لەسەر ڕانی " موهتەدا " بوو ، پرسیاری لە بابی کرد: ( بۆچی لە دووی من هاتی؟)

مەنسوور — بە بێ وەڵام — هەستایە سەر پێ و پەلی موهتەدای گرت و بۆ لای " مەعسومە " ی هێنایەوە....

کار و هەڵسووکەوتە نامۆکانی " موهتەدا " لای " مەنسوور " ی بابی و " مەعسومە " ی دایکی ئاسایی بوو بوویەوە ، بە تایبەت ئەوان کەسانێکی بە ئاگا بوون لە دونیای پڕ لە نهێنی عیرفان و دەیان ڕووداوی لەو جۆرەیان بەسەردا تێ پەڕی بوو...

" موهتەدا " تەمەنی منداڵی بەڕێ کرد و لە قوتابخانەدا منداڵێکی لە ڕادەبەدەر زیرەك بوو ، کاتێك لە قوتابخانە دەگەڕایەوەپاش کەمێك پشوو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەچوو بۆ حوجرەکەی " مـەلای گـەورە " و وانـە ئایینییـەکانی لـەو جێگەیـە وەردەگرت ، حوجرەکەی " مەلای گەورە " بە بەردەوامی زیـاتر لـە " سـی " فەقیّ بە پلەی جۆراوجۆر وانەی ئایینیان تیادا وەردەگرت ، ئەو فەقێیانەی لە پلـەی بـالأدا بـوون دەبـوون بـە مامۆسـتای ئەوانـەی پلـەی خوێنـدنیان نـزمتر بوو...

زیرەکی و خێرا تێگەیشتنی " موهتەدا " و لەبەرکردنی وانەکانی لە زانستە جیاجیاکانی ئاییندا "مەلای گەورە" ی سەراسیمە کرد بوو، ئەو لە سەرەتاوە " موهتـەدا " ی دابوویـە دەسـت یـەکێك لـە فـەقێکان ، بـەلأم دواتـر بـۆی دەرکەوت توانای ئەو منداڵە لە ڕادەبەدەرە و هەندێ جار بەهۆی زاڵ نـەبوونی فەقێیەکە بەسـەر بـیر و زانـستی "موهتـەدا" دا لێـی تـوورە دەبـوو ، بۆیـە " مـەلای گـەورە " موهتـەدای هێنایـە ژێـر بـاڵی خـۆی و کەوتـە پـەروەردە و تێرکردنـی بـە زانـستە هەمەڕەنگـەکانی ئـایین ، ئـەو دەیزانـی " موهتـەدا " منداڵێکی ئاسایی نییە و لە داهاتوودا زانایەکی مەزنی لـێ دەردەچێت ، بۆیـە دەیویست شەرەفی وانە وتنەوە بەو منداڵەی دەست بکـەوێت ، هـەموو جارێـك مامۆستا لای فەقێکانی تر دەیوت: ( گەورەترین شـەرەفێ پـاش مـردنم بـە مـن دەبڕێـت – دوای پاداشـتی خـودا – ئەوەیـە لـە ژیاننامـەی " موهتـەدا " دا دەنوسرێت یەکێك لەو مامۆستایانەی وانـەی پـێ وتۆتـەوە " مـەلای گـەورە" یە..)

ئـەم قـسەیەی مامۆسـتا هەنـدێك ئیرەیـی لای فـەقێکان – بەرانبـەر بـە موهتەدا – دروست کرد بوو ، بە تایبـەت " فـەقێ عاسـیی بەرقـەلا "، ئـەوان لایان سـەیر بـوو مامۆسـتا ئەوەنـدە گرنگـی بـەو منداڵـە دەدات ، هـەیان بـوو دەیوت : باوکی "موهتەدا " دەوڵەمەندە، هەشبوو لـە مامۆسـتا دەگەیـشت و دەیزانـی ئـەو قـسانەی لـەخۆوە نییـە و بـە چـاوی دڵ " موهتـەدا " ی خوێندۆتەوە و دەزانێت لە داهاتوودا چ گەورە زانایەکی لێ پەیدا دەبێت....

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

تەمەنی " نۆزدە " ساڵان بوو خوێندنی ئامادەیی تەواو کرد و پلەیەکی زۆر بەرزی بەدەست هێنا و هاورێکانی وایان دەزانی ئەو دەچێت بۆ کۆلێژی پزیشکی یان کۆلێژی ئەندازیاری ، بە پێچەوانەی ئەو دوو ئەگەرەوە " موهتەدا " چوو بۆ کۆلێژی زانست لە کاتێکدا نمرەکانی لە کۆلیژی پزیشکی وەردەگیرا ، دوو ساڵ بەر لە گەیشتن بە زانکۆ – کە ئەو کاتە پۆلی پێنجەمی زانستی بوو – لای " مەلای گەورە" مۆڵەتی مامۆستایی لە حوجرە پێ درا و بوو بە یەکێك لەو مامۆستایانەی دەیتوانی بەرزترین زانستی ئایینی – کە زانستی کەلام ، یاخود زانستی باوەڕ بوو – بلێتەوە سەرباری مەلە کردن لە زانستی فیقھ و ئوسوڵی فیقھ و تەفسیر و زانستی فەرموودە و زمانی عەرەبی بە هەموو بەشەکانیەوە، لەگەڵ هەموو ئەو زانستانەشدا خوێنەرێکی بێ وێنەی سەرجەم ئەو کتێبانە بوو کە لەسەر عیرفان و فەلسەفە و سیرە و مێژووی گەلانی ئیسلامی نووسرا بوون ، ئەو زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی بە تێر و تەسەلی دەزانی و دەیتوانی قسەی پێ بکات و پێی بنووسێت ، کاتێك بە عەرەبی و فارسی قسەی دەکرد دەتوت ئەو دوو زمانە زمانی دایکی ئەون و لە شیرییەوە لەسەری گۆش کراوە ، لە ناو زمانی دایکیشدا – زمانی کوردی – ئەوەندە گفتوگۆی پاراو و شیرین بوو گوێگرْ حەزی دەکرد چەندین کاتژمێر گوێ ی بۆ ڕابگرێت...

بە "چوار " ساڵ کۆلێژی زانستی لە زانکۆی " بەغداد " تەواو کرد و لە قوتابخانەیەکی ناو شاردا وەك مامۆستای زانست دامەزرا ، " مەلای گەورە " حەزی دەکرد " موهتەدا " لە قوتابخانە دانەمەزرێت و ڕۆڵی مامۆستای ئایینی ببینێت ، بۆیە داوای لێ کرد لە مزگەوتەکەی ئەودا بەردەوامی بە حوجرە و وانە وتنەوە بدات ، بەڵام " موهتەدا " ئەوەی پێ خۆش نەبوو ، " مەنسوور " ی بابیشی لەسەر ئەوە ڕاهات بوو دەست نەخاتە نێو کار و بارەکانی " موهتەدا " وە ، چونکە لە ژیانیدا چەندین جار ویست بووی دەستێوەردان بۆ بڕیارەکانی بکات ، بەڵام ڕووبەڕووی هەڕەشەی توند بوو بوویەوە و پاشانیش هەڵە و نەپێکانی بڕیارە [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مـەلای گـەورە " داوای لـێ دەکـرد بـە " موهتـەدا " ی کـوڕی بڵێـت نەبێتـە مامۆستای قوتابخانە و وەکو زانایەکی ئایینی لە لای ئەو بەردەوامی بە کـار و باری زانستی ئایینی بدات ، بەلاّم " مەنسوور " داوای لێبووردنی لـە " مـەلای گەورە " دەکرد و دەیـوت: ( نـاتوانم دەسـت لـە کـار و بـاری "موهتـەدا "وە بدەم )

کاتێك " مەلای گەورە " دەیوت: ( تۆ بابی ئەویت ، مافت لەسـەری هەیـە و بۆت هەیە لە ژیانی ئەو دا قسە و بڕیارت هەبێت)

مەنسوور دەیوت: ( ئەوە ڕاستە ، بـەلاّم " موهتـەدا " نابێـت هـیچ کـەس دەستێوەردان بـۆ کـار و بـاری ژیـانی بکـات ، تەنانـەت هـاتنی بـۆ حـوجرە و خوێندنی زانـستە ئایینییـەکان بـە بڕیـاری مـن نـەبووە، هەرچـەند هاتنەکـەی مایەی دڵخۆشی من بووە...)

" موهتەدا " لە دوای تـەواو بـوونی دەوامـی قوتابخانـە بـۆ خوێندنگەکـەی "مەلای گەورە" دەڕۆیشت و لەوێ وانەی بە فەقێیەکان دەوتەوە و پاشان بـە ناوەوەی منارەی مزگەوتەکەدا سەر دەکەوت و لە لوتکەی منارەکەدا کـە وەك خەڵوەتگایەکی لێ کرد بوو بۆ چەندین کاتژمێر دەمایەوە و درەنگانێك دەهاتە خوارەوە و بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە...

هیچ کەس نەی دەزانی " موهتەدا " لە نێـو منارەکـەدا خـەریکی چییە ، بەلاّم وا باو بوو خەریکی پێدا چوونەوەی وانەکانیـەتی ، چـەندجار فـەقێکان سەریان دەنایە سەری و داوایان لێ دەکرد لەگەڵ خۆیدا سەریان بخات و بزانن لەوێ بە چی یەوە سەرقاڵە ، بەلاّم بە زەردەخەنەیەکی شیرین بەرێی دەکردن و دەڕۆیشتەوە بۆ خەڵوەتگاکە و دەرگای منارەکەی لەسەر خۆی قایم دەکـرد تاکو هیچ کەس ئارامی تەنهاییەکەی نەشێوێنێت...

فەقێکان لای "مەلای گەورە" ئاماژەیان بەو حاڵەتەی " موهتەدا " دەکـرد و ئەویش دەیوت: ( لە " موهتەدا " بگەڕێن ، ئـەوەی لەسـەر ئێـوە پێویـستە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو زانستە ورد و دانسقەی لە لای "موهتەدا " یە وەریبگرن و مەهێڵن لە دەستتان دەربچێت...)

" فەقێ عاسی " بەردەوام تانە و توانجی لە "موهتەدا " دەدا ، بە فەقێكانی تری دەوت: ( بەو خۆ دوور خستنەوە لە ئێمە دەیەوێت لەبەر چاومان خۆی گەورە بكات ، ئەو نازانێت گەورەیی بە زانستە نەك بە خۆ جیاكردنەوە لە مەردوومان..)

هەندێك فەقێ لێی دەهاتنە دەنگ و پێیان دەوت: ( موهتەدا خاوەنی زانستێكی ورد و عیرفانێكی قووڵە و هەمووومان لێی سوودمەند بووین تەنانەت تۆش..)

" فەقێ عاسی " لە وەڵامیاندا دەیوت: ( من خۆم بە منەتباری كەس نازانم و كەسیش جگە لە " مەلای گەورە " لەخۆم بە زاناتر نازانم ، كەمی زانست و نەزانی ئێوەیە " موهتەدا " ی لاتان گەورە كردووە ، ئەگەر بێت و ئێوەش وەكو من پەرە بە زانستی خۆتان بدەن ئەوتان لا بچووك دەبێتەوە...)

بەڵێ ئەو موجادەلە بێ مانایەی " فەقێ عاسی " درێژەی دەكێشا و فەقێكانی تر ناچار دەبوون لێی بێدەنگ بن ، چونكە دەیان زانی دەردی ئیرەیی هەموو گیانی " فەقێ عاسی " ی داگیر كردووە و بە قسە چارەسەر ناكرێت....

" موهتەدا " لە ژووری سەرەوەی منارەكەدا خۆی بە وەرزشێكی دەروونی و بە قووڵاچوونێكی فیكریی دا تێ دەپەڕاند، تەنهایی و گۆشە نشینی بوو بوو بە حەز و خولیای ئەو ، دابەزینی لە ژووری منارەكە و گەڕانەوەی بۆ ناو خێزان و كۆمەڵگە تەنها لە بارێكی زۆر پێویست دا بوو...

بە درێژایی چەند ساڵ " موهتەدا " توانی زۆرێك لە ئاسۆكانی دونیای عیرفان لە ناو ئەو منارەیەدا تەی بكات و بتوانێت — وەك عاریفێكی زۆر مەزن — بە وردەكارییەكانی دڵ و دەروون و مانا قووڵەكانی عیرفان ئاشنا ببێت....

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" موهتەدا " بۆ تەکانە ڕۆحییەکانی و سەیر و سلوکی عاریفانە بە مەزهەب و مەشرەبێکی تایبەتەوە پابەند نەبوو، ئەو سازبوونی دڵ و دەروونی کرد بووە پێوەر بۆ وەرگرتنی کۆی ئەو تەجروبە ڕۆحی یە مەزنانەی کەسانێتر وەك پێڕەوێك پێیەوە پابەند دەبوون ، ئەمە و سەرباری ئەو تەجروبە ڕۆحی یەی تایبەت بوو بە خۆی...

" موهتەدا " دوور بوو لە دەمارگیری نەك بۆ مەزهەبی زانستی زاهیری ئیسلام بە تەنها ، بەڵکو بۆ مەشرەب و ڕێچکە عیرفانییەکانیش بە هەمان پێودان ، لەو ڕاستی یە گەیشت بوو ئامانجی کۆی ئەو ڕێچکە عیرفانیانە یەك ئەنجامە و هەموو لە چاوگەی سازگاری عیرفاندا بە یەکتر دەگەنەوە، بۆیە باوەڕی وابوو ململانێ و بە خراپ زانینی یەکتر تەنها مرۆڤە کورتبینەکان و موریدە پاراونەبووەکان لە کانیاوی عیرفان پێی هەڵ دەستن ، "موهتەدا " بۆخۆی ڕێچکەیەکی عیرفانی سەربەخۆ بوو، بەڵام میتۆد و پەیڕەوی بۆ ڕێچکەکەی نەنووسی بوەوە و بە مەردوومانی ڕانەگەیاند بوو...

خۆشەویستی و ڕێز بۆ هەموان و بوونی پەیوەندی توند و تۆڵ لەگەڵ گەورە پیاوانی سەرجەم ڕێچکە و ڕێبازە عیرفانییەکاندا "موهتەدا " ی گێڕا بوو بە کەسێك میانگیری و کۆبەندی بۆ هەموان دروست بکات ، ئەو ناکۆکییانەی لە نێوانیاندا سەری هەڵ دەدا "موهتەدا " بە جۆرێك لێی دەچووە پێشەوە و چارەسەری دەکرد هەموان بە بەشی خۆیان ڕازی دەبوون و ئەنجامەکەشی دەست کردنە گەردن و خۆشەویستی و وەرگرتنی تەجروبەیەك بوو بۆ داهاتوو...

جار بە جارێك مامۆستایانی ئایینی و گەورە پیاوانی تەریقەت لەسەر " شەریعەت و تەریقەت " کێشە دەکەوتە نێوانیانەوە وجەدەلی نەزۆك و گفتوگۆی دڵ ڕەنجێن سەری هەڵ دەدا ، " موهتەدا " لە ڕێگەی زانستە وردەکەی و تەجروبە عیرفانییە قووڵەکەیەوە دەیتوانی بیر و بۆچوونەکان یەك بخات و ئەو تەم و مژەی دەمەقاڵەی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو باوەڕی چەسپاوی بەو ڕاستی یە هێنا بوو کۆی ناکۆکی و ململانێکان لە ناو ئاییندا بەشێکی بۆ نەزانی و بەشێکی تری بۆ ئارەزوو و بەرژەوەندیبازی دەگەڕێتەوە ، گەر کەسەکان بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆیان وەلا بنێن و بە ئارامی گوێ بۆ زانایەك بگرن زانست و عیرفانی لە خۆیدا کۆ کردبێتەوە هەموو ناکۆکییەکان لە بەین دەچن و جێگەی بە قبوڵ کردنی یەکتری دەگیرێتەوە..

جارێك لە ماڵی خۆیاندا – بە ئامادەبوونی بابی و مەلای گەورە – مەلایەکی ئایینی لەگەڵ شێخێکی تەریقەت دا لەسەر گرنگی و گەورەیی " شەریعەت و تەریقەت " کەوتنە گفتوگۆوە ، جگە لەسەر هەڵدانی ناکۆکی و ڕق و کینە قسە و باسەکەیان شتێکی تری لێوە بەرهەم نەدەهات ، مەلایەکە دەیوت: ( شەریعەت ئەسڵ و بنچینەیە و تەریقەت لقێکە و لە ناو شەریعەت دایە)

بابە شێخیش لێی هاتە دەنگ و وتی: ( شەریعەت بە بێ تەریقەت جەستەیەکی بێ ڕۆحە و مانا و مەرامی تیادا نامێنێت )

مەلایەکە: ( بە پێی ئەم بۆچوونەی بەڕێزت بێت هەر کەس تەریقەتی نەبێت ئەوەی ئەنجامی دەدات بێ ناوەڕۆکە و لێی وەرناگیرێت؟)

بابە شێخ: ( بەڵێ وایە و گومان لەوەدا نییە ، دووڕووەکان کرداریان هەبوو، بەڵام بێ ناوەڕۆك بوو، چونکە باوەڕیان بە ئەنجامدانی ئەو کردارانە نەبوو)

مەلایەکە: (جەنابی شێخ ، مامۆستا و زانایان بە دووڕووان مەشوبهێنە..)

بابە شێخ: ( من تەنها ڕاستییەکم وتووە)

لێرەدا " مەلای گەورە " ڕووی لە " موهتەدا " کرد و وتی: (دەمەوێت بزانم " موهتەدا " لەسەر ئەو قسانە ڕاو بۆچوونی چی یە؟)

موهتەدا: ( مامۆستا گیان ، تا بەڕێزت وەستا بێت لە مەجلیسدا بۆ من بێ ئەدەبییە قسان بکەم )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەلای گەورە: ( بەلاّم من داوات لیّ دەكەم قسە بكەی )

موهتەدا: ( ئەگەر فەرمانە ئەوا ناچارم )

پاشان رووی لە مەلایەكە و بابە شێخ كرد و وتی: ( بۆ ئەوەی بزانین گفتوگۆ لەسەر چی دەكەین پێویستە پێناسەی ئەو دوو زاراوەیە بكەین:

" شەریعەت " ئەو دەستوور و پەیڕەوەیە باس لە پەیوەندییەكانی مرۆڤی باوەڕدار دەكات لەگەلّ مرۆڤ و كۆمەلّ و ژیان و گەردوون و خودا دا ، بەم پێناسەیە " شەریعەت " بریتی یە لە كۆی ئایین و ڕێنموویی‌یەكانی) .

مەلایەكە: ( ڕەحمەت لە باوك و دایكت)

" موهتەدا " زۆر لای بەلای پیا هەلّدانەكەی " مەلا " یەكەدا نەكردەوە و بەردەوام بوو لە قسان و وتی: ( تەریقەتیش بریتی یە لە ڕۆح و جەوهەری ئەو پەیوەندییەی مرۆڤ لەگەلّ خۆی و خەلّك و خاك و خوادا دەی بەستێت ، پەیوەندی یەكان بە بیّ ڕۆح و جەوهەر وەكو لاشەیەكە بە بیّ گیان ، نە لاشە بە بیّ گیان دەتوانیّ زیندەگی خۆی پارێزگاری لیّ بكات ، نە گیانیش بە بیّ جەستە مانایەك لەم ژیانەدا وەردەگرێت ، كەوابوو وەكو چۆن ڕۆح و جەستە تەواوكاری یەكترن ئەم دوو چەمكەش هەر بەو پێودانەیە ، دروشمەكانی پەرستش لە ناو ئایینەدا دوو ڕوویان هەیە: ڕوویەك لە دەرەوەیە و جەستە پێی هەلّ دەستێت ، ڕووی دووەم لە ناوەوەیە و دلّ كاری تیادا دەكات ، شەریعەت — بە مانا فیقهییەكەی — ڕووی دەرەوەی كردارەكان ڕێك دەخات و تەریقەتیش ئیشی لەسەر ڕووی ناوەوەی كارەكەیە ، تاكو كردارەكەپڕ بێت لە باوەڕ و دلّسۆزی و لێوان لێو بێت بە عیشق و مەحەببەت...

پیاوانی " شەریعەت " كاتێت باس لە " شەریعەت " دەكەن هەندێكیان مەبەستیان پێی ڕشتەی " فیقهی " یە كە یەكێكە لە زانستەكانی ئایین ، لە ڕاستییدا بەم مانایە — كە شەریعەت زانستی فیقە بێت — تەریقەتی تیادا جیّ نابێتەوە و بۆمان هەیە بلّێین تەریقەتیش زانستێكی ترە و دەتوانین بەرانبەر

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بە " شەریعەت " دای بنێین ، بەلاّم گەر "شەریعەت " ئەو پێناسەیە بێت مـن لە سـەرەتاوە باسـم لێـوە کـرد ئـەوە مانـای " شـەریعەت و تەریقـەت " یـش دەگەیـەنێت ، بـەڵکو مانـای کـۆی ئـەو دەسـتوور و یاسـایانەیە ئـایین بـەیانی کردووە...

"تەریقـەت"یـش گـەر مەبەسـتی ئـەو ڕێـچکە و ڕێبـاز و تەریقەتـە دیـاری کراوانەیە لە مێژووی گەلانی ئیسلامیدا سـەریان هەڵداوە دیسان بەشـێکە لـە ئایین و هەموو ئایین نییە ، خۆ ئەگەر مەبەست پێی ئەو ڕۆح و جەوهەرەیە لە قووڵایی دەستوورەکانی ئاییندان ئـەوا بەشـێکی فـرە مـەزنی ئایینـە ، بـەڵکو ئایین بە بێ ئەو بەشە کاڵ و کرچە و مانا و مەرامی خۆی لە دەستداوە ، نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت ئەو بەشـە فـرە بنـچینەیی و گرنگـە لـە دەقـی پـیرۆزی سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکاندا بە "ڕەبانییەت " ناو زەد کراوە ، پاشـان لـە مێژووی ئیسلامیدا تایبەتمەندی کولتوور و کۆمەڵگە جیاجیاکانی وەرگرتووە و ناوی "تەسەوف"ی بۆ بەکار براوە ، دواتریش " تەسەوف " قاڵبی مەزهەب و مەشرەبی ڕۆحیی جۆراوجۆری وەرگرتووە و ناوی تـەریقـەتی لـێ نـراوە ، لـەم گەشتە دوور و درێژەی مێژووی ڕۆحانییەتـدا بۆمـان ئاشـکرا دەبێـت چـۆن لـە گەردوونییـەت و ڕەهابوونـەوە ڕۆحانییـەت وردە وردە دابـەزیوە و سـنووردار کـراوە و قـاڵبی جۆراوجـۆری بـۆ خـولقێنراوە ، گـەر بمانـەوێت جـارێکی تـر ڕۆحانییـەت بـەرە و گـەردوونی بـوون ببەینـەوە — کـە لـە ئـەمڕۆدا سـەراپای ڕەهەندەکانی ژیانی مرۆڤ بەرەو جیهانی بوون دەڕوات — سەرەتا دەبێت نـاوە جۆراوجۆرەکان فەرامۆش بکەین و لە سنوورە بچووکەکانی ڕۆحانییـەت بێینـە دەرەوە و بەرە و ڕۆحانییەتێکی گەردوونی هەنگاو هەڵ بگرین ، گەرەکـە لـەم مەیدانەدا تەجروبەی ڕۆحیی ئایینەکانی تریش بە کەم سەیر نەکەین ، چـونکە تەنها خاڵێك کۆی ئایینەکان بـە یـەکتر دەگەیـەنێت و دەتـوانن لـە سـەری کـۆ ببنەوە و گفتوگۆی لەسەر بکەن بریتی یـە لـە ڕۆحانییـەت ، یـاخود عیرفـان ، ئایینــەکان نــاتوانن لــە فیکــر و فەلــسەفەدا یــەك بگرنــەوە ، نــاتوانن لــە دروشمەکانی پەرستشدا وەکو یەك

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

تەجروبەی ڕۆحیی یەکتری وەربگرن ، تەجروبەیەك هەموو ئایینەکان بە بەرز و بڵند تەماشای دەکەن و بۆ پابەندبوون پێ یەوە هانی شوێنکەوتوانیان دەدەن...

مەلای گەورە: ( ئەو بەرەو گەردوونی بردنەی ڕۆحانییەت چ ناوێکی بۆ دەدۆزییەوە ؟)

موهتەدا: ( ناوی دەنێین "عیرفان"، عیرفان ئەو پانتاییەیە ئایینەکان و بیرمەندان و ڕۆشنفکران و فەیلەسوفان و عاریفان بە یەکتر دەگەیەنێت)

مەلای گەورە: (کوڕم " موهتەدا "، ئەم زانستە نایابەت لە کوێ بەر چنگ کەوتووە ؟)

موهتەدا: ( لە بەڕێزت و خەڵوەنشینی ناو منارەکەوە)

مەلای گەورە: ( چەند خەونێکی مەزنە گەر هەموو مرۆڤایەتی لەسەر پانتایی " عیرفان " بە جیاوازی ئایین و زمان و ڕەنگ و ڕوویان کۆ ببنەوە ! )

موهتەدا: ( یان هیچ نەبێت گەورە پیاوانی ئایینی و ئەندێشمەندانی مەزن لەو ڕاستی یە بگەن ، گەر ئەو خەونەش نەتوانرێت بهێنرێتە دی ئەوا مەزنانی ئەم ئایینە با لەسەری کۆ ببنەوە ، ئەگەر نە ، با مامۆستایانی ئایینی و ڕابەرانی ڕۆحیی لەسەر ئەو سفرەیە دابنیشن ، گەر هەموو ئەوانەمان نەتوانی خۆ دەتوانین پیاوانی ئەم دانیشتنە لە یەکتر تێ بگەین و لە کانیاوی سازگاری " عیرفان " پاراو ببین )

" مەلای گەورە " سەیرێکی مەلایەکە و بابە شێخی کرد و وتی: (پێم وایە هەمووومان ئەوەندەمان بەس بێت)

ئەوانیش سوپاسی خۆیان بۆ " مەلای گەورە و موهتەدا " دەربڕی و کۆتایی بە دانیشتنەکەیان هات...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

** ** ** ** ** **

وانـەکانی " موهتـەدا " لـەناو قوتابیـان و مامۆسـتایاندا ناوبـانگی دەرکـرد بوو، ئەو کاتێك دەچووە پۆل و دەستی بە وتنەوەی وانەکەی دەکرد هەست و نەستی قوتابیانی داگیر دەکرد و گەشتێکی گەردوونی و زانستیی پێ دەکردن ، وانەی زانست بە تایبەت فیزیا لای قوتابیان ئەو باخچە دڵگیرە بـوو حـەزیان نەدەکرد لێی بێنە دەرەوە و زۆرجـار کـاتی پـشوەکانیان لـە " موهتـەدا " ی مـودەریس دەگـرت و نـەیان دەهێـشت بـۆ ژووری مامۆسـتایان بگەڕێتـەوە ، مامۆستایانی تر لە "موهتەدا"یان دەکردە شـۆخی و دەیـانوت : لـە جێگـەی پێنج وانەکە قوتابیان پێیان خۆشە پێنج کتێبی فیزیا لەگەڵ خۆیان بهێنن..

" موهتــەدا " بــە بزەیــەکی شــیرین مامۆســتایانی بــەڕێ دەکــرد ، بــەلاّم بەڕێوەبەری قوتابخانەکە لـە جێگـەی ئـەو وەلاّمـی مامۆسـتایانی دەدایـەوە و پێی دەوتن: ئێوەش با وانەکانتان تەڕ و پـاراو بێـت و بتـوانن هەسـت و بـیری خوێندکاران داگیر بکەن...

زانــستی فیزیــا لای " موهتــەدا "حــەز و شــەوق و ئــارەزوو بــوو ، بۆیــە هەمووجارێك دەیوت : چەندە قوتابیـان چـێژ لـە وانـەکان وەردەگـرن مـن دوو ئەوەندە..

ئەو پرسیاری لای قوتابیان دروست دەکـرد و هـزر و بیریـانی دەشـڵەقاند و دەیهێنانە قسە و گفتوگۆ، زۆرجار " موهتەدا " وەك قوتابییـەك دادەنیـشت و یەکێکی لەوان هەڵدەستان و داوای لێ دەکرد لە جێگـەی ئـەو وانـە بڵێتـەوە ، ئەمەش وای لە قوتابیان دەکرد بۆ وانەکان خۆیان ئامادە بکەن و فێری بوێری ببن...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕۆژێك قوتابییەك لە مامۆستای پرسی: (مامۆستا دەربارەی دروست بوونی گەردوون زانست چی دەڵێت ؟ یاخود ڕوونتر بڵێم گەردوون چۆن دروست بووە ؟)

موهتەدا : ( لە ناو زانستدا چۆنێتی دروست بوونی گەردوون ساغ نەبۆتەوە ، بۆیە زانایان بە باسێکی فەلسەفی تەماشای دەکەن و خۆیانی پێوە سەرقاڵ ناکەن ، ئەوان دەڵێن گەڕان بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا کاری فەیلەسوفانە و پێویستە ئەوان بە دوایدا بگەڕێن ..)

قوتابییەك : ( ئەدی فەیلەسوفان چی لەوبارەیەوە دەڵێن ؟)

مامۆستا: ( فەیلەسوفان و گەردوونناسان بۆ چەند بیرێك — لەمەڕ سەرهەڵدانی سەرەتای گەردوون — دابەش بوون: هەندێکیان پێیان وایە گەردوون هەربووە و سەرەتایەك بۆ بوونی نییە ، گەردوون — هەر وەك مۆمێك — بە پێی قۆناغەجۆراوجۆرەکانی دادەگیرسێ و دەکوژێتەوە و جارێکی تر هەڵ دەگیرسێتەوە ، بەوجۆرە لە سوڕی بازنەیی خۆیدا بەردەوام دەبێت ، ئەم باوەڕە هەندێك لە فەیلەسوفانی یۆنانی کۆن و فەیلەسوفە ماتریالیستەکانی چاخی نوێ دەگرێتەوە ، ئەوان باوەڕیان بە دیالێکتیك ( جەدەل ) ی ماددی هێناوە ، واتە ماددە لە بن نایە و لە جووڵە و گەردشێکی بەردەوامدایە و ئامادەیی ئەوەی تێدایە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بگوێزێتەوە...

بەشێکی تر لە فەیلەسوفان لەسەر ئەو ڕایەن لەو دیوی ماددەوە بوونێکی ڕەها لە دۆخێکی تردا بوونی هەیە و سەراپای گەردوون لەوەوە هەڵقوڵاوە و سەرچاوەی وەرگرتووە ، لێرەدا هەڵگرانی ئەم ڕایە دەبن بە دوو بەشەوە: بەشێکیان ماددییەت زاڵە بەسەریاندا و دەڵێن: ئەو سەرچاوەی دەکەوێتە ئەو دیوی ماددەوە هەر ماددەیە ، بەڵام لە دۆخ و شێوەیەکی تریدا ، واتە ماددەیە ، بەڵام ماددەیەکی باڵا و بڵند، ئەوان دەڵێن لەو دیوی ماددوەوە تەنها ماددە بوونی هەیە ، بەڵکو هیچ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەشی دووەمیان زانایانی ئایینین و دەڵێن: ئەو بوونەی لەو دیوی ماددەوەیە خودایە و هەربووە و سەرچاوەی هەموو بوونەکانی ترە ، زانا ئایینیەکانیش دیسان لەناو خۆیاندا بۆ دوو بەرە دابەش دەبن : بەرەیەك کە زانایانی دەقی پیرۆز و شرۆڤەکارانی زانستەکانی ئایینن پێیان وایە خودا لە نەبوون (عدم)ەوە گەردوونی دروست کردووە ، بەرەی دووەم هەندێك لە فەیلەسوفانی دونیای ئیسلامن و ڕایەکەی خۆیان بە بیری فەیلەسوفانی یۆنانی کۆن بەهێز دەکەن و پێیان وایە گەردوون وەك ئامادەیی (الاستعداد) و وەك زانست ( العلم ) لە زاتی خودادا هەرهەریی ( أزلي ) ە و هەر بووە و سەرەتایەکی بۆ نییە ، بەڵام ئەو " ئامادەیی و زانست"ە لە چرکە ساتێدا لە زاتی خودای بەرز و بڵندەوە هەڵ دەقووڵێت و دەبێت بە کردار ( الفعل ) ، لای ئەم دەستەی دووەمە گەردوون دوو ڕووی هەیە: ڕوویەك هەربووە و سەرەتایەکی بۆ نییە کە ئەو جۆرە بوونەیە لە زاتی خودادا هەی بووە ، واتە بوون وەك (ئامادەیی و زانست) ، هاوڕێ لەگەڵ بوونێك سەرەتایەکی هەیە و لەگەڵ یەکەمین چرکەساتی زەمەندا لەدایك دەبێت و ئامادەیی بۆ کردار دەگۆڕێت ، واتە ئامادەیی لە زاتی خوداوە بۆ کردار (خلق) دەگۆڕێت ، ئەم بەرەی دووەمە میانەگیریان کردووە لە نێوان ئەوانەی پێیان وایە گەردوون هەر بووە و ئەوانەی پێیان وایە گەردوون لە نەبوونەوە هاتۆتە بوون ، ئەم بەرەیەش ( (بەرەی دووەم ) دیسان بۆ چەند بۆچوونێکی تر دابەش دەبن: هەیانە پێیان وایە گەردوون خودایە ، یاخود گەردوون جیلوەکردن (تجلیات) ی خودایە ، وەکو چۆن ماددەگەراکان وتیان ئەو شتەی لەو دیوی ماددەوەیە هەر ماددەیە ، بەلأم لە دۆخێکی تریدا ، ئەم دەستەیەش کە خاوەنی مەزهەبی یەکێتی بوون ( وحدة الوجود) ن بیرۆکەکەی فەیلەسوفە ماددییەکان هەڵ دەگێڕنەوە و بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەڵێن: گەردوون خودایە ، بەڵام لە دۆخێکی تریدا ، یاخود لە جیلوە ( تجلي ) کردنێکی تردا ، بەشێکیش دەڵێن: ڕاستە گەردوون لە زاتی خوداوە هەڵقوڵاوە ، بەڵام گەردوون گەردوونە و خوداش خودایە و ناتوانین ئەو دوانە تێکەڵ بە یەکتری بکەین ، تیۆری زانست

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

و فەلسەفییەکەی " هنری برغسن" دەچێتەوە سەر ئەم ڕایە و پێی وایە سەراپای گەردوون لە چرکە ساتێکدا و لە یەك خاڵەوە و لە وجوودێکی ڕەهاوە هەڵقوڵاوە و هاتۆتە بوون..)

قوتابییەکی تر: ( مامۆستا، ئێمە بەم گشت ڕا پێچەوانە و دژ بە یەکانە ئاڵۆزتر بووین ، تۆ کام لەم ڕایانەت لا پەسەندە ؟)

مامۆستا: ( هەڵبژاردنی ڕایەك بەسەر ڕایەکی تردا کارێکی هەوانتە و ئاسان نییە ، من نامەوێت ڕای زانستی بۆ ئێوە بە ئایدۆلۆژیا بکەم ، هەموو ئەوەی باسی دەکەم ڕا و بۆچوونە و وەك ڕاستییەکی زانستی وەرناگیرێت)

قوتابییەکە: ( بەلاَم خۆ دەبێت لەمەڕ پرسیارێکی چارەنووسسازی لەو جۆرە خاوەنی ڕای تایبەت بە خۆت بیت)

مامۆستا: ( بەڵێ ڕای تایبەت بەخۆم هەیە ، بەلاَم دەترسم ڕایەکەی من بە لاسایی کردنەوە لای قوتابیان وەربگیرێت ، وەلاَمی ئەو پرسیارە خۆ ماندوکردنی شەو و ڕۆژی گەرەکە ، بە لاسایی کردنەوە و چاولێکەری وەرناگیرێت ، من لای خۆمەوە تەمەنێکم بۆ بەدەست هێنانی ئەو وەلاَمە بەخت کردووە ، ئێوەش دەبێ هەریەکە و لە جێگەی خۆیەوە خۆی ماندو بکات ئەگینا لە وەلاَمەکەی من ناگات)

قوتابیەکە: ( لەگەڵ ئەوەشدا پێمان خۆشە – وەك یەکێك لە ڕایەکان – گوێبیستی ڕای تۆش ببین )

مامۆستا: ( سەرچاوەی ڕایەکەی من بریتی یە لە زانست و فەلسەفە و ئایین ، من هاتووم ڕایەکەی خۆم بەم سێ سەرچاوەیە قایم کردووە، واتە لەم سێ مەیدانەدا ڕایەکەی من جێگەی دەبێتەوە....

سەرەتا بە پرسیارێك دەست پێ دەکەم: ئایا ئێمە گومانمان هەیە لە بوونی خۆمان و لە بوونی گەردوون؟)

بەشێك لە قوتابیان: ( نەخێر )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا: ( گەر هەندێکیشتان بڵێن : بەڵێ گومانمان لە بوونی خۆمان و ژیان و گەردوون هەیە و نازانین بەڕاستی هەین یان نین ! ماڤ خۆتانە ، چونکە بەر لە ئێمە فەیلەسوفێکی مەزنی وەکو "دیکارت" هەمان گومانی لە لا دروست بوو ، ئەو لە بوونی هەرچی بوونە کەوتە گومان ، تا وای لێ هات لە بوونی خۆشی بکەوێتە گومانەوە و بڵێت: گومانم لە " بوون " ی خۆم هەیە ، بەلأم دواتر ئەو لۆژیکەی بەکار هێنا کە دەڵێت: بۆ هەموو گومانێك گومانبەرێك بوونی هەیە ، " گومان " لە کوێ بوونی هەیە گەر یەکێك نەبێت گومان ببات؟ واتە بۆئەوەی " گومان " بوونی هەبێت پێویستە" گومانبەر " بوونی هەبێت ، من لە بوونی خۆم گومانم هەیە ، کەوابوو یەکێك هەیە گومان دەبات و لە بوونی خۆی گومانی بۆ پەیدا بووە ، لێرەوە من گومان دەبەم کەوابوو من هەم ، بۆیە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێت: من بیردەکەمەوە کەوابوو من هەم ، ئەو کاتێك گومانی دەبرد لە پرۆسەی گومانگەرایی دا بوو ، پرۆسەی گومان کردنیش پەیوەستە بە پرۆسەی بیرکردنەوەوە ، واتە ئەو کاتێك سەرقاڵی گومانەکەی خۆی بوو لە بیرکردنەوەدا بوو ، بۆ بیرکردنەوەش پێویستە کەسێك هەبێت بیر بکاتەوە ، لێرەوە یەکەم بوونی جێگیر کرد کە بوونی خۆی بوو: (بوونێکی بیرکەرەوەی گومانبەر ) ، بەوجۆرە لە بوونی خۆیەوە بوونی بۆ سەراپای ژیان و گەردوون گێڕایەوە ، واتە خۆی ( بیرکردنەوەی خۆی ) بوو بە سەرچاوەی هەموو بوونەکانی تر ...

ئێستا ماڤ خۆمانە بڵێین: ئێمە و ژیان و گەردوون هەین و بوونمان هەیە، با لێرەدا ئەمە ناو بنێین یاسای یەکەم ، یاسای یەکەم: گەردوون بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە و وەهم و ئەندێشە نییە...

پرسیارێکی تر: ئایا گەردوون لەو کاتەوەی هەیە لەم دۆخ و شێوازەی ئێستایدا بووە؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر ، چونکە زانست دەڵێت: گەردوون بەشێکی گازە و بەشێکی تری خۆرە و بەشێکی تری هەسارە و مانگ و کلکدار و بەردی گەڕۆکە لە کۆمەڵەکانی خۆردا ، خۆرەکان دەکوژێنەوە و خۆری تر دادەگیرسێت و لە دایا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لاوێتیدایە و ملیارەها ساڵی تر دەبات ئەوجا پیر دەبێت و دەمرێت ، یاخود دەکوژێتەوە و دەچێتەوە دۆخێکی تری ، خۆر بەرهەمی ئەو تەقینەوە ناوەکییانەی لەسەری ڕوودەدا بە بەردەوامی لە بارستایی ( الکتلة ) ە کەی کەم دەکات و دەبێت بە وزە ، بۆیە ڕۆژێك دێت تەقینەوە ناوەکی و هایدرۆجینییەکانی کۆتایی پێ دێت و لەوێشەوە کۆتایی بە تیشك و ڕووناکی و گەرمییەکەی دێت ، کەوابوو یاسای دووەم دەڵێت: گەردوون لە چەندین دۆخدایە و بە بەردەوامی لە گۆڕاندایە ، بەشی زۆری گەردوون لە دۆخی پلازمادایە و بەشێکی تریشی گاز و ماددەی ڕەقە و هەموو ئەمانەش لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر لە گۆڕانێکی سەروم‌ڕدایە...

پرسیاری سێیەم : ئایا گەردوون ڕاوەستاوە یان لە جووڵە و گەردشێکی بەردەوام دایە؟ زانست دەڵێت: سەراپای بوون لە جوڵەیەکی سەرو مڕدایە ، ئەمەش یاسای سێیەمە.

یاسای چوارەم: یەکبوونی سەراپای گەردوونە ، مەبەستم ئەوەیە بڵێم سەراپای گەردوون لە گەرد و گەردیلە پێك دێت و گەردیلەکانیش بۆ ئەلەکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن و هەندێك تەنۆلکەی وردی تر دابەش دەبێت ، کەوابوو بنچینەی گەردوون وزەیە ، بەڵکو گەردوون تۆپەڵێکە لە وزە ، بەلام وزە لە چەندین دۆخیدا : پلازما ، گاز ، ماددەی ڕەق...

یاسای پێنجەم : گەردوون بریتی یە لە تۆپەڵە وزەیەکی زەبەلاح لە هەزاران بەشی چرکەیەکدا دەکوژێتەوە و پاشان دادەگیرسێتەوە ، واتە بوونی گەردوون لە شێوەی قووڵپەدایە ، بوونی گەردوون بوونێك نییە لەسەر هێڵێکی ڕاست و بەردەوام ، بەڵکو بوونێکە لە کوژانەوە و داگیرسانێکی هەمیشەیی دایە ، ئەم ڕاستی یە زانستی یە لە ناو فیزیای چەندێتی (فیزیاء الکم) دا باسی لێوە کراوە ، کوژانەوە و داگیرسانی گەردوون تەنانەت لە وزەی گلۆپدا بوونی هەیە و ئەویش — لە کاتی پێ بوونیدا — بە خێرایی و بەردەوامی دەکوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە ، ئەوەندە کاتی کوژانەوە و پێ بوونەوەکە کەم و تیژڕەوە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئێمەی مرۆڤ وەهممان لا دروست دەبێت و پێمان وایە گلۆپەکە بە بەردەوامی دەگرێت ، بەلاّم لە ڕاستیدا ئەو گولۆپە لە کوژانەوە و پێ بوونەوەیەکی سەرومڕدایە...

وتمان گەردوون تۆپەڵێکە لە وزە ، ئەم وزەیەش بە بەردەوامی دەکوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە ، لێرەدا زانایان دەڵێن : کاتێك گەردوون وەك تۆپەڵێك وزە دەکوژێتەوە و دادەگیرسێتەوە ، سەراپای گەردوون بە بەردەوامی دەچێتە دونیای نەبوون ( عدم ) ە وە و جارێکی تر دێتەوە بۆ ناو جیهانی بوون ( وجود) ، پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا گەردوون کاتێك دەبێت بە نەبوون و دەچێتە دەریای " عەدەم " خۆی خۆی دێنێتەوە بۆ ناو جیهانی بوون ( وجود) یان هێزێکی تر بوونی پێ دەبەخشێتەوە؟ ئاشکرایە ئەگەری یەکەمیان لە ڕووی لۆژیکەوە بێ مانایە ، چونکە گەر گەردوون بچێتە دەریای " عەدەم " بوونی نامێنێت ، جا ئەگەر بوونی نەما چۆن دەتوانێت خۆی بهێنێتەوە ناو بوون و وجوود بەخۆی ببەخشێتەوە؟ دیارە دەبێت هێزێکی هەرهەری هەبێت تاکو بوون بە گەردوون ببەخشێتەوە ، ئەو هێزەی گەردوون دەهێنێتەوە ناو جیهانی وجوود دەبێت بوونەکەی خۆی بوونێکی هەتا هەتایی بێت ، ئەگینا گەر ئەویش بچێتە ناو دەریای عەدەم ئەدی کێ بوونی بەو بەخشییەوە؟ بۆیە بە ناچاری دەبێت دان بە بوونێکی هەرهەرییدا بنێین ، لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: چۆن گەردوون یەکەمین جار لەو بوونە هەرهەرییەوە هەڵقولا ؟ لێرەوە پرسیارەکە لە دونیای زانست و فەلسەفەوە پەلکێشمان دەکات بۆ ناو فەزای ئایین و دەقە پیرۆزەکان..)

قوتابییەك: (مامۆستا ، بۆچی ئایین لەو مەیدانەدا قسەی تایبەت بەخۆی هەیە ؟)

مامۆستا: (قسەی هەیە ، بەلاّم قسەکانی ئایین قسە هەڵ دەگرێت)

قوتابیەکە: ( مەبەستت چی یە ؟)

مامۆستا: ( قسەکانی ئایین لێ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

قوتابییەکی تر: ( دروستترین لێکدانەوەی ئایین لای بەڕێزت لەم مەیدانەدا بە پەسەندی بزانیت کامەیە؟)

مامۆستا: ( با ناوی دروست و پەسەند لە ڕایەکان نەنێین ، چونکە ئەوە بیر و تێڕوانینی ئێمەیە و دەگونجێت کەسانێك هەبن ئەو بیر و باوەڕەی ئێمەیان قبوڵ نەبێت ، لەگەڵ ئەوەشدا من ڕا و سەرنجی خۆم لە دونیای ئاییندا بۆ ئەو بابەتە دەخەمە بەردەمتان )

قوتابییەك : (مامۆستا بۆ دەڵێیت ڕاو سەرنجی خۆم و ناڵێیت ڕا و سەرنجی ئایین ؟)

مامۆستا: (کاتێك بە ئێوە بڵێم ئەمە قسە و بۆچوونی ئایینە لەمەڕ ئەو بابەتە ، واتە ئەوەی وتم قسەی خودایە و حەقە و دروستە و دەبێت باوەڕی پێ بهێنن ، ئەمەش گەورەترین ستەمە لە ئێوە و لە ئایینی دەکەم ، ستەمم لە ئێوە کردووە ، چونکە قسە و بۆچوونەکانی خۆمم بە ناوی خوداوە بە ئێوە فرۆشتووە ، لە هەمان کاتدا ستەمم لە ئایین کردووە ، چونکە قسەی ناپیرۆزی خۆمم – وەك قسەی خودا – پیرۆز کردووە و تێکەڵم بە ئایین کردووە ، ئەمەش شێواندنی حەقیقەت و ڕووخاندنی پایە دامەزراوەکانی ئایینە...

با لەسەر هێڵی باسەکەمان لا نەدەین و بگەڕێینەوە سەر مەبەستە سەرەکییەکە ، خودا کاتێك باس لە دروست کردنی گەردوون دەکات باس لە ئەفراندن ( خلق ) دەکات ، ئەفراندن واتە ئەندازەگیری (تقدیر) و دروست کردن ( صنع ) ، ئەفراندن لەناو دەقی پیرۆزی قورئاندا مانای دروست کردن نییە لە " عەدەم "ە وە ، دەبێ ئەوە بزانین " عەدەم" زاراوەیەکی ناو دەقی پیرۆز نییە و تەنها لە ناو فەلسەفەدا گفتوگۆی لەسەر کراوە ، " عەدەم " جگە لە بێمانایی مانایەکی تری نییە ، بەڵکو دەقی پیرۆز دەچێت بە گژ بیرۆکەی " عەدەم " دا و دەڵێت: "أم خلقوا من غير شيء أم هم الخالقون" ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئایا لە هیچ ( عەدەم ) ە وە دروست کراون یان خۆیان دروستکەری خۆیانن...؟

لێرەدا دەقی پیرۆز دوو ئەگەر دەخاتە بەردەمی مرۆڤ : یەکەمیان لە هیچ ( عدم ) ە وە خولقێنرا بن ، ئەگەری دووەم خۆیان خالقی خۆیان بن ، بۆیە لۆژیکی بیرکردنەوە هەردوو ئەگەرەکە ڕەد دەکاتەوە و تەنها یەك لۆژیك دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە : مرۆڤ و تەواوی گەردوون لە شتێکەوە بوونی پەیدا کردبێت و سەرچاوەی گرتبێت ، لێرەدا هیچ چارەیەکی تر نییە جگە لەوەی دان بنێین بەو ڕاستییەدا کە تەواوی گەردوون لە بوونێکی هەرهەرییەوە هەڵقوڵاوە و ئەم شێوە و دۆخەی ئێستای وەرگرتووە...)

قوتابییەك : ( مامۆستا ئێستاش لام ڕوون نییە چۆن ئەم گەردوونە لەو بوونە هەرهەرییەوە هەڵقوڵاوە ! )

مامۆستا: ( دەبێ ئەوە بزانین ئەو بوونە هەرهەرییە لە ناو ئایینەکاندا ناوی جۆراوجۆری لێ نراوە ، ئێمە وشەی "خودا" ی بۆ بەکار دەهێنین ، ئەم خودایە تەنها خۆی بوو ، جگە لە ئەو شتێکی تر بوونی نەبوو ، ئەو لە گەورەیی و مەزنی و شکۆمەندی و جوانی خۆیدا نوقم بووە ، ئەم خودایە جیلوە " تجلی " دەکات و لە شاراوەکان (مکنونات) ی زاتی بەرز و شکۆمەندی دەخاتە دەرەوە ، یەکەمین جیلوە بریتی یە لە'دەرکەوتنی " بۆهەیەکان " (ممکنات) لە زاتی خودادا و لەوێشەوە سەرهەڵدانی تەواوی ئەکوان و بوونەکانی تر لەو سەرچاوە بەرز و بڵندەوە...)

قوتابییەك: ( ئایا دەتەوێت بڵێیت ئەم گەردوونەش هەروەکو خودا بوونەکەی هەرهەری یە و گەردوونیش خودایە ؟)

مامۆستا: ( هەرچی بوونی ترە لەخوار خوداوە دوو جۆر لە بوونی هەیە: بوونێك وەکو زانست و ئامادەیی لە زاتی خودای بەرز و بڵند دا — کە پێشتر ئاماژەمان پێ کرد — ئەم بوونەیان هەرهەری یە چونکە لەگەڵ بوونی خودادا زانستی خودا بوونی هەبووە ، گە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

، واتە سەردەمێك هەبووە خودا شتێكی نەزانیوە و دواتر زانستەكەی لە لا دروست بووە كە بریتی یە لە زانستی بوونی گەردوون ، ڕووی دووەمی بوون ئەوەیە سەرەتایەكی هەیە و دەچێتە خانەی بۆهەیەكان ( ممكنات ) ەوە ، ئەمەش بریتی یە لە گۆڕانی ئەو ئامادەیی و زانستەی خودای بەرز و بڵند بۆ كردار بە فەرمانی ببە ( كن ) ، لەوێشەوە هەڵقوڵانی هەرچی بوونە لەو بوونە بەرز و بڵندەوە ( فیكون ) كە لە شێوەی گەردوون و ژیان و مرۆڤدا دەردەكەوێت ، گەردوون خودا نییە ، چونكە پێ یەكی لە ناو "وجوود" دایە و پێ یەكەی تری لە ناو " عەدەم " دا ، بوونێك لە نێوان " وجوود و عەدەم " دا بێت ناكرێت پێی بوترێت خودا )

لەگەڵ گەیشتە ئەم خاڵە زەنگی پشوو لێی دا و قوتابییەكان هەناسەیەكی قووڵیان هەڵمژی و لە ئاسمانەوە بۆ ناو زەوی گەڕانەوە و لەوێشەوە هاتنەوە بۆ ناو پۆلەكەیان...

عەسرەكەی هەمان ڕۆژ "موهتەدا " ڕۆیشت بۆ خوێندنگەكەی "مەلای گەورە " و دوای وتنەوەی چەند وانەیەك بە شاگردەكان لەگەڵ هەندێك لە شاگردە پێشكەوتووەكان – لەسەر یەكێك لە مەسەلە كەلامییەكان كە " قەزا و قەدەر " بوو – كەوتە گفتوگۆ..

یەكێك لە شاگردەكان پرسیاری كرد: ( ئایا " قەزا و قەدەر " بریتییە لە بڕینەوەی هەموو شتێك لە جیهانی نادیار (عالم الغیب) دا بەر لەوەی لەم ژیان و گەردوونەدا ڕووداوەكان ڕوو بدەن و بێنە پێشەوە ؟)

موهتەدا: ( قەزا و قەدەر یەكێكە لەو مەسەلە زۆر ئاڵۆزانەی قسە و گفتوگۆی زۆری لەسەر كراوە و زۆرترین ڕاو بۆچوونی جیاواز لەسەری پەیدا بووە ، لەوێشەوە چەندین گروپ و ڕێچكەی كەلامی سەریان هەڵ داوە ، مەزهەبە كەلامییەكانی مێژووی گەلانی ئیسلامی زۆرن لەوانە "موعتەزیلە و جەهمی و جەبری و قەدەری و ماتریدی و ئەشعەری" و چەندین گرووپگەلی تر ، پرسیاری گەوهەری لەم مەسەلە زۆر

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ویستە – كە بە عەرەبی (الارادة) ی پێ دەوترێت – یان نا؟ ئایا مرۆڤ بەرپرسیارە لە كار و كردەوەكانی خۆی یان نا؟ ئایا ئەو كارانەی مرۆڤ ئەنجامی دەدا بە ئیرادەی ئازادانەی خۆی ئەنجامی دەدا یان خودا پێی ئەنجام دەدات و مرۆڤ تەنها ئامرازێكی دەستی خودایە؟ ئایا بەرلەوەی مرۆڤ بێتە سەر شانۆی ژیان چارەنووسی لێرە و لە پاشەڕۆژدا بۆ دیاری كراوە، یاخود مرۆڤ خۆیەتی چارەنووسی خۆی دیاری دەكات ؟ ئەگەر هەموو شتێك لەسەر مرۆڤ لەسەر نوسراوە، بۆ دەبێ مرۆڤ بۆ لەبەردەم خودادا لە كەمتەرخەمیی و گوناه و خراپەكانی بەرپرسیار بێت؟ ئەمانە و دەیان و سەدان پرسیاری تری لەم جۆرە لەمەڕ مەسەلەی " قەزا و قەدەر" سەر هەڵ دەدەن...)

یەكێك لە شاگردەكان هاتە وەلاّم و وتی: ( مامۆستا هەموو ئەو پرسیارانە ناخ و بیری ئێمەشی داگیر كردووە و پێویستمان بە ڕۆشن كردنەوە و وەلاّمە...)

موهتەدا: ( لە ڕاستی دا كێشەی مێژوویەكی " چواردە " سەدەیی لە كاتێكی كەمدا و لە حوجرەیەكدا ناتوانرێ بە چەند ڕوون كردنەوەیەك چارەسەر بكرێت، ئەو مەسەلەیە پێویستی بە دەیان باس و لێكۆڵینەوە هەیە هاوڕێ لەگەڵ ماندوبوون و خوێندنەوە و بیركردنەوەی سەر و مڕی خودی خاوەن پرسیارەكان، لەگەڵ ئەوەشدا من لێرەدا هەندێك ڕوون كردنەوە دەخەمە ڕوو:

ئێمە تا لە مرۆڤ و گەردوون نەگەین لە ڕاستی ئەو پەیوەندی یە ناگەین مرۆڤ و گەردوون بە خوداوە دەبەستێتەوە، ئایا گەردوون بە مرۆڤ و ژیانەوە لە كوێی بوونی خودادایە، ئایا گەردوون بەشێكە لە خودا یان لە دەرەوەی خوداوەیە، یاخود گەردوون و خودا دوو حەقیقەتی سەربەخۆن و بە هیچ شێوازێك بە یەكتر تێكەڵ نابن، واتە خودا حەقیقەتێكی فرە بالاّیە و پاك و بێ گەردترە لەوەی تێكەڵ بە دروست كراوەكان ( مخلوقات ) ی خۆی ببێت،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

یاخود دروست کراوەکانی بەشێك بن لە ئەو؟ ئەمەش کۆمەڵێك پرسیاری ترە...)

شاگردێکی تر: ( مامۆستا ، ئەو پرسیارانەی لەسەر قەزاو قەدەر تۆ دەیخەیە ڕوو دەتەوێت بیکەی بە وەڵام بۆ کۆمەڵە پرسیارەکەی یەکەمت ؟)

موهتەدا: ( نەخێر ، دەمەوێت ڕێگەخۆش بکەم بۆ بیرکردنەوەیەکی دروست لەمەڕ ئەم مەسەلەیە ، پرسیارەکان دیاری کردنی ئاراستەی باس و خواسەکانە ، بە باوەڕی من تەواوی بوون و گەردوون لە بوونی خودی بەرز و بڵندی خوداوە سەرچاوەی وەرگرتووە ، خودا خاوەنی جیلوەکردن ( تجلیات) ە ، واتە بە بەردەوامی خودا لە نهێنییەکانی خودی خۆی دەخاتە دەرەوە ، قۆناغێکی ئەو جیلوەکردنە بریتی یە لە سەرهەڵدانی بوون و گەردوون ، یاخود سەرهەڵدانی هەرچی بوونی ترە لە خوار زاتی بەرز و بڵندی خوداوە ، خودا بەو جیلوەکردنانە هەر ڕۆژێك لە مەزنی و شان و شەوکەتێکدایە ، مەگەر خۆی بە ئایەت نەیفەرمووە: ئەو — خودا — هەر ڕۆژێك لە شان و شەوکەت و هەیبەتێکدایە ( كل يوم هو في شأن ؟!)

شاگردێك: ( مامۆستا گەر بەم بۆچوونەی بەڕێزت بێت خودا لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە ، ئەدی ئێمە لە زانستی کەلامدا وەرمان نەگرتووە کە خودا ڕووداو (حدث) ی بەسەردا تێ ناپەڕێت و لە ڕەهایی و کەماڵێکی بێ سنووردایە ؟!)

موهتەدا: ( ئەوەی لە زانستی کەلامدا هاتووە بۆ پاك ڕاگرتنی خودایە ، چونکە پێیان وایە گەر خودا ڕووداوی بەسەردا تێ پەڕێت ، واتە لە گۆڕاندایە گەر لە گۆڕاندا بوو ، واتە نەزانی و کەم کەماڵی بەسەردا هاتووە ، خوداش نابێت نەزانی ڕووی تێ بکات ، نابێت زانستێك هەبێت ئەمڕۆ خودا بیزانێ و دوێنێ نەیزانی بێت ، هەر بەو جۆرە بۆ خودا شیاو نییە لە ئاستێکی " کەماڵ "ە وە بگوێزێتەوە بۆ ئاستێکی بالاتر لە کەماڵی پێشوو ، چونکە ئاستی یەکەم دەبێت بە "کەم کەماڵی " بەراورد [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دایە ، ئەو کارەش بۆ خودا دروست نییە ، ئەمەی من دەیلێم جیاوازە و پەیوەندی بەو جێگەیەوە نییە...

هەمان شاگرد: ( چۆن و لە کوێوە جیاوازە ؟ )

موهتەدا : ( خودا لە ئەزەلەوە لە کەماڵێکی " ڕەها " دایە و ئەو کەماڵە " پەتی " یە کەمی نەکردووە ، سەرنج بدەن ناڵێم " کەم و زیاد " ی نەکردووە ، چونکە زیادێك لە کەماڵ بوونی نییە کە خودا خاوەنی نەبێت ، کەماڵی ئەو ڕەهایە و لە سەریەوە کەماڵێك بوونی نییە، بەڵام خودا بەو کەماڵە ڕەهایەوە لە جیلوەکردنێکی بەردەوامدایە و لە دەریای نهێنی بێ پەی و بێ سنووری خۆی دەخاتە دەرەوە و هەتا خودا بێت کۆتایی بەو جیلوەکردنانە نایەت...

ئەمەیە مەزنی ئەو خودایە لە ئەزەلەوە هەتا " ناکۆتا " جیلوە دەکات کەچی کۆتایی بە نهێنییەکانی نایەت و لە کەماڵی ڕەهای خۆی دانابەزێت و لە مەزنی و هەرهەری تایبەت بە خۆی ناکەوێت....

جیلوەکردنێکی تری خودای بەرز و بڵند بریتی یە لە دروست کردنی مرۆڤ لە شێوەی خۆیدا ، خودا خاوەنی دوو جیهانە کە بە " جیهانی خەلق و جیهانی ئەمر " ناسراوە)

شاگردێك: ( "جیهانی خەلق و جیهانی ئەمر " چی یە ؟)

موهتەدا: ( جیهانی خەلق: بریتییە لە سەراپای گەردوون کە لە زانست و ئیرادەی خودای بەرز و بڵندەوە سەرچاوەی وەرگرتووە ، جیهانی ئەمریش: بریتی یە لەو گیانە بەرز و بڵندەی بە بەری جیهانی خەلقدا کراوە و لە ڕۆحی خوداوە سەرچاوەی گرتووە ، جیهانی "ئەمر" تەجەلیياتێکی پێشینەی جیهانی "خەلق"ە ، واتە خودا یەکێك لە جیلوەکردنەکانی بریتی یە لە سەرهەڵدانی جیهانی " ئەمر " و پاشان جیلوەکردنێکی تر بەدوایدا دێت کە بریتی یە لە پەیدابوونی جیهانی "خەلق " لە جیهانی ئەمرەوە ، هەرچی ها لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بووندا جەستە و ڕۆحی هەیە ، جەستەکەی سەر بە " جیهانی خەلق "ە و ڕۆحەکەی سەر بە "جیهانی ئەمرە" )

شاگردێك: ( وتت جیلوەکردنێکی تری خودا بریتی یە لە دروست کردنی مرۆڤ لە شێوەی خۆیدا ، دەمەوێ بپرسم " لە شێوەی خۆیدا " چ مانایەکی هەیە ؟)

موهتەدا: ( لە شێوەی خۆی دا ، واتە لە شێوەی خودا دا ، نەك –وەك دەوترێت – لە شێوەی خودی "ئادەم" دا ، "خۆی"ە کە بۆ خودا دەگەڕێتەوە نەك بۆ "ئادەم"، خودا ئادەمی لە شێوەی خۆیدا دروست کردووە ، کە دەڵێین شێوەی خۆی مەبەستمان ئەوە نییە شێوەی خودا لە شێوەی مرۆڤ دەچێت ، یاخود بە پێچەوانەوە ، مرۆڤ جەستەکەی لە "جیهانی خەلق"ە وە هاتووە کە بریتی یە لە تووخمی ئەو ماددانەی لەشی مرۆڤی لێ پێك هێنراوە ، بەشی دووەمی مرۆڤ ڕۆحەکەیەتی و لە "جیهانی ئەمر"ە وە هاتووە ، واتە مرۆڤ بەشێك لە ڕۆحی خودای بە بەردا کراوە ، ئەم ڕاستییەش لە ناو دەقە پیرۆزەکاندا ساغ بووەتەوە ، هەرچەند هەندێك جار بۆ خۆ لادان لە کۆمەڵێك پرسیار و گومان تەئویل بۆ ئایەتەکان کراوە و مانای تری پێ بەخشراوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مانای ئایەتەکان ڕوون و ڕەوانە و پێویستی بە هیچ تەئویلێك نییە ، خودا ڕۆحی هەیە ( و نفخت فیه من روحي ) لە ڕۆحی خۆمم بە بەر " ئادەم " دا کردووە ، خودا نەفسی هەیە ( تعلم مـا في نفسـي و لا أعلم ما في نفسك ) ، حەزرەتی "عیسا " بە خودا دەڵێت: تۆ دەزانی چی لە ناو دەروونی مندا هەیە ، بەڵام من نازانم چی لەناو دەروونی تۆدا هەیە...

بەڵێ خودا ڕۆح و نەفسی هەیە ، بەڵام ڕۆح و نەفسێك لە کەماڵێکی ڕەهادایە و شایستەیە بە مەزنی و گەورەیی ئەو خودایە و باڵاترە لەو ڕۆح و نەفسەی بە مرۆڤی بەخشیوە ، خودا لە سیفەتەکانی خۆی بەشی مرۆڤی داوە: ( بینین ، بیستن ، زانست ، حیکمەت ، بەزەیی ، ویست) ئەمانە و هەزاران سیفاتی تری مرۆڤ کە لە هەژمار کردن نایەن ، هەموو سەرچاوەکەیان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە خوداوەیە و ئەوە بە مرۆڤی بەخشیوە ، مەزنی مرۆڤ لەو جێگەدایە لە شێوەی خۆیدا دروستی کردووە و لە سیفەتەکانی خۆی بەشی مرۆڤی داوە...

ئێستا دەچمەوە بۆ سەرەتای قسەکانم ، پرسیمان ئایا مرۆڤ خاوەنی ئیرادەیە ، یاخود ژێربار و بێ دەسەلاتە و خودا هەموو شتێکی پێ ئەنجام دەدات ؟ سەرەتا دەڵێم خودا خاوەنی ئیرادەیە و بەشێك لە ئیرادەی خۆی بە مرۆڤ بەخشیوە..)

شاگردێك: ( ئەگەر ڕۆحی مرۆڤ بەشێك بێت لە ڕۆحی خودا ، ئەوا ئیرادەکەشی بەشێکە لە ئیرادەی خودا؟!)

موهتەدا: ( بەشی یەکەمی قسەکەت دروستە ، ڕۆحی مرۆڤ بەشێکە لە ڕۆحی خودا ، بەلاّم بەشی دووەمی قسەکەت دەبێت بە وریاییەوە لەسەری بوەستین ، بەلێ کە ڕۆح بەشێك بێت لە ڕۆحی خودا ئیرادەیەکیش ئەو ڕۆحە هەیەتی هەر لەو سەرچاوەوە بە دەستی هێناوە و وەری گرتووە ، بەلاّم دەبێ ئەوە بزانین تاقیکردنەوەی ئەو ڕۆحە لەو جێگەدایە: گەرەکە جارێکی تر بۆ کەماڵی سەرچاوەی یەکەمی خۆی کە خودایە بگەڕێتەوە ، ئەو ڕۆحە بە هۆی دابڕانی لە سەرچاوەکەی خۆی: ( خودا ) و هاوەل بوونی لەگەڵ ماددەی ئەم گەردوونەدا بەشێك لە کەماڵی خۆی لە دەست داوە و گەڕانەوەشی بۆ ئەو سەرچاوەیە بەوە دەبێت ئیرادەکەی بە گەڕ بخات و بکەوێتە کار و کردار و لە جووڵەیەکی بەرەو کەماڵ چووندا بۆ لای خودای خۆی تەکان بەخۆی بدات و جارێکی تر کەماڵ بە دەست بهێنێتەوە...)

شاگردێك: (جوڵەی " بەرە و کەماڵ چوون " چی یە؟)

موهتەدا: ( جووڵەی بەرەو کەماڵ چوون ، واتە ( الحركة نحو الكمال) ئەوەیە: هەروەکو خودا مرۆڤیش لە جیلوەکردنێکی بەردەوامدا بێت و هەموو نهێنی و پەی پێ نەبراوەکانی ناوەوەی خۆی بهێنێتە دەرەوە و کۆی ئەو ئامادەییەی لە ناو ڕۆحەکەیدایە بیخاتە دەرەوە و بیکات بە کردار ، وەك نموونەی ئەو دەنکە تۆوەی

هێزەکانی خۆی بۆ کردار دەگۆڕێت و دەگاتە ئەو کەماڵە دیاری کراوەی تەکانی بۆ دەدا ، لەوێوە دەبێت بە درەختێکی قەشەنگ یان ڕووەکێکی کامڵ ، ئەمەش مانای ڕاستەقینەی پاکژی ( تزکیة ) یە ، لێرەدا دەبێت ئەوە بڵێین سەرجەم ئەو کردارانەی تەکان بە مرۆڤ دەدەن بەرەو کەماڵ و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی یەکەمی خەسڵەتی ئەو ڕۆحەیە و بەشێکە لەو تایبەتمەندیانەی لە خوداوە وەری گرتووە ، بەڵام کۆی ئەو کار و ئاراستانەی کە بەرە و پەستی دەبیات و دەبێتە هۆی چڕبوونەوەی ماددە لەسەر ڕۆحەکە و بوون بە تەوقێك لە گەردنی دا لە تایبەتمەندی ئەو ڕۆحە نییە و کەم کەماڵی و چڕی ماددە و نەفس و ئارەزوو بە مرۆڤی دەکات ، لێرەدا ئیرادە دوو جۆر لە کاری ئەنجامدا : کارێك لە تایبەتمەندی ڕۆحەوەیە و لە خوداوە بۆی هاتووە ، لەگەڵ کارێك لە دابەزینی ئەو ڕۆحە و سەرهەڵ دانی چەندین نیرووی ترەوە بۆی پەیدا بووە ، یەکەمیان پێی دەوترێت کرداری چاکە (العمل الصالح) و هەموو کردارێکی چاکەش بۆ خودا دەگەڕێتەوە و لەوەوە بە دەست هاتووە ، دووەمیان پێی دەوترێت کرداری خراپە (العمل الطالح) لە ئارەزوو و دەروونەوەیە و هێزە دژ و نەیارەکان بۆ گەڕانەوەی ڕۆح بۆ سەرچاوەکەی پێی ئەنجام دەدەن ، کەوابوو دوو جۆر ئیرادە بوونی هەیە : ئیرادەیەکی چاکەکار لە ڕۆحەوەیە و مرۆڤ لەسەری پاداشت وەردەگرێت ، لەگەڵ ئیرادەیەك لە نەفس و ئارەزووەوەیە و هێزە دژەکان کۆمەکی دەکەن ، ئەمەیان مرۆڤ لەبەردەمیدا بەرپرسیارە و سزای لەسەر وەردەگرێت ، تاقیکردنەوە (الأبتلاء) ی مرۆڤ لەم جێگەدایە کە ئیرادەی چاکەخوازی بەگەڕ بخات و جوانی و مانا قووڵەکانی ناوەوەی خۆی بخاتە دەرەوە و بیکات بە کرداری چاکە و لە هەمان کاتدا ئیرادەی شەڕەنگێزی و سەرچاوەگرتوو لە هێز و نیرووە دژەکان وەلا بنێت و خۆی لە ئەنجامدانی خراپەکاری و شەڕەنگێزی بە دوور بگرێت ، خودا لە قورئاندا پێمان دەڵێت: ئێمە توانامان بە مرۆڤ بەخشیوە بۆ گرتنەبەری هەردوو ڕێگەکە – ڕێگەی چاکە و ڕێگەی خراپە – (و هديناه النجدين...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

یەکێکی تر لە شاگردەکان: ( چەند جارێك ئاماژەت بە وشەی دەروون ، یاخود " نەفس " کرد ، ئایا جیاوازی چییە لە نێوان "نەفس و ڕۆح دا "؟)

موهتەدا: ("ڕۆح " گەوهەر و کرۆکی مرۆڤە بەرلەوەی جەستەیەکی ماددی بە دەوردا بۆ دروست ببێت ، بەلاّم " نەفس " ئەو هێز و نیروانەیە لە تێکەلّ بوونی ڕۆح و ماددەوە بەرهەم دێت ، یاخود نەفس ڕۆحە ، بەلاّم بەو چوارچێوەوە خراوەتە ناوی یان دەتوانین بلّێین نەفس ڕۆحە ، بەلاّم لەو بارەدا کە بەشێك لە کەمالّی خۆی لە دەست داوە ، ئەوەش بەهۆی ئەو دابەزینەی لە "جیهانی ئەمر"ە وە بۆ "جیهانی خەلق" بە سەری دا هاتووە...)

شاگردێکی تر: ( بۆیە خودا لە ناو دەقە پیرۆزەکاندا هەموو چاکەیەکی داوەتە پالّ خۆی و هەموو خراپەیەکی بۆ خودی مرۆڤ گێڕاوەتەوە ! )

موهتەدا: ( بەلّێ ، چونکە ئیرادەی چاك و چاکەکاری بە سروشت و خۆڕسك ( فطرة ) لە ناخی مرۆڤدا بوونی هەیە ، بەلاّم ئیرادەی خراپە و خراپەکاری لە سروشتی مرۆڤ نییە و هەل و مەرجەکانی ناوەوە و دەرەوە پێی ئەنجام دەدەن )

شاگردێك: ( کەوابوو چاکەکاری لە مرۆڤدا ئەسلّ و بنچینەیە و خراپەکاری بارێکی کاتی و تێپەڕیو و تووشهاتووە؟! )

موهتەدا: ( نەك تەنها لە مرۆڤدا ، بەلّکو لە تەواوی گەردوون و ژیاندا حەق و ڕاستی بنچینەدار و پایەدارە و ناحەق و ناڕاست بارێکی شلۆق و کاتییە، حەق ڕیشەدارە و ناحەق بێ ڕیشە ، حەق وەك ئاوی زولالّ دەمێنێتەوە و ناحەق وەك کەف سەر شەپۆلی دەریا لا دەکەوێت ، بە مانایەکی تر ئەو کردار و کارانەی لە نەفسەوەیە بێ ڕیشەن و ئیرادەیەکی شەڕەنگێز بەرهەمی هێناوە ، بەلاّم ئەو کار و کردەوانەی لە فیترەتی پاك و خۆڕسکەوەیە و لە ئیرادەیەکی چاك و پاکەوە سەرچاوەی وەرگرتووە مانادار و ڕیشەدارن)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شاگردێکی تر: ( مرۆڤ چۆن هێز و نیرووەکانی خۆی بخاتە دەرەوە و پەردە لەسەر نهێنییەکانی خۆی لا بدات و بەرە و کەماڵ بۆ سەرچاوەی یەکەمی خۆی بگەڕێتەوە ؟)

موهتەدا: ( ئەم پرسیارە باسێکی ترە و بریتی یە لە چۆنێتی پاکژبوونەوە و " پرۆسەی پاکژی " ، ئەمڕۆ مۆڵەتمان نییە باسی لێوە بکەین و بۆ وانەیەکی تر هەڵیدەگرین )

" موهتەدا " باسەکەی لەگەڵ شاگردەکاندا کۆتا پێ هێنا و مۆڵەتی لێ خواستن و بە عادەتی جارانی هەڵی کردەوە سەر منارەکە و تا ئێوارەیەکی زۆر درەنگ لەوێ مایەوە....

بۆ سبەینێ ڕۆژی هەینی بوو ، سەرلەبەیانییەکەی ڕۆیشت بۆ دوکانی عەتتارییەکەی بابی و چەند کاتژمێرێك لەگەڵ بابی مایەوە ، بابی حەزی دەکرد ئەگەر لە هەفتەیەکدا چەند کاتژمێرێکیش بێت "موهتەدا" سەردانی دوکانەکەی بکات و تاوێك پێکەوە کات بەسەر ببەن....

" مەنسوور " ی بابی هەرجارە و تەجروبەیەکی ژیانی خۆی بۆ کوڕە تاقانەکەی دەگێڕایەوە ، ئەو دەیویست بە گێڕانەوەی ئەو سەربوردانەی ژیان پردێکی پەیوەندی تۆکمە لە نێوان خۆی و کوڕەکەیدا دروست بکات و داهاتووی ئەو بە ڕابردووی خۆیەوە ببەستێتەوە و ڕیشەدار بکات...

"مەنسووری عەتتار" باوەڕی وابوو مرۆڤی بێ ڕیشە و بێ ڕابردووی چاك وپاك داهاتووی ڕۆشن چاوەڕوانی ناکات ، هەر مرۆڤێك لە ڕیشەی خۆی هەڵ بکەنرێت با لە قۆناغێکیشدا بچێتە پێشەوە ، بەڵام سەرئەنجام ڕۆژێك بارەشی ڕۆژگار لێی هەڵدەکات و دەی پێچێتەوە...

ئەمجارەیان " مەنسوور " باسی ڕیشەی بنەماڵەی خۆی بۆ "موهتەدا " کرد ، ئەو لە پرسیارێکی " موهتەدا " وە چووە ژوورەوە کە پرسی: ( بابە ، ئارامی و سووکنایییەك – بە بیرەوەری من – باڵی بەسەر ئەم شارەدا کێشاوە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

، پێم بڵێ لە چی یەوەیە و لە کوێوە هاتووە ، بۆچی شوێنان و شارانی تر ئەم جۆرە ئارامی یە بەخۆیانەوە شك نابەن ؟)

مەنسوور: ( بە بیرەوەری منیش ئەم شارە هەمان ئارامی تیادا هەبوە و کەمتر ئالۆزی و وێرانکاری و هەڵچوون و داچوونی بەخۆوە بینیوە ، ئەمەش بەشێکی بۆ ئارامی دڵ و ڕۆحی هەموو ئەو زانا و عاریفانە دەگەڕێتەوە کە بە زانست و عیرفان بیر و دڵی خەڵکی شاریان لێوان لێو کردوە ، ئەوان تا لە ژیاندا بوون بۆ مرۆڤەکان سەرچاوەی ئارامی بوون و لە دوای مردنیشیان ژیان و کار و کردەوە و زانستیان وەکو خۆیان کاریگەری لەسەر مەردوومان بەجێ هێڵاوە ، بەشێکی تری ئەو ئارامی یە لە ئارامی قەڵا مەزنەکەوەیە کە هەزاران ساڵە لە بەردەم هێرش و پەلامارەکان و گۆڕانەکانی ڕۆژگاردا خۆی ڕاگرتووە و ئارامی خۆی پاراستووە ، مرۆڤ کاتێك لە بەردەم کەسێکی مەزن یان شتێکی مەزن دا دەوەستێت هەست بە مەزنی خۆی دەکات ، قەڵا مەزنەکە مەزنیی بە خەڵکی ئەم شارە بەخشیوە ، ئەو قەڵایە بریتی یە لەو چەقەی تەواوی خەڵکی شار دەخاتە فەلەکی خۆیەوە و بە دەوری خۆیدا دەیان سوڕێنێتەوە ، تەنانەت ئەوانەی لە فەلەکێکی ترەوە ڕوو لەم شارە دەکەن زۆر بە گران دەتوانن لە هێزی ڕاکێشانی قەڵاکە خۆیان قوتار بکەن و ڕوو لە نیشتمانێکی تر بکەن ، ئەو کەسانەی لەخولگەی ئەم قەڵایە دەردەچن و بۆ شارێکی تر دەگوێزنەوە پاش ماوەیەك خۆیان پێ ناگیرێ و بە ناچاری بۆ فەلەکی قەڵاکە دەگەڕێنەوە یان هیچ نەبێت هەتا مردن خۆشەویستی و سۆزیان بۆ قەڵاکە لە لا ماوەتەوە....

سوڕانەوە بە دەوری ماڵ و قەڵا و شوێنی کۆندا کاریگەری قووڵ لەسەر هەست و بیری مرۆڤ بەجێ دەهێڵێت ، بێ حیکمەت نییە خودا داوا لە باوەڕداران دەکات حەج بکەن و بە دەوری ئەو ماڵە دێرینەی ئەودا بسوڕێنەوە ، دەور و خول خواردنی مرۆڤ بە دەوری ئەو ماڵەدا جووڵە و ئاراستەی لەگەڵ جووڵە و ئاراستەی سەرجەم گەردوون دا ڕێکدەخات و هەماهەنگی دەخاتە نێوان مرۆڤ و ژیان و گەردوونەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خول دەخۆن ، خول خواردنی ئەوان لە یەك فەلەکدا جۆرێك لە تەبایی و هەماهەنگی خستۆتە نێوان خەڵکی ناوشارەوە ، ئەمەش دەریایەك ئارامی بەوان بەخشیوە ، خەڵکی نازانێت نهێنی ئارامی و خامۆشییەکەی بۆ ئەو قەلا مەزنە دەگەڕێتەوە ، ڕمان یاخود وێران کردنی ئەو قەلایە وێران کردنی تەواوی شارەکەیە و بە ماوەیەکی کەم ئالۆزی و نائارامی سەرهەڵ دەدات و پشێوی ڕوو لە شار دەکات و ئەنجامەکەی چۆڵ کردن و تەفروتوونا بوونە...

ئارامی خەڵکی ئەم شارە وەکو یەك نییە ، ئەوانەی وەکو قەلای مەزن ڕیشەدارن و خاوەنی بنەماڵەیەکی چاك و پاکن ئارامییان زۆر زیاترە لەوانەی ڕیشە و ڕەگی خۆیان لێ بزر بووە ، ئەو کەسانەی لەم شارەدان و بێ ڕیشەن سەنگینی ئەم قەلایە ڕایگرتوون و ناهێڵێت لە خولگە دەربچن ، ئەگینا ئەو جۆرە کەسانە گەر لە شارێکی تردا بن وەك پووشی بەر "با"یان لێ دێت و هیچ نیشتمانێك نایان گرێتە ئامێز....

موهتەدا: ( بابە مێژوویەکی دیاری کراو هەیە لە هاتنی باپیرانمان بۆ ئەم شارە ؟)

مەنسوور: ( باپیری مەزنمان ناوی " مەروان "ە ، مەبەستم بە "باپیری مەزن" ئەوەیە کە سەجەرەی بنەماڵەکەمان بۆ سەر ئەو دەگەڕێتەوە و ناوی مەزنێکی تر لە پێش ئەوەوە بە دەستمان نەگەیشتووە ، من بە پێنج پشت دەگەمەوە سەر ئەو مەزنە ، ئەو یەکێك بووە لە سەرکردە سەربازییەکانی "میری ڕەواندز " جێگەی ڕێز و متمانەی " میر " بووە ، لە دوای ڕمانی ڕاپەرینەکەی " میری ڕەواندز " و شەهید بوونی " میر محەمەد "، باپیری مەزن ڕوو لەم شارە دەکات و تێکەڵ بە گەورە پیاوانی قەلا دەبێت ، پاش ماوەیەکی کەم دەبێت بە یەکێك لە پیاوە دیار و ماقووڵەکانی شارەکە و دیوەخانەکەی دەبێتە یەکێك لەو جێگایانەی کۆڕی زانست و عیرفانی تیادا گیراوە و زانایان و عاریفانی شار تیایدا کۆ بوونەتەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( لە لام سەیرە پیاوێك سەرکردەیەکی سەربازی " میری کۆرە " بوو بێت دواتر دیوەخانەکەی ببێتە جێگەی کۆڕی عاریفان و زانایان؟!)

مەنسوور: ( بابم لە باپیرانییەوە دەی گێڕایەوە و دەیوت: " کاتێت لە "ڕەواندز"ەوە "مەروان" باپیری مەزنمان ڕوو لەم شارە دەکات بە کۆڵێك خەم و پەژارەوە لێرە نیشتەجێ دەبێت ، ئەو ئازاری شکستی ڕاپەڕینەکەی " میر " و پاشان شەهیدکردنی " میر " هەتا دوایین هەناسەی تەمەنی لێی جیا نەبوویەوە ، بەڵکو خەم و ئازار دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی هەناسە توندی و هەر بەو نەخۆشییەش سەر دەنێتەوە ، ئەو لە بێ هیوایی دا سەری خۆی هەڵگرت بوو ، بێ هیوا بوونیش لە ژیان بەرە و کۆڕی زاهیدان و زانایانی برد بوو ، دەیویست ئەو بەشەی تەمەنی لە ئارامیی دا بەسەر ببات..."

دەڵێن شەوان هەڵدەستا و بە کوڵ دەگریا ، کاتێك هاوسەرەکەی دڵنەوایی دەکرد و دڵی دەدایەوە لە وەڵام دا دەیوت: " ئەگەر پیاوێکی جوامێر بوومایە ئێستا دەبوو منیش لەگەڵ "میر " دا لە ژێر خاك ئەسپەردە بکرابامایە ، من بۆ ناپاکی و ترسنۆکی خۆم و هەموو ئەوانە دەگریم ڕێگەمان دا " میری گەورە " خۆی تەسلیمی "ڕەشید پاشا"ی عوسمانی بکات و بە دیارچاوی ئێمەوە بیبەن و بە ناپاکی شەهیدی بکەن... "

" مەروان " ی باپیرم هەرگیز ئەو شەوەی لە بیر نەدەچوو بۆ سبەینێ "میری ڕەواندز " خۆی بە دوژمنەکانی تەسلیم دەکرد ، دەڵێن لە کۆشکی "میر"ە وە چەندجار گوێیان لە دەنگی "میر" بوو پڕ بە قوڕگی هاواری دەکرد و دەیوت: کەی من ئەو "میر"ە بووم خیانەتم لێ بکرێت؟ من هەموو شتێکم لە پێناوی ئەمارەتەکەم دا بوو ، هەوڵ و کۆششم بۆ سەربەرزی خەڵکی ژێر سایەی ئەم ئەمارەتە بوو..."

ئەو شەوە تا بەیانی گریان و شیوەن لە کۆشکی میرەوە بەرز دەبوویەوە ، سەرکردە سەربازییەکانی" میر " بەچۆکدا هات بوون و دەیان پرسی: ئەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كەسە كێ بێت خیانەتی لە میر كردووە؟ حەقیقەتی ئەو خیانەتە چی بێت وا بەم جۆرە پشتی " میر " ی شكاندووە؟"

دەڵێن داپیرەی مەزن لە " مەروان " ی باپیرمی دەپرسی: بۆچی ئێوەش لەگەڵ " میر " دا نەچوون ؟ بۆ هێڵاتان بە تەنها بڕوات و خۆی بە دوژمنەكانی تەسلیم بكات ؟

ئەو لە وەڵامدا دەیوت: من یەكێك بووم لەوانەی زۆر تكام لە "میر " كرد لەگەڵ خۆی بمبات ، بەڵام " میر " دەیزانی سەرئەنجامی چوونەكەی ڕۆشن نییە ، بۆیە دەیویست كەمترین كەسی لەگەڵدا بێت.. "

دیسان داپیرە گەورەم پێی دەوت: نەدەبوا بهێڵن بەو جۆرە بڕوات و خۆی تەسلیمی دوژمن بكات ، با سەركردە سەربازییەكان بڕیارێكتان لە نەچوونی بدابایە؟

ئەو — بە هەڵ كێشانی هەناسەیەكی قووڵەوە — دەیوت : "میر محەمەد" براكەی خۆی بە ناوی "ئەحمەد" لە جێگەی خۆی دانا و ئەمارەتەكەی دایە دەستی ئەو ، لە لایەكی ترەوە بەڵێن بە "میر" درا بوو لەگەڵ خۆ تەسلیم كردندا سەری سەلامەت دەبێت و ڕێزی "سوڵتانی عوسمانی " بەدەست دەهێنێت ، هەرچەند " میر " لە بەڵێنەكە دڵنیا نەبوو ، لە لایەكی ترەوە خەڵكانێكی سادە و هەندێكیش ناپاك لە سەربازگەی " میر " دا بوونیان هەبوو ، بە چەندین شێوە سەربازەكانی" میر " یان لە جەنگ سارد دەكردەوە ، " چوار " مانگ بوو سێ هێزی گەورە دەوری سوپای "میر"ی دابوو ، سوپای یەكەم لە "دیاربەكر"ە وە و دووەم لە "موسڵ"ە وە و سێیەمین سوپاش سوپای والی بەغدا "عەلی پادشا" بوو ، ئەوان دەیان زانی لە ڕووی سەربازییەوە نایبەنەوە ، بۆیە كەوتنە كۆمەڵێك فێڵ و حیلەی سەربازی و سیاسی دژ بە "میری ڕەواندز "، تا سەرئەنجام فێڵەكانیان سەری گرت و ڕاپەڕینەكەی " میر " یان كپ كردەوە و " میر " یشیان بەو دەردە برد..."

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەنسوور " بۆ " موهتەدا " ی کوڕی درێژەی بە باسەکەی دا و وتی : ( باپیری مەزنم نەیدەوێرا لەناو خەڵكیدا و لە مەجلیسەکانیدا بەسەرهاتی شۆڕشەکەی " میر " بگێڕێتەوە ، چونکە دەیزانی لە لایەن دەسەڵاتدارانی قەڵاوە چاودێری دەکرێت و نایانەوێت خەڵكی مەیل و بەزەیی بۆ مەزڵومییەتی " میری کۆرە " لە لا دروست ببێت ، بۆیە تەنها کەسێك سنگی خۆی بۆ والا دەکرد و دەرگای ئازارەکانی بۆ دەکردەوە بریتی بوو لە هاوسەرەکەی ، ئازاری ئەو شکستە گەورەیە لە جێگەدا خستی و بۆ دوایین جار چاوی لێك نا و تەنها دوو کوڕ و کچێکی لە دوا بەجێما ، یەکێکیان بە ناوی "میران " کە دەبێتە باپیرە گەورەمان...)

موهتەدا: ( دەبێت ئەو مرۆڤە بێ هیوایە بە چ ئازارێکەوە سەری نابێتەوە؟!)

مەنسوور: ( ئازاری شکست گەورەترین ئازارە ، شکستێك سەرکردەکەت لە پێناوی تۆدا سەری دانابێت و تۆش لە ژیاندا مابیت ، لای پیاوی جوامێر ژیان لە دوای مەرگی سەرکردە نەنگییەکی گەورەیە، ئەوان پێیان وابووە تەنها ژن و منداڵ لە دوای سەرکردە مافی ژیانیان هەیە ، بەڵام جەنگاوەر دەبێت هەنگاوی ژیانی لە دوای سەرکردەوە بێت و هەنگاوی مەرگی لە پێش ئەوەوە بێت ، مانای "پێشمەرگە" لەم تێڕوانینەوە وەرگیراوە ، دەڵێن: لە داپیرە گەورەیان پرسیوە بۆچی تەنها سێ منداڵتان هەیە و منداڵی ترتان نابێت؟ ئەویش لە یەکێك لە جارەکاندا لای خوشکێکی خۆی نهێنییەکە دەدرکێنێ و دەڵێت: دوای شکستی ڕاپەڕینەکەی میر و شەهیدکردنی میر ، "مەروان"ی هاوسەرم چەك و شمشێر و خەنجەرەکەی لە گۆڕێك دەنێت و دایان دەپۆشێت.."

درکاندنی ئەم نهێنییە مانای زۆر دەبەخشێت ، لە گۆڕ نانی چەك و شمشێر لای مرۆڤی جەنگاوەر لە گۆڕنانی جوامێری یە ، ئەو لە دوای "میری ڕەواندز " خۆی وەك مرۆڤێکی خاوەن هەڵوێست تەماشا نەکردووە و وای زانیوە شەرەفی جوامێری و جەنگاوەریی لێ وەرگیرابێتەوە ، دەڵێن: بەهاران بۆ سەردانی گۆڕی جوامێریی خۆی دەچووە دەشتی هەریر و بەسەر خەنجەر و چەك و شمشێری لە گۆڕنراویدا دەگریا ، تەنانەت دەڵێ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کە هێمای جوامێری و جەنگاوەری ئەو بوو پێی شەرم بووە وەکو پیاوێك ماف بە خۆی بدات لە هاوسەرەکەی نزیك ببێتەوە و لە ناو یەك جێگەدا پێکەوە بنوون ، ئەمەش هۆی کەمی ژمارەی منداڵەکانی بووە ، بەڵکو جارێك بە هاوسەرەکەی دەڵێت: تۆ لەمن مەردتر و سەربەرزتری ، ماف خۆتە و بڕیار لە دەستی خۆتدایە لە لام دەمێنیتەوە، یاخود لێم جیا دەبیتەوە" ، ئەو قسە و داوایە بۆ پیاوی جوامێر لە تیغی مەرگ بە بڕشتترە ، بەلاّم دیارە ئەو لە دوای مەرگی "میر " خۆی وەکو مرۆڤێکی زیندوو تەماشا نەکردووە...)

موهتەدا: ( بابە ، بەم باسەی ئەمڕۆ ئازارێکی زۆرت لە ناخم دا بەرپا کردووە)

مەنسوور: ( ئەوە ئازاری تێگەیشتنە لە ڕاستییەکان ، ئازارە مرۆڤ گەورە دەکات ، وای لێ دەکا بە بایەخەوە سەیری ژیان بکات و لە تەمەنیدا مرۆڤێکی بە هەڵوێست بێت..)

موهتەدا: ( دەبێت " میری کۆرە " کاریگەری گەورەی لەسەر سەرکردە و سەربازەکانی بەجێ هێڵاّ بێت ؟!)

مەنسوور: ( "میر" بۆخۆی جەنگاوەرێکی قارەمان بووە ، ئازایەتی و جوامێری " میر " خۆشەویستی و مەزنیی لای سەربازەکان بۆ دروست کرد بوو ، وەك ئەوەی مێژوو بۆمان باس دەکات " میر" مرۆڤێکی ئاسایی نەبووە ، ڕاپەڕینەکەی " میر " دەوڵەتی عوسمانی خست بووە بەر مەترسییەکی گەورەوە ، بەڵگەش بۆ ئەو ترسە کۆ کردنەوەی سوپایە بۆ سەر "میر " لە سێ قۆڵەوە ، زۆر کەمن ئەو ڕاپەڕینانەی لە ژێر دەسەلاّتی عوسمانییەکاندا سەریان هەڵ دابێت و بووبێتە مەترسی بۆسەر ڕمانی دەوڵەتی عوسمانی ، لێ ڕاپەڕینەکەی "میری کۆرە" ئاسایی نەبوو ، بەڵکو یەکێك بوو لەو ڕاپەڕینانەی عوسمانییەکان بە وردی پیلانیان بۆ دارشت و پیاوانی قەسری سوڵتان بۆخۆیان هاتن و تیایدا سەرکردایەتی هێزە سەربازییەکانیان کرد ، ئەمەش بەڵگەی ئازایەتی و لێزانی " میر " و مەترسی ئەو ڕاپەڕینە بووە لەسەر دەوڵەتی عوسمانی..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( بابە ، پێم باشە لە جاری داهاتوودا باسی " میران " ی باپیرە گەورەمان بکەیت و لە ژیانی ئەویش شتێك ئاگادار ببم )

مەنسوور: ( منیش پێم خۆشە گەر تۆ ئامادەیی گوێ گرتنت هەبێت)

نزیك بە نیوەڕۆ " مەنسوور و موهتەدا " ی کوڕی دوکانەکەیان داخست و بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە...

سبەینێ عەسرەکەی " موهتەدا " ڕۆیشت بۆ خوێندنگەکەی "مەلای گەورە " و چەند وانەیەکی لە زانستە جیاجیاکاندا بە شاگردەکانی وتەوە و پاشان لەگەڵ شاگردە باڵاکاندا کەوتەوە گفتوگۆ ، سەرەتا یەکێك لە شاگردەکان پرسیارەکەی دانیشتنی پێشووی وەبیرهێنایەوە و وتی: ( مامۆستا ئەو ڕۆژە پرسیارێکم لێ کردی ، بەڵام دیار بوو کاتت بۆ وەڵام دانەوەی بەدەستەوە نەبوو ، مرۆڤ چۆن هێز و نیرووەکانی بخاتە دەرەوە و پەردە لەسەر نهێنییەکانی خۆی لا بدات ، یاخود چۆن خۆی هەڵ بکۆڵێت تاکو بگاتە کانیاوی سازگاری مانا جوانەکانی ناوەوەی خۆی ؟ چی بکات بۆ ئەوەی بکەوێتە گەردش و گەڕان و لەوێشەوە بەرەو سەرچاوەی یەکەمی خۆی — لە تەکانی بەرەو کەماڵچووندا — بگەڕێتەوە ؟)

موهتەدا: ( وشەی "پاکژیی " لە زمانی عەرەبیدا ( تزکیة ) ی بۆ بەکار براوە ، پاکژیی زانستێکی بەرز و مەزنە ، بەڵکو کرۆك و کاکڵەی سەرجەم زانستەکانە ، ئەم زانستە پەیڕەوی تایبەت بەخۆی هەیە ، سەرەتاکەی لە مرۆڤ ناسییەوە دەست پێ دەکات و کۆتاییەکەشی گەیشتنە بە دەریای ئارامی و لاواز بوونی کۆی ئەو حەز و غەریزە شەڕەنگێزانەی لە ناخی مرۆڤدا ڕیشەیان داکوتیوە ، مرۆڤناسی لە لای زانا و فەیلەسوفی دونیای ئیسلام "محەمەد حامید غەزالی" بە وردی قسەی لەسەر کراوە ، ئەو لە سەرچاوە فەلسەفییەکانی پێش خۆی کەڵکی بینیوە ، "غەزالی" پێی وایە مرۆڤ دارای سێ هێزە ئەوانیش: هێزی "زانست و تورەبوون و ئارەزوو" ن ، ئەم "سێ" وشەیە لە زمانی عەرەبیدا " سێ " زاراوەی " العلم ، الغضب ، الشهوة " ی بۆ بەکار براوە ، "غەزالی" دەڵێت: پاکژیی بریتی یە لە هێنا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مرۆڤ دەبێت ئـەو سـێ هێـزە بهێنێتـە ژێـر بـاری میانـەگیری و لـە زیـادەڕەوی و کەمڕەوی ، یاخود هەڵچوون و داچوون قوتاریان بکـات ، ئـەو دەڵێـت: گـەر ئـەو سێ هێزە تووشـی زیـادەڕەوی بـبن مـرۆڤ تووشـی کۆمـەڵێك دەردی دەروونـی و ئەخلاقی دەکەن ، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە ڕووبەڕووی کەمڕەوی ببنەوە دیسان دەبنە سەرچاوەی کۆمەڵێك دەرد و پەتای دەروونی تر...

پاکـژیی ئـەو سـێ هێـزە دەهێنێتـە ژێـر بـاری میانـەگیری و لـە هەڵـچوون و داچوون ڕزگاریان دەکات ، "غەزالی" پێی وایە کاتێك ئەو سێ هێـزە لـە مرۆڤـدا میانەگیر دەبن ئـەوا هێـزی چـوارەم — بـەهۆی ئـەو میانەگیرییـەوە — سـەرهەڵ دەدات ئـەویش هێـزی داد و میانەگیرییـە "العـدل و الاعتـدال"، غـەزالی وا بـۆی دەچێت: سەرچـاوەی هەرچـی سـیفەتی چـاك و پاکـە لـە میانـەگیری ئـەو سـێ هێزەوەیە لە مرۆڤدا ، کاتێك هێزی "زانست" میانەگیر دەبێت حـیلم و دانـایی "الحلم و الحکمة" لە مرۆڤدا سەرهەڵ دەدات ، لێرەدا نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت میانەگیر بوونی زانست مانای کـەم وەرگـرتنی زانـست نییـە ، بـەڵکو میانـەگیری ئەوەیە: ئەو سێ هێزەی مرۆڤ بهێنرێتە ژێر باڵی ژیری و بە فەرمانی ئەو ئاراستە وەربگرن و کارەکانیان ئەنجام بدەن...

کە هێزی "تووڕەبوون" دێتە باری میانەگیری و ژیر و ئاوەز ئاراستەی دەکات سـیفەتی "ئازایـەتی و جـوامێری و بەجـەرگی" لـە مرۆڤـدا سـەرهەڵ دەدات ، هەربـەوجۆرە هێـزی ئـارەزوو دەکەوێتـە بـاری میانـەگیری و دەبێتـە هـۆی پەیدابوونی پاکی ، یاخود "عفة " پاکی زمان ، پاکی داوێن ، پاکی ڕەفتار سێ نموونەی ئەو عیففەتەن....

ئەم سێ سیفەتە ( دانایی، ئازایەتی، پاکێتی) — کە لـە میـانگیربوونی هێـزی "زانست و توڕەبـوون و ئـارەزوو"ە وە سـەریان هەڵداوە ، لـە زمـانی عەرەبیـدا زاراوەی "الحکمة ، الشجاعة ، العفة" ی بۆ بـەکار بـراوە ، سـیفەتی چـوارەم کـە سـیفەتی "داد و میـانگیریی" یـە دەچێتە پاڵیـان و بـە هەرچـواریان: ( دانـایی، ئازایەتی، پـاکێتی، میـانگیریی) دەبنـە سەرچـاوەیەك بـۆ کـۆی سـیفەتە چـاك و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاکەکانی مرۆڤ ، واتە دەبن بە دایکی هەرچی سیفەت و ئاکاری چاك و پاك هەیە مزخ...

تاکو ئەم جێگە " غەزالی" قسە لە مرۆڤناسی دەکات و پرۆسەی "پاکژی" لە لای ئەو دەستی پێ نەکردووە )

شاگردێك : ( مامۆستا منیش ویستم ئەو پرسیارە بکەم: چۆن و بە چ ڕێگە و مەنهەجدێك ئەو سێ هێزەی مرۆڤ بهێنینە ژێر باڵی ژیری و میانەگیرییان تیادا دروست بکەین ؟)

موهتەدا: ( بەڵێ ، ئەو پرسیارە کرۆك و گەوهەری باسەکەی ئێمەیە، بەڵکو کاکڵە و ڕۆحی پاکژی یە ، بۆ پیادە کردنی پرۆسەی پاکژیی و پاکبوونەوە هەر ئاینێك سرووت "طقوس" ی تایبەت بەخۆی هەیە ، پوختەی کاری هەموویان تەنها یەك شتە ئەویش بریتی یە لە یاد "ذکر"، پاکژیی بریتی یە لە گواستنەوە لە بارێکی ناتەواوەوە بۆ بارێکی تەواو ، لە ئاستێکی کەم کەماڵەوە بۆ ئاستێکی بالاّ تر لە کەماڵ ئەمەش بەوە دەبێت بە بەردەوامی بکەویتە یادی خود ( ذات ) ێکی لێوان لێو بە کەماڵ ، تاکو لە سیفەتی نزمی مرۆیی دوور بکەویتەوە و لە هەمان ساتدا لە سیفەتە بەرز و بڵندەکانی ئەو خودە نزیك ببیتەوە و بە بەشێك لە سیفەتەکانی ئەو برازێیتەوە ، کاتێك مرۆڤ لەو خودە پڕ لە کەماڵە نزیك دەبێتەوە وردە وردە باری ناتەواو و کەم کەماڵی خۆی بەجێ دەهێڵێت و ئەو سێ هێزە بنچینەیی و سەرەکییەی لە ناخیدایە "زانست ، تووڕەبوون ، ئارەزوو" دەکەونە باری میانەگیرییەوە و بە پێی جووڵەی بەرە و کەماڵچوونی تایبەت بە خۆی سیفەتە پەسەند و ڕەسەنەکان لە ناخیدا سەرهەڵ دەدەن و بنج دادەکوتن....)

شاگردێك : ( مامۆستا چۆن یادی ئەو خودە تەواو و پڕ لە کەماڵە بکەین ؟)

موهتەدا: ( ئەمەش دیسان ڕێگەی جۆراو جۆری بۆ گیراوەتە بەر ، لە چۆنێتی جێ بەجێ کردنی "یاد" دا دەیان تۆ بڵێ سەدان مەشرەب و مەزهەبی جۆراوجۆر لە ناو ئایینەکاندا سەریان هەڵداوە ، هەندێك پێیان وایە " یاد " بە "

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

زمان " دەكرێت ، هەندێكی تر دەڵێن: یاد بە دڵە، كۆمەڵێكی تر دەڵێن: بە دڵ و زمانە ، تەریقەتێك پێی وایە دەبێت بە دەنگی بەرز بێت ، تەریقەتێكی تر دەڵێت نەخێر بەخامۆشی دەبێت یادی ئەو خودە بكرێت ، دەستەیەك پێیان وایە یاد تەنها بیركردنەوە و تێڕامان ( تأمل ) ە ، خەڵكانێكی تر دەڵێن: دەبێت بەوجۆرە "یاد" بكرێت كە پەیامە ئاسمانییەكان بەیانیان كردووە...)

شاگردێك: ( تۆ لەم ناوەندەدا چی بەخۆت و ئێمە دەڵێیت؟)

موهتەدا: ( بۆ ئەو كاتەی دەمەوێت بكەومە ناو "یاد"ە وە باری تەنهایی و خامۆشی و بیركردنەوەی قووڵم پێ باشە )

هەمان شاگرد: ( مانەوەت لە ناو منارەكەدا بۆ ئەو مەبەستەیە ؟)

موهتەدا: ( با ئەوەندە بەس بێت...)

دوای وتنی ئەو قسەیە خواحافیزی لە شاگردەكان كرد و بە عادەتی جارانی خۆی بە ناو منارەكەدا بەرە و لوتكەكەی سەركەوتەوە و تا نزیكی بانگی شێوان نەهاتە خوارەوە...

ئێوارەیەك "مەنسوور و موهتەدا" ی كوڕی لە باخچەی ماڵەكەیاندا چایان دەخواردەوە ، "موهتەدا"پێی باش بوو لەو كاتەی لە خزمەتی بابیدا دانیشتتوە سوودێك وەربگرێت ، بۆیە پرسیارێكی ئاراستەی بابی كرد و وتی: ( بابە پێشتر باسی باپیری مەزن "مەروان" ت بۆ كردم و ئێستا پێم باشە باسێكم لەسەر " میران " ی كوڕی " مەروان " بۆ بكەیت)

دوای ماوەیەك بێدەنگی "مەنسوور" سەیرێكی پڕ مانای "موهتەدا"ی كرد و وتی: ( "میران " كوڕە بچووكی " مەروان "ە و لە منداڵی یەوە بە زیرەكی و لێهاتوویی ناوبانگی دەركرد بوو ، بەشێك لە زانستە ئایینییەكانی لە حوجرەدا خوێندووە ، ئەو كاتێك بابی كۆچی دوایی كرد تەمەنی " دە " ساڵان بوو ، مەرگی بابی كاریگەری قووڵ لەسەر ئەو مێرد منداڵە بەجێ دەهێڵێت ، شەوانە دایكی چیرۆك و سەربوردەكانی بابی بۆ دەگێڕێتەوە و بە گیانی ئازایەتی و جوامێری گۆشی دەكات ، دایكی هەتا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

و شــەهید بـوونی "مـیری سۆران" ی لـە یـاد ناچێت و بـە بـەردەوامی لەگـەڵ یادگارییەکانی هاوسـەرەکەیدا دەژی ، "مـیران" دەبێـت بـە پیـاوێکی جـوامێر و خانەدانی شارەکەی و لە لای هەموان جێگەی ڕێز و حورمـەت دەبێـت ، ئـەو بـە بەردەوامی خۆزگەی بۆ بەرپابوونی شۆڕشێك دەخواست تیایـدا بەشـداری بکـا و وەسێتەکەی بابی بـەجێ بهێنێـت ، تەمـەنی چـل و پێـنج سـالآن دەبێـت کاتێـك ڕاپەڕینەکەی "شێخ عوبەیدوڵلآی نەهری" سەری هەڵدا ، شێخ عوبەیدوڵلآ کوڕی " شێخ تەهای نەهری " یە ، شێخ تەها یەکێك بووە لە خەلیفـە زۆر گـەورەکانی "مەولانا خالیدی نەقشبەندی "، شێخ عوبەیدوڵلآ لـە دوای مردنـی شـێخ تـەهای بابی کاروباری ئیرشاد و پێشەوایەتی کردن دەگرێتـە ئەسـتۆ و ڕابـەرێکی ڕۆحـی مەزنی لێ دەردەچێت...

پارچــە پارچــەبوونی گــەلی کــورد و ســتەم و زۆری عوسمانییــەکان و قاجەرییەکان خەون و خواردن لە شێخ عوبەیدوڵلآ حەرام دەکات ، بۆ ئەو دۆخە هەموارە بـە بـەردەوامی بـیر لـە چارەسـەرێك دەکاتـەوە ، "شـێخ " بـە ڕێگـەی ئاشتییانە و ناردنی یاداشتنامە بۆ خەلیفەی عوسمانی – کە تیایدا زوڵـم و زۆری بەرپرسە عوسمانییەکانی باس کرد بوو – ویستی کێشەی گەلی کورد چارەسـەر بکـات ، بـەلاّم یاداشـتنامەکەی " شـێخ " پـشتگوێ خـرا و هـیچ وەلاّمێکـی نەدرایەوە...

ئەو دڵنیا بوو لەوەی دەوڵەتی عوسمانی لەسەرە مەرگدایە و بەرەو تیاچوون دەڕوات ، بۆیـە دەیویـست لـەو لاوازی و پیرییـەی دەوڵـەتی عوسمـانی سـوود وەربگرێت و یەکێتییەك بخاتە ناو ڕیزەکانی گـەلی کـوردەوە و بـبن بـە خـاوەنی دەسەلاّتی خۆیان و لە زوڵم و زۆری عوسمانی و قاجەری ڕزگاریان ببێت...)

موهتـەدا: ( بابـە وتـت: شـێخ عوبەیـدوڵلآ دەیزانـی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە سـەرەمەرگدایە ، بـە چیدا دەیزانـی ئـەو دەوڵەتـە بـەرەو مـەرگ هـەنگا و هـەڵ دەگرێت؟)

مەنسوور: ( "شێخ" ئاگادار بوو لەوەی ناوەوەی دەوڵەتی عوسمـانی کرمـۆڵ بووە ، دەسەلاّتدارانی عوسمـانی و ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دابەش بوو بوون: دەستەیەك دەیانویست لەسەر ڕەوگەی کۆنی خەلافەتی عوسمانی دەوڵەت بەڕێوە ببەن ، دەستەیەکی تر کاریگەری " ئەورووپا " یان لەسەر بوو ، ئەم دەستەی دووەمە دەیانویست دەوڵەتی هاوچەرخ و نەتەوەیی بەرقەرار بکەن ، دەستەی دووەم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە کۆشکی " سوڵتان " دا بەهێز دەبوون و "یەهود و ئەورووپاییەکان " یش پشتیوانیان لێ دەکردن...)

موهتەدا: ( ئەو هۆیەی بەڕێزت باسی لێوە دەکەیت لە کوێوە دەبێتە نیشانەی ڕمانی دەوڵەتی عوسمانی ؟)

مەنسوور: ( سەرکەوتنی بیروڕای هەریەکێك لەو دوو دەستەیە مانای ڕمانی دەوڵەتی عوسمانی بوو)

موهتەدا: ( چۆن ؟)

مەنسوور: ( بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر شێواز و ڕەوگە کۆنەکەی مانای دواکەوتن و زاڵ بوونی دەوڵەتانی تر - بە تایبەت ڕووسیا و ئینگلیز - ی دەگەیاند بەسەر دەوڵەتی عوسمانی دا ، سەرکەوتنی دەستەی دووەمیش ، واتە دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخ مانای ڕاپەڕین و شۆڕشی گەلانی ژێر دەسەلاتی عوسمانییەکانی دەگەیاند ، چونکە نەتەوەکانی تر ملکەچی دەوڵەتی خەلافەت بوون ، نەك دەوڵەتی نەتەوەیی تورکە تورانییەکان ، دەستەی دووەم بە بەرنامە کارەکانیان ئەنجام دەدا ، سەرەتا هەوڵی مەرکەزییەتی دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانییان دا و نیزامی ویلایەتیان هەڵوەشاندەوە و لە ڕێگەی والی و حاکمە عوسمانییە ستەمکارەکانەوە کەوتنە ڕووخاندنی ئەمارەتەکان و خۆ سەپاندن بەسەر گەل و نەتەوەکانی تردا ، لەو سیاسەتەشدا ئەمارەتە کوردییەکانی بادینان و سۆران و بابان بوونە قۆچی قوربانی دەستی تورکە تورانییەکان...

لە پاڵ گەیشتن لەم ڕاستی یە "شێخ عوبەیدوڵڵا " بۆخۆی بەشداری جەنگی ڕووسەکانی کرد بوو ، لەو جەنگەدا بۆی دەرکەوت سوپای دەوڵەتی عوسمانی چەندە بێ چەك و کەم وەرەن و چەندە لە دەوڵەتانی تر - لە ڕووی هێز و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نەخشەی سەربازی یەوە — دواکەوتوون ، ئەمە و ئاگاهی تەواو بەو گۆڕانکاری یە گەورەی بەسەر خۆرئاوادا هات بوو لە ڕێگەی ئەو نوێنەر و قونسوڵ و موژدەدەرانەی " نەسارا " وە ڕوویان لە ناوچەکە کرد بوو ، " شێخ " دەیزانی دەوڵەتی عوسمانی بەرگەی ئەو ڕەشەبایە ناگرێت کە لە خۆرئاواوە هەڵی کرد بوو ، هاوڕێ لەگەڵ ئەو چەند هۆیەدا من پێم وایە " شێخ " لە سەرچاوەی سازگاری عیرفانەوە بە هەندێك ڕاستی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی گەیشتبێت ، چونکە زۆرن ئەوانەی بە خزمەتی " شێخ " گەیشتوون و شاهیدی مەزنیی پلە وپایەی عیرفانی " شێخ " یان داوە)

موهتەدا: ( ڕۆڵی " میران " ی باپیرمان لەو شۆڕشەدا چی بووە ؟)

مەنسوور: ( "شێخ عوبەیدوڵلا " بەر لە داگیرسانی شۆڕشەکەی بە هاوکاری بنەماڵەی "بەدرخانییەکان" موئتەمەرێکی گەورەیان لە "نەهری " بەست ، پێشتر "شێخ" نامەی بۆ کۆمەڵێك سەرکردە و سەرۆك هۆز و کەسایەتی گەورە نارد بوو ، نزیکەی دوو سەد کەسایەتی لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە بەشدارییان تیادا کرد ، یەکێك لەو کەسانەی چوو بۆ ئەو موئتەمەرە "میران" ی باپیرە گەورەمان بوو ، ئەو لە ڕێگەی یەکێك لە سەرۆك هۆزەکانەوە — بۆ بەشداریکردن — ئاگادار کرابوویەوە ، موئتەمەرەکە کۆمەڵەی "پەیوەندی سەرکردەکانی کورد " ی تیا لە دایك بوو ، ئەم کۆمەڵەیە بوو بە ناوك بۆ شۆڕشەکەی " شێخ عوبەیدوڵلا "، شێخ و سەرکردەکانی کورد بڕیاریان دا یەکەم جار لە شاری " میاندواو و ئورمێ " وە هێرش بکەنە سەر " ئێران " و هەموو ناوچە کوردییەکان ڕزگار بکەن ، بۆ ئەو مەبەستە سوپاکەیان بۆ سێ هێز دابەش کرد ، هێزی یەکەم شێخ "عەبدولقادر" ی کوڕی "شێخ عوبەیدوڵلا " سەرۆکایەتی دەکرد و نزیکەی "بیست هەزار " سەرباز بوو ، "میران" ی باپیرمان لە هێزەکەی شێخ "عەبدولقادر" دا بوو ، ئەو سەرکردەی سریەیەکی هێزە " بیست هەزار " کەسی یەکە بوو ، ئەو هێزە شاری " میاندواو " یان ڕزگار کرد و بەرەو " ورمێ یاخود ئورمێ " بە ڕێ کەوتن ، " شێخ عوبەیدوڵلا " بۆخۆشی پەیوەندی بەو هێزەوە هەبوو ، چونکە گەورەترین هێزی ڕاپەڕینەکە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بوو ، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی شاری " ئورمێ " دا کەوتە گفتوگۆ تاکو بە بێ جەنگ و ڕژانی خوێن شارەکەیان تەسلیم بکەن ، بەلاَم " ئیقبال و لدەولە" حاکمی " ئورمێ " لە ڕێگەی قونسولی ئینگلیزەوە "ویلیام ئابوت" و پزیشکێك بەناوی "کۆجران" کەوتە فێڵ کردن و داوایان لە شێخ "عوبەیدوڵلاَ " کرد بیست و چوار کاتژمێری تر مۆڵەتیان پێ بدا ، "شێخ " یش لە پێناوی ئاشتی و نەڕژانی خوێندا لەسەر داواکەیان ڕازی بوو ، بەلاَم لەو بیست و چوار کاتژمێرەدا هێزی ئێرانی کە "بیست هەزار " سەرباز بوو بە سەرکردایەتی "حیشمەت و لدەولە" گەیشتە بەرەوە و گەمارۆی سەر " ئورمێ " ی هەڵگرت و سوپاکەی " شێخ " پاشەکشێی کرد و گەڕایەوە بۆ " هەکاری "، دواتر دەوڵەتی عوسمانی لە ژێر فشاری " ڕوسیا و ئێران و ئینگلیز " دا شێخیان لە زێدی خۆی دوور خستەوە ، سەرەتا ڕەوانەی "ئەستەمبوڵ " کرا ، بەلاَم " شێخ " لە دەستبەسەری هەڵهات و گەڕایەوە بۆ " نەهری "، دواتر دەسەلاَتدارانی " تورك " گرتیانەوە و ڕەوانەی " موسڵ " یان کرد و لەوێشەوە بۆ " حیجاز " نەفی کرا و بە غەریبی لەو وڵاتە سەری نایەوە...)

دیار بوو " موهتەدا " تامەزرۆ بوو بۆ ئەوەی بزانێت باپیرە گەورەی ئەو لەو شۆڕشەدا چ ڕۆڵ و کاریگەرییەکی هەبووە ، بۆیە بە پەرۆشەوە بە بابی وت: (" میران " ی باپیرمان چی بەسەر هات ؟)

" مەنسوور " یش لە هێنانەوە بەریادی مێژووی شۆڕشەکەی " شێخ عوبەیدوڵلاَ "چێژی وەردەگرت و نەیدەویست بە چەند ڕستەیەك چارەنووسی " میران " ی باپیرە گەورەی بۆ کوڕە تاقانەکەی دیاری بکات ، بۆیە ئاماژەیەکی کورتی بە " میران " دەدا و دواتر دەچووەوە سەر باس کردنی " شێخ " و شۆڕشەکەی: ( "میران" بۆ ڕزگار کردنی "شێخ عوبەیدوڵلاَ " لە دەستی سەربازە عوسمانییەکان – لە کاتێکدا شێخ بۆ موسڵ دەگوێزرایەوە – لەگەڵ دەستەیەك لە شوێنکەوتووانی " شێخ " هێرشیان کردە سەر کاروانەکە و سەربازەکانیان بە دیل گرت و " شێخ " یان قوتار کرد و بردیان بۆ قەلاَی " شەبتان"، دواتر هێزی عوسمانییەکان لە دەوری قەلاَکە کۆبوونەوە و قەلاَکەیان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

تۆپ باران کرد و نزیکەی " دوو سەد " کەس لە خەڵکی قەلاّ و پیاوانی " شێخ " شەهید بوون و جارێکی تر " شێخ " یان بە دیل گرتەوە ، یەکێك لەو کەسانەی لە قەلاّکەدا شەهید کرا "میران " ی باپیرە گەورەمان بوو ، ئەو پێشتر وەسێتنامەیەکی نوسراو ئامادە دەکات و دەیداتە دەستی یەکێك لە هاوەڵەکانی و داوای لێ دەکات ئەگەر شەهید بوو تەسلیمی دەستی خێزان و بنەماڵەکەی بکات...)

موهتەدا: ( ناوەڕۆکی ئەو وەسێتنامەیە چی بووە ؟)

مەنسوور: ( خۆشبەختانە ئەو وەسێتنامەیە و چەندین وەسێتنامەی تر لەلام هەڵ گیراوە و ڕۆژێك دەتبەم بۆ لای سندوقەکە و چاوت پێیان دەکەوێت )

موهتەدا: ( بابە بە ڕای تۆ هۆی شکستی شۆڕشەکەی "شێخ عوبەیدوڵلاّ " چی بووە ؟)

مەنسوور: ( کوڕم ، وەلاّمی ئەو پرسیارە لە لایەن منەوە – ئەگەر وەلاّمەکەشم ڕاست بێت – بە بێ ئەدەبی دەزانم )

موهتەدا: ( بۆ بابە ؟)

مەنسوور: ( "شێخ " و ئەوانەی لەگەڵی بوون نموونەی پیاوەتی و جوامێری بوون ، منێك کە هیچم لە دەست نایەت بێ ئەدەبی یە لە باخچەی ماڵەکەم دا بە دەم چا خواردنەوەوە ڕەخنە لە " شێخ " و سەربازەکانی بگرم...)

موهتەدا: ( بابە ئەوەندەی من ئاگادار بم بە قەدەر چەندین مرۆڤی خەباتگێڕ خزمەتت بە شۆڕش پێشکەش کردووە ! )

مەنسوور: ( کوڕم بەخشینی ماڵ و سامان هەرگیز لەگەڵ بەخشینی گیاندا بەراورد ناکرێت ، من ماڵ و سامانم بە شۆڕشی کورد بەخشیوە ، بەلاّم خەڵکی ڕۆحیان فیدا کردووە)

موهتەدا : ( بەلاّم جارێك لە خۆتم بیست کە "سەرکردەی گەورە " بە تۆی وتووە: لە شاردا بمێنەرەوە و پێویستمان بە تۆیە..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( بەڵێ وایە ، بەڵام هەرگیز لە خۆم نابورێم ، من نەوەی "مەروان و میران و محەمەد و عوبەیدوڵلا" م دەبوا منیش بە ڕەوگەی ئەواندا بچوومایە و ڕازی نەبووْمایە لە ناو شاردا و لەگەڵ ژن و منداڵ دا بمێنمەوە و ژیان بەسەر ببەم )

موهتەدا: ( بەڵام من وەڵامی پرسیاری خۆمم دەوێت )

مەنسوور: ( ئەگەر ناچارم بکەی ئەوە قسەیەکی ترە ! )

موهتەدا: ( بمبورە بابە ، بەڵام زۆر حەز دەکەم وەڵامم بدەیتەوە )

مەنسوور: ( گەر وابێت زۆر بە کورتی ئاماژەیەك بەو هۆکارانە دەکەم بوونە مایەی شکستی شۆڕشەکە ، شارەزایان بە شۆڕشەکەی " شێخ " شکستەکەی بۆ چەند هۆیەك دەگێڕنەوە لەوانە: نەبوونی یەك ڕیزی لە نێوان کورداندا ، نەبوونی سوپایەکی نیزامی مەشقدراو ، باش هەڵ نەسەنگاندنی هێزی سەربازی دوژمن و خەڵەتان بە پیلانەکانی ، نەبوونی پشتیوانییەکی نێودەوڵەتی بۆ شۆڕشەکە... )

بە وتنی ئەو قسەیە خامۆشییەك ڕووی لە هەردووکیان کرد ، چاوەکانی "مەنسوور" پڕ لە فرمێسك بوون ، داوای یارمەتی لە موهتەدا کرد و وتی: (هەست بە سەرما دەکەم ، مۆڵەتم بدە بچمەوە بۆ ژوورەکەی خۆم )

" موهتەدا " لەبەر بابی هەستا و پاشان دانیشتەوە ، دەستی بۆ یەکێك لەو دوو کتێبە برد کە بۆ خوێندنەوە لە کتێبخانەکەی دەری هێنا بوون...

** ** ** ** ** **

"مەنسوور" هەستی کرد بوو کاتی ئەوە هاتووە " موهتەدا " ژیانی خێزانی پێکەوە بنێت ، بۆیە کەوتە بیرکردنەوە لە ئافرەتێك شیاوی کوڕە تاقانەکەی بێت ، ئەو بە بەردەوامی بیری لەو گەوا[illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

یەکێك لە موریدە ئافرەتەکانی خۆی دابووی ، ئەو کەسە " نازداری مەلەکووتی " بوو کە لە یەکێك لە شارۆچکەکان دا دەژیا ، "نازدار" هەتا مردنی "پیری مەزن" بە دڵسۆزی و گوێڕایەڵی مایەوە ، هەموو جارێك "پیری مەزن" ناوی "نازداری مەلەکووتی" دەهێنا و دەیوت : ئەو کەسێکە لە خوداوە زۆر نزیکە و هیچ داوایەکی لای ئەو ناگەڕێتەوە...

"نازداری مەلەکووتی" هاوسەری پیاوێك بوو بە ناوی " عەبدوڵلا مەنگوری "، سەر و سەکوتی لەگەڵ ئەو شێوازە دینداری یەدا نەبوو کە " نازدار" ی هاوسەری پێیەوە سەرقاڵ بوو ، بەڵام پیاوێکی سینەساف دەست و دڵ گوشاد بوو ، هەموو جارێ لە " نازدار" ی دەکردە شۆخی و دەیوت : ( ئەگەر دینداری بەم شێوازەی تۆ بێت ئەوا لە ڕۆژی لێ پرسینەوە دا من تیاچووم ، خۆ ئەگەر بەم شێوازەی من بێت ئەوا تۆ تەنها ماندو بوونت بۆ ماوەتەوە...)

" نازدار" ی هاوسەری ئافرەتێکی مەزن و میهرەبان بوو، بۆیە لە وەڵامیدا دەیوت: ( ئومێد دەکەم خودا لە هەردووکمان قبوڵی بفەرموێ و لە بەهەشتی بەریندا بە دیدارت شاد ببمەوە...)

عەبدوڵلای هاوسەری دیسان دەی کردە شۆخی و دەیوت: ( بۆ دەتەوێت لەوێش لە کۆڵم نەبیتەوە ؟)

"نازدار" میهرەبانانە دەهاتە گۆ و دەیوت : ( جا دڵت دێت بە بێ من بژیت و ڕوو لە کەسێکی تر بکەیت ؟)

عەبدوڵلا " میهر و خۆشەویستی "نازدار" بە سەریدا زاڵ دەبوو و دەیوت : ( بەخودا " نازدار " بەهەشت بە تۆوە خۆشە...)

" نازداری مەلەکووتی" کچێکی بە ناوی " مەریەم" هەبوو ، خەڵکی بە شیرینی ناولێنانەکەی "نازدار"ە وە نازناوی "مەلەکووتی"شیان بە "مەریەم" دابوو ، "پیری مەزن" نازناوی "مەلەکووتی" بە "نازدار" بەخشی بوو ، ئەو ئافرەتێك بوو دەتوت لە مەلەکووتەوە بۆسەر ئەم زەوی یە دابەزیوە ، هەرچی گەرد و تەپوتۆزی ئەم دونیایە لە دەرەوە و ناخی ئەو نەنیشت بوو ، ڕەفتار و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەڵسوكەوتی چەشنی پەری ئاسمان بوو ، هەمیشە دڵی بە مەلەكووتەوە وابەستە بوو ، دەیویست بە ڕۆحێكی ئاسمانییەوە لەسەر زەوی ژیان بەسەر بەرێت ، "مەریەم" لە ژێر چاودێری و پەروەردەی دایكی دا گەورە بوو بوو، ئەو لە ڕەفتار و كرداریدا هەنگاو بە هەنگاو جێ پێكانی دایكی خۆی هەڵگرت بوو ، "عەبدوڵڵا" ی بابی — بەشۆخییەوە — بە "نازدار" ی هاوسەری دەوت : ( كچەكەشت وەكو خۆت لێ كردووە ، كچێ ئافرەت با پیاوێك بۆ خۆی بەدەست بهێنێ و بەسەرمانەوە نەمێنێتەوە) ، پاشان ڕووی لە "مەریەم" دەكرد و دەیوت : ( ڕۆڵە بە گوێی باوكت بكە و كوڕێكی جوامێر و جوانخاس بۆخۆت بەدەست بهێنە)

" مەریەم " یش ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا و بەدەم بۆڵە كردنەوە باوك و دایكی بەجێ دەهێڵا..

" نازدار " دەهاتە وەڵام و دەیوت : ( خودا پیاوی باش و چاكی بە نسیب دەكات )

عەبدوڵڵا: ( چۆن بە نسیبی دەكات؟ تۆ ئەوەندە لە ژوورەوەت ناوە هەندێك لە دۆستە نزیكەكانیش نازانن كچمان هەیە)

نازدار: ( خودا چۆن تۆی بۆ من نارد ، ئاواش كەسێك بۆ " مەریەم" دەنێرێت)

عەبدوڵڵا: ( تۆ دە جار جوابت لێ ناردم و خەڵكت لێ ڕاسپاردم ئەوجا بووم بە نسیبت)

نازدار: ( كەی وابوو! یەكەم جار بۆخۆت براژنت راسپارد بوو )

عەبدوڵڵا: ( وابوو، بەڵام دوای ئەوە ئیتر تۆ كۆڵت لێ نەدام )

نازدار — بە پێكەنینەوە —: ( دەمزانی خەریكی بۆم شێت دەبیت وتم با هەندێك بەزەییم پیایدا بێتەوە)

عەبدوڵڵا: ( باشە ماڵت ئاوا بێت بەس نەبوو نەتهێڵا شێت ببم )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نازدار: (من دەمزانی بۆ یەکتر دەبین ، بۆیە ئەوەندە لێت هاتمە پێشەوە)

عەبدوڵلاّ: (بە چیدا دەتزانی بۆ یەکتر دەبین؟!)

نازدار: ( چەند جار لە خەوندا تۆیان نیشان دابووم )

عەبدوڵلاّ: ( ئەوەندە شێتم بوو بووی خەونیشت پێوە دەبینیم! )

هەردوو دەستیان بە پێکەنین کرد و بە هێنانی سینییەك چا لە لایەن " مەریەم " ی کچیانەوە باسەکەیان کۆتایی پێ هێنا....

" سمکۆ " تاقە کوڕی " نازدار و عەبدوڵلاّ " بوو ، لە منداڵییەوە نازی زۆری پێ درا بوو ، تەمەنی " بیست " ساڵێك دەبوو ، لە خوێندندا منداڵێکی سەرکەوتوو نەبوو ، بۆیە لە پۆلی سێی ناوەندییەوە قوتابخانەی بەجێهێلاّ ، بەلاّم کەسێك بوو بە بەردەوامی نوقمی خوێندنەوەی کتێبە فیکری و فەلسەفییەکان بوو ، دەستەیەك برادەری پێکەوە نابوو هەروەکو خۆی سەرگەرمی خوێندنەوەی قووڵ و سەرومڕ بوون ، "سمکۆ" بەرانبەر بە دایکی و مەریەمی خوشکی نموونەی زوڵم و زۆر بوو ، لەسەر یەك پێ سەد جنێوی بەرانبەریان لە دەم دەردەچوو بە بێ ئەوەی بوێرن وەلاّمی بدەنەوە ، باوکی لێی دەهاتە وەلاّم و لۆمە و سەرزەنشتی دەکرد و هەندێك جاریش دەگەیشتە گیانی و پەلاماری دەدا ، بەلاّم ئامۆژگاری ئەو گەنجە سەر کەشە تکا و ڕجا بوو لە شەپۆلەکانی دەریا تاکو نەکێشن بە ڕۆخ و کەنارەکاندا ، "نازدار" ی دایکی بە بەردەوامی لە دوعا و نوێژەکانیدا بۆ " سمکۆ " دەپاڕایەوە و داوای لە خوای خۆی دەکرد لەو سەرکەشی و کەللە ڕەقی یە بیگێڕێتەوە....

"سمکۆ" هەر کارێکی دایکی و مەریەمی بە دڵ نەبوایە جنێوی بەو کەسە دەدا ئەوانی فێری ئایین و خوداناسی کردووە ، بەڵکو بەوەشەوە نەدەوەستا دەکەوتە قسە وتن بەو زاتە پیرۆزەی ئەوان نوێژی بۆ دەکەن و دەی پەرستن....

خانەوادەی "سمکۆ" نەیان دەزانی ئەو گەنجە لە دەریایەك دڵەڕاوکێ و نا ئارامی دا نوقم بووە و نائارامییەکانیشی بە دەوروبەری خۆیدا دەکێشێت ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"نازدار" ی دایکی بە توونـدی هـەردوو گوێیـەکانی خـۆی دەئـاخنی و دەچـووە ژوورەکەی پشتەوە و دەرگای لەسەر خـۆی دادەخـست تـاکو گـوێی لـەو هـەموو جنێـو و سـووکایەتی یـە نـەبێت "سمکـۆ" ی کـوڕی بـە پیرۆزییـەکانی ئـەوی دەکات...

"نازداری مەلەکووتی" شەوان بۆ یادی خودا هەڵ دەستا و چـەندین کاتـژمێر بە ئاگا دەبوو ، ئەو ژوورێکی تایبەتی لە ماڵەکەدا بۆ نوێژ و یاد دیاری کرد بوو ، هەنـدێك لـە شـەوان "مەریـەم " یـشی بـە ئاگـا دەهێنـا و پێکـەوە دوو بـە دوو دەستیان بە یادی خودای خۆیان دەکرد....

ژیانی "نازداری مەلەکووتی" بە مانای ڕۆحـی بـەرز و بڵنـد لێـوان لێـو بـوو ، تـۆوی ئـەو مانایانـەش بـە زەمینـەی نـاخی کـچە شـیرینەکەیدا چـێنرا بـوو ، "مەریەم" شەوانە دەتوت بۆ ژووانی عاشقێکی مەزن لە خەو ڕادەپەڕێت ، لەگەڵ یەکـەمین بـانگی دایکیـدا هەڵدەسـتا و دەستنوێژی دەگـرت و دەکەوتـە دونیـا تایبەتەکەی خۆیەوە و هەتا ئاسـۆکان ڕۆشـن دەبوونـەوە ئـەوان خـەریکی نۆش کردنی شەپۆلەکانی مانا بوون...

نازداری مەلەکووتی و مەریەمی کچی عاشقی شەوە تاریکـەکان بـوون، ئـەوان لە ناو تاریکیدا هەستیان بـە بـوونی خۆیـان دەکـرد ، تـاریکی لای ئـەوان مانـای زۆری دەگەیانـد، تـاریکی واتـە: خـۆ داڕنـین لـەو کالآیانـەی لـە ڕۆژدا کۆمەڵگـە دەیکات بە بەرماندا و هەتا کاتی نووستن ناتوانین ئەو تەوقە لە گەردنی خۆمـان بکەینەوە ، تاریکی واتە: لە پەنهانەوە گەیشتن بەو مەعشووقەی چـەندین سـاڵە عاریفەکان ئاواتیانە شەوێك حیجابی نووری خۆی بشکێنێت و سـەردانێکی ژوورە تاریکەکـەیان بکـات ، تـاریکی واتـە: ڕزگـاربوون لـە داواکـانی "سمکـۆ " کـە لـە بەیانییەوە تا کاتی نووستن بە سەریاندا فەرمانی دەردەکـرد ، لـە نـاو تاریکیـدا سکالآکانی خۆیان بۆ لای خودا بەرز دەکـردەوە و ڕازەکـانی دڵیـان لای ئـەو والآ دەکرد.....

" مەنسووری عەتتار " هەمیشە پایەی خوداناسی " نازداری مەلەکووتی " لە یاد بوو ، ئەو دەیزانی " نـازدار " خـاوەنی کـچێکی خوداناسـی وەك خۆیـەتی ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بۆیە کەوتە بیر کردنەوە لەوەی سەردانێکی ماڵیان بکات و لە نزیکەوە کچەکەی " نازدار " هەڵبسەنگێنێت ، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاری دا " مەعسومە " ی هاوسەری و " موهتەدا " ی کوڕی لەگەڵ خۆی ببات...

"مەنسووری عەتتار" بە باشی زانی لەمەڕ داواکردنی ژن بۆ کوڕەکەی گفتوگۆ لەگەڵ "موهتەدا " بکات ، شەوێك دوو بە دوو باسەکەی لەگەڵ کردەوە و پرسیاری لێ کرد : ( کوڕم ، تۆ بۆ هاوسەری ژیانت کەسێکت لە بەرچاو گرتووە ؟)

موهتەدا: ( تاکو ئێستا نەخێر )

مەنسوور: ( دەتەوێت ڕازی دڵی خۆمت پێ بڵێم ؟)

موهتەدا: ( بەڵێ بابە گیان )

مەنسوور: ( من کچی ژن و پیاوێکی فرە باشم لە بەرچاوان گرتووە ، ئەگەر پێت باش بێت سەردانێکیان دەکەین و هیچ لەو بارەوە باس ناکەین تاکو ئافرەتەکەت بەرچاو بکەوێت و بڕیاری خۆتی لەسەر بدەی ، ئەوجا یان لێی بێدەنگ دەبین ، یان گەر بە دڵت بوو دەچینە داخوازی ، بۆ ئەم پێشنیارەش دوو ڕۆژ مۆڵەتت پێ دەدەم ، دەتوانی بیری لێ بکەیتەوە و دوا بڕیاری خۆتم پێڕا بگەیەنیت )

موهتەدا: ( هیچت لەگەڵ دایکم لەسەر ئەم بابەتە باس کردووە ؟)

مەنسوور: ( بەڵێ ، بەلاَم کچێکی تری پێشنیار کردووە کە من بابیم بە دڵ نییە)

موهتەدا: ( پێم خۆشە لەسەر هاوسەرگیری من هەردووکتان هاوڕا بن)

مەنسوور: ( دواتر کە باسی ئەم ئافرەتەم بۆ کرد ڕازی بوو ، بۆ خۆشت زیاتر قسەی لەگەڵ بکە)

بۆ سبەینێ "موهتەدا" لەگەڵ "مەعسومە" ی دایکی لەسەر ئەو بابەتە کەوتنە گفتوگۆ ، دیار بوو دایکی [illegible] "مەنسوور" ی هاوسەری لا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پەسەند بوو ، بۆیە داوای لە "موهتەدا " کرد دوای دڵنیا بوون لە بڕیاری خۆی قسەی بابی لەسەر هاوسەرگرتن بە گرنگ بزانێت، چونکە " مەنسوور " ی بابی لە خۆیەوە بڕیار دەرناکات ...

چەند رۆژێك "موهتەدا" کەوتە بیرکردنەوەی قووڵ لەو قۆناغەی ژیان و داوای لە خودا دەکرد لەسەر ئەو ئافرەتە دەرگایەکی بەڕوودا بکاتەوە و بزانێت داهاتووی ئەو و هاوسەرەکەی چۆن دەگوزەرێت...

لە یەکێك لەو شەوانەدا بە نموونەیەك لە خەونیدا لە ژیانی خێزانی تێیان گەیاند ، "موهتەدا" بینی خۆی و هاوسەرەکەی لە دەشتێکی پڕ لە سەوزی دان ، لە ناو مێرگ و گوڵزاردا هاتووچۆیان دەکرد و ئاسوودەییان هەڵدەمژی ، لە ناکاو لە چیایەکی مەزنەوە تیشکێك بەرە و ئەوان هات و بە نێوانیاندا تێ پەڕی و هەریەکەیانی بە لایەکدا دوور خستەوە و یەکترییان لێ بزر بوو ، کاتێك گەیشتنەوە بە یەکتر وەرزی بەهار تێپەڕی بوو ، گژ و گیا وشك بوو بوو ، ئەوانیش هەردوو سەریان سپی بوو ، لە پەنای چیایەکدا پشتیان بە گابەردێکەوە ناو بێدەنگ لێی دانیشتن...

لە پڕ بە ئاگا هات و بینی ئارەقەیەکی زۆری کردووە و لەسەر جێگەکەی دوور کەوتۆتەوە....

"موهتەدا" دەیزانی ئەو کچەی کە بابی بۆی دیاری کردووە هاوسەری تەمەنیەتی و ژیانیشیان بێ لەمپەر و نسکۆ نییە ، بۆیە وەڵامەکەی بە دایکیدا بۆ بابی گێڕایەوە و ئارەزووی خۆی بۆ سەردانی ئەو ماڵە نیشان دا...

چەند رۆژێك دوای ئەوە " موهتەدا " داوای لە بابی کرد وەسیێتنامەکانی نیشان بدات ، ئەویش داوای لە "موهتەدا" کرد لە دیوەخانەکە چاوەڕوانی بکات تا دەچێت وەسیێتنامەکان لە ژووره تایبەتەکەی خۆیدا دەهێنێت ، "موهتەدا" تامەزرۆ بوو رۆژێك بابی پەلی بگرێ و نهێنییەکانی ناو ئەو ژوور و سندوقەی نیشان بدات ، بۆیە بە بابی وت : ( بابە ، ئەگەر دەکرێت با منیش سەرێك لەو ژوورە تایبەتەی تۆ بدەم...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( ئەوە ژووری من نییە ، بەڵکو خەزێنەی بنەماڵەکەمانە ، لەو ژوورەدا هەرچی لە "مەروان"ە وە تا بابی خۆم بۆمان بەجێماوە تیایدا پارێزراوە ، ژیان و بەختەوەری من بە مانەوە و تیانەچوونی شتەکانی ناو ژوورەکەوەیە ، باپیرانم سەرباری نائارامی و شەڕ و شۆڕ پارێزگارییان لێ کردووە و گەیاندویانەتە دەستی من ، بۆیە منیش دەبێ بە ئەمانەتەوە تەسلیمی دەستی تۆی بکەم ، ئەوە بۆ کاتێکی تر هەڵ دەگرین ، ئێستا تۆ لەگەڵم مەیە...)

" مەنسوور " نیو کاتژمێرێکی پێ چوو تا گەڕایەوە ، " موهتەدا " پرسیاری کرد: ( بابە ، بۆ ئەوەندەت پێ چوو؟)

مەنسوور: ( کوڕم کە دەچمە ئەو ژوورە حەز دەکەم زۆر بمێنمەوە ، ئەو ژوورە ڕام دەکێشێ و بە ئاسانی لە مەوداکانی ڕزگارم نابێت ، ئەگەر تۆ چاوەڕوان نەبوویتایە لەوانەیە "چوار پێنج" کاتژمێر بمابامایەوە )

" مەنسوور " سێ کاغەزی لوولکراوی بە دەستەوە بوو ، دووانیانی لە تەنیشت خۆیەوە دانا و یەکێکیانی بەدەستەوە گرت و پەتی لوولەکەی کردەوە و کاغەزەکەی والا کرد و بە "موهتەدا"ی وت: (بیخوێنەرەوە...)

موهتەدا سەری بەسەردا شۆڕکردەوە و زۆر هەوڵی دا بیخوێنێتەوە ، بەڵام لەبەرئەوەی بە خەت و نووسینەکە ئاشنا نەبوو بە باشی بۆی نەدەخوێنرایەوە ، بۆیە بابی کاغەزەکەی بەلای خۆیدا وەرچەرخان و وتی: ( خۆم بۆتی دەخوێنمەوە ، سەرەتا دەبێ بزانیت ئەم یاداشتە بە زمانی کوردی یە و بە ڕێنووسی عەرەبی نوسراوە ، چونکە لەو کاتانەدا ڕێنووسی کوردی نەبووە )

موهتەدا: ( بەڵێ بابە )

مەنسوور: ( ئەمە یەکێکە لە یاداشتەکانی باپیری مەزنمان"مەروان"، دەمەوێت لە یاداشتەکەی ئەوەوە دەست پێ بکەم و پاشان بە ڕیز یاداشت و وەسێتنامەکانی ترت بۆ بخوێنمەوە..

باپیری مەزنمان "مەروان" لەم

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" تەمەنم نزیکەی پەنجا و پێنج ساڵە ، سەردەمی منداڵیم بەخۆشی و ناخۆشی بەڕێ کرد ، لە گەنجێتییەوە عاشقی شۆڕە سواری و شارەزایی جەنگ و کاری سەربازی بووم ، لەناو هاوەڵانی خۆمدا بە ئازایەتی و لێهاتوویی ناوبانگم دەرکرد بوو ، سوپا سالارێکی ئەمارەتی سۆران ناوبانگی منی بەرگوێ کەوت بوو ، لە دووی ناردم و منیش بە خۆشییەکی زۆرەوە بەدەم داواکەیەوە چووم ، سەرەتای گەورەبوونی پلە و پایەی عەسکەری من لەلای ئەو سوپا سالارە بوو ، ئەو منی بە کوڕی خۆی دەزانی ، لە ژێر فەرمانی ئەودا بەشداری چەندین جەنگ و پەلامارم کردووە ، هەر کارێکی عەسکەرییان بەسەرمدا بدابایە خوا تەوفیقی دەدام و تیایدا سەردەکەوتم ، لەگەڵ هاتنی " میر محەمەد " بۆسەر کورسی دەسەلات ئەستێرەی بەختی من هەڵهات و ڕۆژێك "میر" لە دووی ناردم ، منیش ئەوەندە خۆشحاڵ بووم دەتوت بۆ فیردەوسم دەنێرن ، چوومە خزمەتی " میر " و سەری ڕێزم بۆ نەوی کرد ، سوپاسالاران لە خزمەتی " میر " دا دانیشت بوون ، "میر محەمەد" فەرمووی لێ کردم بۆ ئەوەی دابنیشم ، منیش بە شەرمەوە لەسەر کورسییەك دانیشتم ، "میر" ڕووی لە سوپاسالارەکان کرد و فەرمووی: لە ئەمڕۆوە "مەروان" – بەهۆی ئەو سەرکەوتنانەی لە مەیدانی جەنگ و پەلاماردا بەدەستی هێناوە – پلەی سوپاسالاری پێدەدرێت ، پیاوانی دیوانی " میر " هەموو هەستانەوە و پیرۆزباییان لە من کرد و منیش دەستی " میر " م ماچ کرد ، لەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ بە وەفاداری لە خزمەتی " میر " دا ماومەتەوە ")

موهتەدا : ( دیارە کاتێك "مەروان" ئەم یاداشتەی نوسیوە "میر محەمەد" لە ژیاندا بوەوە و ئەمارەتی سۆران نە ڕووخاوە؟!)

مەنسوور: ( بەڵێ وایە )

پاشان "مەنسوور" ئەو کاغەزەی لوولکردەوە و لە تەنیشتی خۆی داینا ، کاغەزی دووەمی هەڵگرت و والای کرد و وتی: ( ئەم کاغەزەی تر وەسێتنامەکەی " مەروان " ە ، تیایدا دەڵێت: لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنم دا بۆ وەچەکانی خۆم دەنووسم : منی عەبدی گوناهبار سەعات بە سەعات هەموو شتێکم لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەست دەردەچێت ، سێبەری " میر " م لە دەست چوو ، " میر " م لە دەست چوو ، پلە و پایەی سەربازیم لە دەست چوو ، جوامێری و ئازایەتیم لە دەست چوو ، وا ئێستاش خەریکە ماڵ و سامان و ژن و منداڵم لە دەست دەردەچێت و بەجێیان دەهێڵم ، لە خۆم ڕازی نیم ، چونکە دەبوا لە دوای "میری مەزن" منیش ژیانم نەویستبایە ، هەرچۆنێك بێت وەسێتتان بۆ دەکەم : ڕێگەی چاکان و پاکان بگرنە بەر ، جوامێری و پیاوەتی و ئازایەتی لە دەست مەدەن ، میللەتی خۆتان خۆش بوێت ، پاڵپشتی گەورە پیاوان بکەن و سەریان بخەن ، لە دووبەرەکی و خۆخۆری بە دوور بن...)

"مەنسوور" ئەو کاغەزەشی پێچایەوە و کاغەزی سێ یەمی کردەوە کە وەسێتنامەکەی "میران"ی کوڕی "مەروان" بوو ، بە یەکێك لە هاوەڵەکانیدا لە قەلای "شەبتان"ەوە بۆ خێزانەکەی نارد بوو ، "مەنسوور" دەستی بە خوێندنەوەی کرد: ( "میران"ی باپیرە گەورەمان لەم وەسێتنامەیەدا — کە لە قەلای "شەبتان"ەوە نووسیوویەتی — دەڵێت:

عەزیزان و خۆشەویستان من ئێستا لە قەلای "شەبتان" لەگەڵ "شێخ عوبەیدوڵلا" دام ، تورکەکان سەرقاڵی کۆ کردنەوەی هێزن بۆ سەر قەلاکەمان ، موریدان و پیاوانی دەوری " شێخ" بڕیارمان داوە تا دوا دڵۆپی خوێنمان بەرگری لە شەرەفی خۆمان بکەین ، ئەگەر شەرەفی شەهیدبوونم بە نسیب بوو ئەوا وەسێت دەکەم :

محەمەدی کوڕم بنێرنە بەرخوێندن و هەوڵ بدات پلە و پایەی زانستی خۆی بەرز بکاتەوە ، زوڵم لە خێزانم و ئەو دوو کچەم نەکرێت و حەقی خۆیان بە زیادەوە پێ بدرێت ، وەسێتنامەکەی "مەروان" ی بابم لە لاتانە و با هەمیشە لە یادتان بێت ، خزمەتی فەقیران و لێقەوماوانتان لە بیر بێت ، دەست بە موڵك و ماڵەوە بگرن و لە ڕێگەی حەقدا بەکاری بهێنن...و السلام علیکم )

موهتەدا : ("میران" ی باپیرمان ترسی لە کێ بووە زوڵم لە هاوسەرەکەی و دوو کچەکەی بکات ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( لە بیرت چوو کە" مەروان " دوو کوڕی هەبووە یەکێکیان" میران " و ئەویتریان کە کوڕە گەورە بووە بە ناوی "دارۆ"، جوامێری و پیاوەتی " دارۆ " لە ئاستی گەورەیی و مەردایەتی "میران" دا نەبووە ، بۆیە پێ دەچێت " میران " ترسی زوڵم و زۆری ئەو برایەی هەبوو بێت...)

بە خوێندنەوەی ئەو یاداشت و دوو وەسێتنامەیە "مەنسوور" سێ کاغەزەکەی زۆر بەجوانی پێچایەوە و وتی: ( با ئەمڕۆ ئەوەندە بەس بێت...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٣ -

# خانەوادەی " مەنسوور " لە گەشتێکدا

هەفتەی داهاتوو "مەنسوور" بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی "مەعسومە"ی هاوسەری و "موهتەدا" ی کوڕی هەڵگرت و بەرە و ئەو شارۆچکەیە بەڕێکەوتن کە ماڵی " نازداری مەلەکووتی " لێ بوو، دوای بڕینی زیاتر لە سێ کاتژمێر ڕێگا گەیشتنە بەرەوە و ڕوویان لە ماڵی کاک "عەبدوڵلا" کرد ، کاك عەبدولا هاوسەری نازدار بوو ، ماڵەکەیان بەناو لە شاردا بوو ئەگینا کەوت بووە دەرەوەی شارەوە ، خانووەکەیان نزیك بە چیا مەزنەکە و دارستانە چڕ و پڕەکەی باکووری شار بوو ، ئەو ناوچەیەی ئەوان تەنها چەند ماڵێکی پێ گەیشت بوو ، بۆیە هەمیشە لە فەزایەکی ئارامدا نوقم بوو بوون...

" نازداری مەلەکووتی و عەبدوڵلا " ی هاوسەری زۆر بە گەرمی پێشوازی و بەخێرهاتنی خێزانی "عەتتار"یان کرد و وایان دەزانی لە ئاسمانەوە بە تایبەتی بۆ ئەوان داباریوون ، مەنسووری عەتتار سندوقی ئۆتۆمبێلەکەی لە دیاری گران بەها و بۆنی خۆش بۆ خانەوادەی کاك " عەبدوڵلا " پڕ کرد بوو...

" عەبدوڵلا مەنگوری " لە ڕێگەی " نازدار " ی هاوسەریەوە ئاشنایەتی لەگەڵ خێزانی مەنسووری عەتتار دا دروست کرد بوو ، لە یەکێك لە سەردانەکانیدا بۆ لای "پیری مەزن " کە لە ماڵی "مەنسوور" نیشتەجێ بوو بوو " نازدار " عەبدوڵلای هاوسەری لەگەڵ خۆی برد ، لەو کاتەوە دۆستایەتی لە نێوان "عەبدوڵلا و مەنسوور " دا پ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە ڕێگەی سۆفیگەری و سەیر و سلوك نەدەهات ، بەلاّم هەمووجارێك "مەنسوور" بە موریدانی "پیری مەزن " ی دەوت: کەسانێك هەن وەکو ئێمە سەیر و سلوك ناکەن ، بەلاّم خاوەنی دلّ و دەروونی زۆر مەزنن ، کە پرسیاریان لێ دەکرد: وەکو کێ ؟ مەنسوور دەیوت: وەك کاك "عەبدوللاّ " ی مێردی "نازداری مەلەکووتی"، بە ڕاستی کەسێکی مەزنە و خاوەنی دلّێکی گەورە و دەروونێکی فراوان و سینگێکی گوشادە...

ئەو شەوەی مالّی کاك "عەبدوللاّ " شەوێکی تایبەت بوو ، چەندین زانا و پیاو و ژنی گەورەی ئەو شارە بۆ بەخێرهاتنی "مەنسوور" و خێزانەکەی ڕوویان لە مالّی کاك "عەبدوللاّ " کرد بوو ، "مەنسوور" بە زانایان و پیاوانی مەجلیسەکە " موهتەدا " ی ناساند و بۆ دەرخستنی پلە و پایەی زانستی کوڕە تاقانەکەی داوای لە "موهتەدا " کرد بەشداری گفتوگۆی مەجلیسەکەیان بکات ، ئەویش لە ئەوپەڕی ئەدەبەوە هاتە وەلاّم و وتی: ( کاتێك ئەم هەموو زانا و پیاوە گەورانە ئامادەی مەجلیس بن کەم ئەدەبی یە بۆ من باس و خواسی زانستی بکەم )

یەکێك لە پیاوانی مەجلیس ڕووی لە "مەنسوور" کرد و وتی: ( من پرسیارێك لەم کوڕە بەڕێزەت دەکەم )

مەنسوور: ( بفەرموو )

پیاوەکە ڕووی لە " موهتەدا " کرد و وتی: ( باشە کوڕی خۆم دەگونجێت کەسێك گوناه بکات و لە خودا نزیك ببێتەوە و کەسێکی تر هەمیشە لە کڕنوش و پەرستنی خودادا بێت ، کەچی بەو کارەی لە خودا دوور بکەوێتەوە ؟! )

"موهتەدا " ماوەیەك بێدەنگ بوو ، "مەنسوور"ی بابی ڕەنگی گۆڕا و ترسی ئەوەی لێ نیشت وەلاّمەکەی لە لا نەبێت ، یاخود وەلاّم بداتەوە و پڕ بە پێستی پرسیارەکە نەبێت...

بابی سەیرێکی "موهتەدا" ی کرد و چاوی بڕی یە چاوەکانی و وتی: ( کوڕم " موهتەدا " وەلاّممان بدەرەوە..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"موهتەدا "چاوێکی بە مەجلیسەکەدا گێڕا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و وتی: ( ئەسڵ و بنچینە لە پەرستشی خودادا ملکەچی و زەلیل بوونە ، بۆیە هەر کار و کردەوەیەك مرۆڤ ملکەچی ئەو زاتە بکات لای خودا گەورە و پەسەندە ، بە پێچەوانەوە هەر کار و کردەوەیەك مرۆڤ فێری لووت بەرزی و خۆ بە گەورە زانین بکات با پەرستنی خوداش بێت لای ئەو وەرناگیرێت ، دەگونجێت ئەو کەسەی گوناه دەکات گوناهەکانی تووشی شەرمەندەیی و خەجاڵەتی دەرگای خودای بکات و بۆ ئەو مەبەستەش لە ناخەوە ملکەچی و زەلیلی خۆی بۆ خودا نیشان بدات ، لێرەدا گوناه ئەو مرۆڤەی لە خودا نزیك کردەوە ، لەم بەرەوەش کەسێك هەیە هەمیشە سەرقاڵی پەرستنی خودایە و ئەو پەرستنەش تووشی لووت بەرزی و خۆ بە گەورە زانینی کردووە و پێی وایە تەنها ئەو بەندەی ڕاستەقینەی خودایە و خەڵکانی تر هەموو ناتەواو و دوور لە خودان ، خودا تەنها خودای ئەوە و دەرگای بە تەنها لە ئەو کردۆتەوە و پەرستشی خەڵکانی تر لە جێی خۆی نییە ، ئەو کەسە بە ئەندازەیەك لووت بەرزی و دەمارگیری دەیگرێت پێی وایە خودا ئاتاجی عیبادەت و بەندایەتی ئەوە ، ئەم جۆرە کەسانە بە بەندایەتی کردن لە جێگەی نزیك بوونەوە لە خودا لە ئەو دوور دەکەونەوە ، بۆیە ئیمامی "غەزالی" پێی وایە گوناهێك مرۆڤ تووشی ملکەچی و زەلیلی بکات باشترە لە عیبادەتێك مرۆڤ فێری لووت بەرزی بکات ، بەڵام ئەم بابەتە بابەتێکی گرنگ و هەستیارە و هەروا بە سادەیی مرۆڤ لە بنج و بناوانی تێ ناگات..)

یەکێك لە زاناکان: ( ئافەرین ڕۆڵە ، هەزار ئافەرین بۆ ئەو زانستە قووڵەی بە دەستت هێناوە ، خودا بۆ " مەنسوور" ت بهێڵێت ، ئومێد دەکەم وەجاخی هەموو ئەو زانا مەزنانە ڕۆشن بکەیتەوە کە سەدان ساڵە زانست و عیرفان بە مەردوومانی ئەم وڵاتە دەگەیەنن )

یەکێکی تر لە مەجلیسەکە هەڵیدایە و وتی: ( زانای لاو ، پێمان بڵێ پلە و پایەی ئەو کەسانە لە لای خودا چۆنە لەسەر بەرگری لە خاك و خەڵك گیانیان دەبەخشن ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( لە دیدی ئایینەوە خاك و خەڵك هەموو دروستکراو و بەندەی خودان ، مرۆڤەکان لە دوو شتدا یەکسانن: یەکەمیان لە ڕەگەز دا هەموو مرۆڤن و هیچ مرۆڤ و گەل و نەتەوە و بنەماڵەیەك لەوانی تر جیاوازیان نییە ، هەموو مرۆڤایەتی دەچنەوە سەر یەك باوك و دایك کە " ئادەم و حەوا " یە ، دووەمیان خودا زەوی بۆ هەموویان دروست کردووە و پێویستە بە یەکسانی لێی بەهرەمەند بن ، ئەم دوو بنەمایە مرۆڤەکان لە ئەرك و مافدا یەکسان دەکات و لەسەریان پێویست دەکات مافەکانی یەکتری پارێزگاری لێ بکەن ، مرۆڤ بۆ بەرگری لە مافەکانی خۆی دەتوانێت سنوورێك بۆ دەست درێژکار دابنێت و ڕێگەی پێ نەدات پێ بنێتە ناو بازنەی مافەکانی ئەوەوە ، هەموو گەل و نەتەوە و میللەتێك لەسەر خاکی خۆیان مافی ئازادی و ژیانێکی سەربەستانەیان هەیە ، هەر هێز و دەسەڵاتێك ئەو مافە لەو گەل و نەتەوە وەردەگرێتەوە دەست درێژکارە و چوون بە گژیدا پێویستە ، هەموو ئەو کەسانەش لەو پێناوەدا خوێنیان دەڕژێت لە لای خودا گەورە و پایەدارن ، هەموو ئەو دەست درێژکارانەش لەو ڕێگەیەدا دەکوژرێن خودا بە ستەمکار و دەست درێژکار سەرژمێریان دەکات ، مەگەر کەسێك بە زۆر بدرێتە بەر و جەنگی ناڕەوای پێ بکرێت...)

یەکێك لە پیاوانی مەجلیس: ( ئەم وەڵامەشت هەروەك ئەوەی یەکەم بەهێز بوو)

مامۆستایەکی ئایینی: ( ئەی لاو ، پێمان بڵێ گوێڕایەڵی و ملکەچ بوون بۆ حاکمی وڵات و دەسەڵاتداری سەردەم دروستە یان نا؟)

موهتەدا: ( هەر دەسەڵاتێك ژیان و ئازادی و ئاسایشی بۆ کۆمەڵگە دابین کرد پابەند بوون بە یاساکانییەوە پێویستە و لادان لەو یاسایانە دەکەوێتە خانەی سەرپێچییەوە ، هەر فەرمانڕەوایەك نەتوانێت ئەو سێ زەرورەتەی مرۆڤ دابین بکات لەسەر کۆمەڵگە پێویستە هەوڵی گۆڕین و ڕاست کردنەوەی بدەن )

مامۆستا ئایینییەکە: ( هەوڵی گۆڕین بەچی و چۆن چۆنی؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( هۆکاری گۆڕین سنووردار نییە ، بەهەر ئامرازێك کەمترین زیانی لێ بکەوێتەوە و زۆرترین قازانجی هەبێت دەتوانرێت هەوڵی ڕاست کردنەوە بدرێت ، بەڵام لێرەدا دوو خاڵ زۆر گرنگە ئاماژەی پێ بکرێت:

یەکەمیان ئەوانە کێن بڕیار دەدەن دەسەڵات بە ئاراستەی پێشێل کردنی مافی هاولاتی و مافی کۆمەڵگە هەنگاو هەڵ دەگرێت؟ چونکە ناکرێت هەرکەس لە جێگەی خۆیەوە ڕاست بێتەوە و بڵێت دەسەلات و فەرمانڕەوا لایان داوە و دەبێت ڕاست بکرێنەوە...

دووەمیان لە بارێکدا گەر دەسەڵات ئەو گرێبەستەی لەگەڵ کەسەکانی ئەو کۆمەڵگەدا بەستوویەتی بشکێنێت و برگە و بەندەکانی جێبەجێ نەکات ئەوانە کێن ئامراز و هۆکاری ڕاست کردنەوەی دەسەڵات دیاری دەکەن؟ دیسان پرسیارێکی ترە..)

مامۆستا ئایینییەکە: ( ئەوانە کێن ؟)

موهتەدا: ( هەموو زانستێك پسپۆڕی تایبەت بەخۆی هەیە ، پێویستە ئەو کەسانەی پسپۆڕن لە زانستی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و بەرقەرار کردنی سیاسەتدا بڕیار بدەن ئاخۆ دەسەڵات لەسەر تەوەرەی خۆی ترازاوە و پێویستی بە ڕاست کردنەوە هەیە یان نا؟ لە ولاتانی خاوەن یاسا و دامەزراوەدا دەسەڵات دابەشکراوە و لە کەسێك یان چەند کەسێکدا چڕ نەکراوەتەوە و هەر دامەزراوەیەکیش چاودێری دامەزراوەیەکی تر دەکات و بە هەموویان ڕەوتی دروستی دەوڵەت دیاری دەکەن...)

مامۆستا ئایینییەکە: ( ئێمە باسی ئەو ولاتانەت لێ ناپرسین ، بەڵکو قسەی ئایینمان لە تۆ دەوێت )

موهتەدا: ( لێرەدا و بۆ وەلامی ئەو قسەیەی دواییت دەبێت چەند خاڵێك ڕوون بکەمەوە:

خاڵی یەکەم: ئیسلام نیزامێکی سیاسی دیاری کراوی بۆ مرۆڤایەتی نەهێناوە ، ناتوانین بڵێین سیستمی سیاسی ئیسلام سۆسیالیستی، یاخود لیبرالییە،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

یاخود هەر سیستمێكی تره ، ئیسلام كۆمەڵێك بنەمای بۆ سیاسەت باس كردووه ، ئەو بنەمایانە بە چ سیستم و میكانیزمێك پیادە دەكرێت بۆ بڕیاری مرۆڤ و ژێری مرۆڤ بەجێ هێڵراوه ، ئایین دەزانێت مرۆڤ و كۆمەڵگە و سەردەم لە گۆڕانێكی بەردەوامدایە و بەستنەوەی بە سیستمێكی تایبەتەوە دروست نییە و مرۆڤ ناتوانێت پێیەوە پابەند ببێت..

مامۆستا ئایینییەكە: (ئەو بنەمایانە كامانەن؟)

موهتەدا: ( دادپەروەری ، میانڕەوی ، شوورا..)

خالّی دووەم: ئێمە دەبێ بپرسین ئایا دەوڵەتانی خۆرئاوا توانیویانە ژیان و ئازادی و ئاسایش بۆ مرۆڤ دابین بكەن؟ بە دڵنیاییەوە زۆرینەیان توانیویانە ئەو كارە بكەن ، بۆیە ناتوانین بڵێین ئەو سیستەمەی خۆرئاوا لە لای ئایین قبوڵ نییە و ڕەد دەكرێتەوە ، بۆ؟ چونكە زۆربەی ئەو مەرامانەی ئایین لە دەسەڵات داوای دەكات لەو سیستەمەدا هاتۆتە دی ، ئەمە لە لایەك لە لایەكی ترەوە دەبێ بپرسین بۆچی ئێمەی كۆمەڵگە ئیسلامیەكان ئامێر و تەكنۆلۆژیای خۆرئاوامان قبوڵە ، بەلاّم سوود وەرگرتن لەو سیستەمە سیاسی و ئابورییەمان قبوڵ نییە؟ مەگەر هەردووكیان ئەقڵ و تەجروبە داینەهێناون؟ من دەزانم ڕەخنە لەم ڕایەی من دەگیرێت و دەڵێن: لەخۆرئاوادا خەڵك حاكمە و لەلای ئێمە دەبێت خودا حاكم بێت ، لێرەدا من دەپرسم: كاتێك خودا دەبێت بە حاكم بۆ ئەوەیە خەڵكی بچەوسێنێتەوە و قەتڵ و عامیان بكات یان بۆ ئەوەیە بەرگری لە ماف ژیان و ئازادی و ئاسایشیان بكات ؟ بێ گومانم ڕای دووەم هەڵدەبژێرن ، لێرەدا پرسیارێكی تر سەر هەڵدەدات : سیستمی سیاسی خۆرئاوا سێ زەرووڕەتەكەی بۆ مرۆڤی كۆمەڵگەكانیان دابین كردووه یان نا؟ لێرەدا دەتوانم بڵێم بەڵێ ، بەشێكی زۆری دابین كردووه ، جا كەوابوو چۆن دەتوانین بڵێین ئایینی ئێمە بە گژ ئەو سیستەمەدا دەچێتەوه؟ پرسیارێكی تر: ئایا كاتێك دەڵێین: خودا حاكمە ، خودا بۆخۆی دێت حوكم دەكات یان كۆمەڵێك فریشتە ڕەوانە دەكات ، یاخود كۆمەڵێك مرۆڤ بە تێگەیشتن لە فەرمانەكانی ئەو حوكم دەكەن؟ بێگومان یەكەم و دووەم نییە ، بەڵكو ئەقڵ و لێكدانەوەی مرۆڤ حوكم دەكات ، لێرەدا دەپرسین

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئایا ئەو مرۆڤە لە لێکدانەوە و جێبەجێ کردندا تووشی هەڵە و لادان و نەپێکان دەبێت یان نا؟ بێگومان لەبەرئەوەی مرۆڤە بەڵێ تووشی دەبێت ، ئایا لە مێژووی دەسەلاتی ئیسلامیدا دەیان و سەدان کوشتن و بڕین و ستەمکاری نابینین لە پاڵ سەدان و هەزاران لاپەڕەی سپی و عەدالەتی مەزندا ؟ دیسان بەڵێ بەرچاومان دەکەوێت ، کەوابوو لێرەدا ناوەڕۆك مەبەستە نەك ناو، تەنها ناوی "ئیسلامیی" دەسەلاتێك ناکاتە دەسەلاتێکی شەرعی و یاسایی و لەوبەرەوەش نەبوونی پاشگری ئیسلامیی بە دەسەلاتێکەوە دەسەلات ناگۆڕێت بە دەسەلاتێکی شەیتانی...

خاڵی سێیەم: لە سەرەتای مێژووی خەلافەتەوە دەسەلات بۆ دەسەلاتی خەلیفە و والییەکان و فەقیە و موجتەهیدەکان و دەسەلاتی ئالوبەیت دابەش بوو بوو، بەرانبەر هەموو ئەمانەش دەسەلاتی کۆمەڵگەی مەدینە کە هەموویان لە خزمەتی " پێغەمبەر " دا ژیا بوون و هەریەکەیان بە ئەندازەیەك تێگەیشتن و بیرکردنەوەی تایبەت بە خۆی هەبوو، ئەم چوار دەسەلاتە لە یەك کاتدا کاریان دەکرد و چاودێری ئەدای کاری یەکتریان دەکرد ، ئەم ڕێگەی کارکردنە لە سەردەمی " خەلافەتی ڕاشیدین " دا بە ڕوونی دەبینرێت و دواتر "ئەمەوییەکان و عەباسییەکان " دێن و ئاراستەی دەسەلات بە ئاقارێکی تردا دەبەن و ئەو سەرئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە کە مێژوو بۆمان باس دەکات...

خاڵی چوارەم: چۆنێتی هەڵبژاردنی خەلیفەیە کە هەریەکەیان بە جۆرێك هەڵبژێرراوە ، پێغەمبەر – دروودی خودای لەسەر بێت – لە دوای خۆی کەسی هەڵ نەبژارد و ئەو کارەی بۆ هەموو موسڵمانان بەجێ هێلاو ، ئەوانیش لە هەڵبژاردنێکی گشتی کۆمەڵگەی مەدینەدا "ئەبوبەکر " یان بە خەلیفە هەڵبژارد ، هەڵبەتە دوای پالاوتنی لە لایەن عومەرەوە ، ئەبوبەکر بەر لە مردنی – دوای ڕاوێژ کردن بە کۆمەڵێك کەسی شارەزا لەو مەیدانەدا – بڕیاری دا حەزرەتی عومەر لە دوای خۆی بە خەلیفە دابنێت ، حەزرەتی عومەریش بۆ دیاری کردنی خەلیفە بەر لە مەرگی شەش کەس دیاری دەکات و داوایان لێ دەکات لە نێوان خۆیاندا کەسێك هەڵبژێرن ، ئەوانیش حەزرەتی "عوسمان" هەڵدەبژێرن ، لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دوای شـەهید بـوونی حـەزرەتی عوسمـان دیـاری کـردن و هەڵبـژاردنی خەلیفـە دەگەڕێتەوە بۆ دەستی کۆمەڵگەی "مەدینە" و ئەوانیش حەزرەتی "عـەلی" بـە خەلیفە دیاری دەکەن ، پرسیارەکە ئەمەیە : ئەم چوار ڕێگا جیـاوازە لـە دیاری کردنی خەلیفە ئەوە ناسەلمێنێت کە چۆنێتی جێبـەجێ کردنـی دادپـەروەری لـە حکومڕانیدا بۆ ئەقڵ و ئیرادەی مرۆڤ بەجێ هێڵراوە ؟)

یەکێك لەو زانا مەزنانەی لە دانیشتنەکەدا ئامادە بوو ڕووی لە مامۆسـتایان و پیـاوانی مـەجلیس کـرد و وتـی: ( چـاکتر وایـە لەمـە زیـاتر زانـستی ئـەم لاوە تاقینەکەینەوە ، چونکە ئەوەندەی مـن لـەم گەنجـە ورد دەبمـەوە تـاکو بـەیانی پرسـیاری لـێ بکرێـت دەتوانێـت وەڵام بداتـەوە و قـسەی لـێ نابڕێـت و قـسەی دووبارەشی نییە)

مامۆستایەکی ئایینی تر: ( بەڵام قوربان منیش پرسیارێکم لـەم زانـا لاوەمـان هەیە، ئەگەر مۆڵەتم پێ بدەی دەمەوێت ئاراستەی بکەم؟)

زانا ئایینییەکە کە ناوی سـەید عەبدولڕەحمانی مـزوری بـوو: (پرسـیارەکەت بکە ، بەڵام با دوایین پرسیار بێت)

مامۆستا ئایینییەکە: ( من لە سەردەمی فەقێیەتی یەوە تاکو ئەمڕۆ کـە وانـە بـە فـەقێ دەڵێمـەوە گـیرم بـە پرسـیارێکەوە خـواردووە و نـەموێراوە لای مامۆستاکانیـشم باسـی لێـوە بکـەم ، بـەڵام کـۆڕ لەمـە گـەرمتر نابێـت و لەمـە زۆرتریش زانا کۆ نابێتەوە ، بۆیە بە هەلی دەزانم ئەم شەو دڵی خۆم واڵا بکەم و گرێی دەروونم بۆ ئێوە بکەمەوە..)

موهتەدا: ( بفەرموو ، بەڵام مەرج نییە تەنها من وەڵامی بدەمەوە)

مامۆستا ئایینییەکە: ( مـرۆڤ بـە ئـەقڵ و تەجروبـەی کەڵەکـە بـوو دەتوانێـت نهێنییەکانی مرۆڤ و ژیان و گەردوون پەی پێ ببات و لەبـەردەم ئـەو یاسـا پـەی پێ براوانەدا ژیانی دونیایی خۆی ڕێك بخات بە جۆرێك لە ئەمڕۆدا هـەموومان دان بەو نیزامە سیاسی و ئابوورییەدا دەنێین کـە ئـەقڵی خۆرئـاوا بەرهـەمی هێنـاوە ، پرسیارەکە ئەوەیە: ئەگەر ئەقڵ ئەم دەسەڵاتەی هەبێت ، ئیتر وەحـی و هـاتنی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پەیامە ئاسمانییەکان و ناردنی پێغەمبەران بۆچی یە و لە پێناوی چیدا بووە؟ بەڵام دەبێت ڕێگەم پێ بدەن لەسەر قسەکانتان پرسیار بکەم، چونکە پرسیارەکەی من تەنها ئەوە نییە، بەڵکو ئەوە تەنها پێشەکییەکە بۆ ئەوەی سەرەتای باسەکەمانی لێوە دابمەزرێنین...)

موهتەدا: ( مامۆستای بەڕێز تەنها ئەو پرسیارە چەندین شەوی گەرەکە و بۆ گەیشتن بە ئەنجامێك لەو مەیدانەدا من پێشنیار دەکەم پاش ماوەیەکی تر سەردانێکی خوێندنگەکەی "مەلای گەورە" بکەیت و لەوێ چاومان بە یەکتر دەکەوێت و لەسەر پرسیارەکە بە تێر و تەسەلی قسە دەکەین )

زانا ئایینییەکە – سەید عەبدولڕەحمانی مزوری –: ( ڕەحمەت لە دایك و باوکت، بەڕاستی لەمە زیاتر قسە کردن لەو مەسەلە فیکری و فەلسەفیانە هەموومان ئاڵۆز دەکات و ئەوەی بیستوومانە ناتوانین سوودێکی لێ ببینین )

یەکێکی تر هەڵیدایە: ( کاك "مەنسوور" ئێمە سوودی زۆرمان لە "موهتەدا" بینی، خودا تەمەنی درێژ بکات و زۆرتر و زیاتر زانستی پێ ببەخشێت، بەڵام ئێمە حەز دەکەین تۆش وەك عەتتارێکی مەزن کە شام و ئێران دەتناسن هەندێك لەسەر ئەو کار و پیشە نایابە قسە و باسمان بۆ بکەیت )

زانا ئایینییەکە – سەید عەبدولڕەحمان –: ( کاك "مەنسوور" سبەی نیوەڕۆ لە ماڵی ئێمەیە و ئەو پرسیارە هەڵ دەگرین بۆ ئەو کاتە، ئەم میوانانە ماندون و پێویستیان بە ئیسراحەت هەیە )

دوای میوە خواردن و هەندێ قسە و باسی تر لەمەڕ ژیان و گوزەرانی شارۆچکەکە میوانەکان هەستان و خواحافیزیان کرد و ماڵی کاك "عەبدوڵلا" یان بەجێ هێلا..

بە ڕۆیشتنی میوانەکان مەنسوور و موهتەدا و عەبدوڵلا و سمکۆی کوڕی تەنها کەوتن و لەبەر ماندوێتی میوانەکان کاك عەبدوڵلا داوای لە "نازدار" ی هاوسەری کرد جێگە بۆ میوانەکان ڕابخات تاکو بحەوێنەوە و ماندوبوونی خۆیان دەربکەن، "موهتەدا" داوای کرد ئەگەر "سمکۆ" بەحاکی دەزانێت پێکەوە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لەسەر بان جێگەیان بۆ ڕابخەن ، "سمکۆ " دوو جێگەی بردە سەربان و لەگەڵ "موهتەدا " ڕۆیشتنە سەرەوە و لەسەر جێگەکانیان ڕاکشان ، "موهتەدا" پرسیاری لە "سمکۆ " کرد: ( ئەو قسە و گفتوگۆیانەی دانیشتنەکەت لا چۆن بوو؟)

"سمکۆ " ڕاشکاوانە هاتە وەڵام و وتی: (بێزم لە هەمووی دەکردەوە ، کاتێك پرسیار دەکرا و تۆش وەڵامت دەدایەوە لە پرسیار و وەڵامەکەش ئێڵنجم دەهات)

موهتەدا: ( زۆرم پێخۆشە ڕاستگۆیانە بیروڕای خۆت دەردەبڕیت )

سمکۆ: ( ئاتاجی درۆکردن نیم لە لات )

موهتەدا: ( بەلاّم پێم خۆشە بزانم تۆ بێز لە چی ناکەیتەوە ، یاخود بەچی ئێڵنجت نایەت )

سمکۆ: ( بە ئازادبوونی مرۆڤ لە هەموو کۆت و پێوەندێك لە پێش هەموویانەوە ئازادبوونی لە کۆت و پێوەندی ئایین )

موهتەدا: ( ئەی بۆچی لە ئازادی ڕەها بێز ناکەیتەوە ؟)

سمکۆ: ( چونکە مرۆڤ دەکاتەوە بە مرۆڤ ، شتەکانی تر مرۆڤبوون لە مرۆڤ وەردەگرنەوە ، بەلاّم ئازادی مرۆڤبوون بۆ مرۆڤ دەگێڕێتەوە)

موهتەدا: ( بەلاّم ئازادی کەش و هەوایەکە دەڕەخسێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بیری تیا بکاتەوە و نەخشەی تیا بگرێ و ئاراستە و هەڵوێستی جۆرا و جۆر وەربگرێت ، دەمەوێت بڵێم ئازادی زەمینەیە ، وەرزە ، کەش و هەوایە تاکو مرۆڤ وەك جوتیارێك تۆوی تیا بچێنێت و بەری تیا بدورێتەوە ، ئایا تۆ لە کەش و هەوای ئازادیدا دەتەوێت چ تۆوێك بچێنیت؟)

سمکۆ: ( لەوانەیە ئەو پێناسەیەی تۆ بۆ ئازادی دەکەیت من قبوڵم نەبێت..)

موهتەدا: ( بۆ ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سمکۆ: ( چونکە ئەوە پێناسەیەکی زۆر ئایدۆلۆژیانەیە بۆ ئازادی دەکـەیتت ، لای من پابەندبوون بە ئایدۆلۆژیاوە جۆرێکی ترە لە کۆیلـەبوون و لـە دەسـتدانی ئازادی )

موهتەدا: ( بەلاّم زۆر شت هەیە مرۆڤ پێیـەوە پابەنـدە و لـە ئازادییەکانیـشی کەم ناکاتەوە)

سمکۆ: ( وەکو چی؟)

موهتەدا: ( وەك ئەم جل و بەرگەی لەبەر من و تۆدایە )

سمکۆ: ( ئەم جلو بەرگە تەجروبە سەلماندویەتی بۆ سەرما و گەرما سـوودی هەیە ، لەگەلّ ئەوەشدا هەندێك كات لێمان دەبێتە كۆت و پێوەند)

موهتەدا: ( یانی تۆ باوەڕت بە تەجروبە هەیە؟)

سمکۆ: ( بەلّێ )

موهتەدا: (کەوابوو تۆ پابەندیت بە شتێکەوە ناوی تەجروبەیە)

سمکـۆ: ( بـەلّێ ، بـەلاّم دەبـێ ئـەوە بزانیـت تەجروبـە سـەلماندویەتی کـە تەجروبە بە کەلّکە و زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێت)

موهتەدا: ( هەرچۆنێك بێت تۆ باوەڕت بە شتێك هێناوە ناوی تەجروبەیە)

سمکۆ: ( هەروایە)

موهتەدا: ( چۆنت زانی تەجروبە بە کەلّکە؟)

سمکۆ: ( وتم ، تەجروبە سەلماندویەتی کە تەجروبە بە کەلّکە)

موهتەدا: ( دەی هەر بەو جۆرە خاوەن بیروباوەڕەکانیش دەلّێن: تەجروبـە و زانست و ژیری سەلماندویانە ئەو باوەڕەی ئەوان پێیەوە پابەندن مرۆڤ ئاسـوودە دەکات و بۆ ژیانیان پێویستە)

سمکۆ: ( بەلاّم باوەڕی ئایینی بە زانست و تەجروبە ناپێورێت)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( ڕاستە ، ژیری پەی بە هەموو بنچینەکانی ئایین نابات و ناتوانێت پێناسەیەکی زانستییانەیان بۆ بکات ، بەڵام ئایا لەو دیو ئەقڵ و زانستەوە ڕێگەیەکی تر نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە حەقیقەتی باوەڕی ئایینی بگات و لەو دونیا ئاڵۆز و پڕ لە گومانە بێتە دەرەوە؟)

سمکۆ: ( لەو دیو ئەقڵ و فەلسەفە و زانستەوە شتێکی تر هەیە ئەویش بریتی یە لە ئەفسانە و وەهم و خەیاڵ پلاّویی )

موهتەدا: ( هەروا بە ئاسانی ئەو دیوی ئەقڵ بە وەهم و ئەفسانە یەکسان دەکەیت؟! )

سمکۆ: ( بۆخۆی وایە من گوناهم چی یە ، خۆزگە شتێکی تر هەبوایە؟)

موهتەدا: ( بەڵام لە گەورە فەیلەسوفانی یۆنانەوە تاکو ئەمڕۆ زۆر کەمن ئەو ئەندێشمەندانەی قسەی لەو جۆرە بکەن ، بەڵکو زۆرینەیان لەسەر ئەوە کۆکن لەو دیو ئەم جیهانەی ئێمەوە جیهانێکی تر بوونی هەیە و وەهم و خەیاڵ پلاّویش نییە تەنها ئەوەیە ئەقڵ ناتوانێت پەی پێ ببات )

سمکۆ: ( لای من ئەو شتەی ئەقڵ پەی پێ نەبات ئەفسانەیە)

موهتەدا: ( تۆ مافی خۆتە وا بیر بکەیتەوە ، بەڵام زانا و فەیلەسوفان ئەم قسەیەی تۆ ناکەن )

سمکۆ: ( بەڵام کەمیش نین ئەوانەی ئەم قسەیەی من دەکەن )

موهتەدا: ( ماندوم کردی ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بنووین...)

هەردوو خامۆشی یەك داگیری کردن و کەوتنە ناو خەوێکی قووڵەوە...

سبەینێ زوو "موهتەدا " بە ئاگا هات و بۆ ئەوەی "سمکۆ" بە ئاگا نەیەت بە ئەسپایی لەسەر جێگەکەی هەستا و بە پەیژە دارینەکەدا هاتە خوارەوە و بەرە و دارستانی پشتی گوندەکە بە تەنها کەوتە ڕێ ، دونیا هێشتا بە تەواوی ڕۆشنای نەکرد بوو ، چڕی دارستانەکە و لێڵەی بەرە بەیان ناو دارستانەکەی بە دەریایەیەکی تاریك گۆڕی بوو ، ئەو ت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لێـی بـزر دەبـوو ، هەنـدێك جـاریش توولـە ڕێگەكـە بۆخـۆی ئەوەنـدە باریـك دەبوویـەوە دەتـوت ڕیـسی خوریيـە و ئـافرەتێكی لێـزان بـە تەشـيیەكی باریـك دەیرێسێت ، ئەو لـە گـەڕان بـە نـاو دارسـتانەكەدا بـەردەوام بـوو تـا كانیـاوێكی سازگاری بن دارقـەزوانێكی پـیری دۆزیـەوە و دەستنوێژێكی هـەڵگرت و لەسـەر بەردەنوێژە بەردینەكە چەند ڕكاتێك نوێژی بۆ خودای خۆی كرد و پاشان لەسەر بەردە نوێژەكە دانیشت ، سەرەتا چاوێكی بە دەور و بـەری كانیاوەكـەدا گێـڕا ، بـینی لـە چـوار دەوری كانیاوەكـەدا وردە پـەڕی " كـەو " ی لەسـەر كـەوتووە ئەوەش بەڵگـە بـوو لەسـەر هاتنیـان و خواردنـەوەی ئـاو لـە كانیاوەكـە ، دواتـر كەوتــە هەڵمـژینی نەسـیمی بەرەبـەیان ، ئـەو نەسـیمەی دەتـوت لـە سـینەی عاشقێكەوە هەڵ دەقووڵێت و بە دیاری بـۆ مەعـشوقێكی میهرەبـانی دەنێرێـت ، هەڵمژینی نەسیمی بەرە بەیان كە گوند نـشینە پـاك و بێگـەردەكان پێـی دەڵێن "سەبای ساڵحان " یەكێك بوو لە خوی هەمیشەیی "موهتەدا" ، ئـەو گـەر بـەرە بەیانێك لە هەڵمژینی ئەو نەسیمە دوا بكەوتبایە تاكو ئێوارە هەستی بە بێزاری و قورسی جەستەی دەكرد ، خۆ ئەگەر ئەو نەسـیمە لـە جێگەیـەكی دوور لـە شـار بێت و لە نـاو دارسـتانێكی چـڕدا بێـت ئـەوا هـەرگیز لـە یـاد ناكرێـت و دووبـارە بوونەوەی دەگمەنە...

لـە دوورەوە گـوێی لـە قاسـپەی " كـەو "ە سـلۆك و سەركەشـەكان بـوو ، خوێندنی ئەوان هەڕەشە بوو لە لێڵی و تاریكی بەرەبەیان ، ئەوان بـەو خوێندنـە مـژدەی ڕۆژێكـی نوێیـان بـە یـەكتری دەدا و یـەكتریان ئاگـادار دەكـردەوە لـە خیانەتێك زۆر لە مێژە لە ناویاندا ڕیشەی داكوتیوە و هـەر هـەموو نـەفرەتی لـێ دەكەن و هەر هەمووش لەگەڵ دیلی و ئەسارەتدا تێـی دەكـەون ، لـە یـەكتریان دەپرسی: بۆ خۆمان ناپاكین ، یـاخود ڕاوچییەكانن فێـری خیانـەتمان دەكـەن؟ هەشـیان بـوو وەڵامـی دەدایـەوە و دەیـوت: ناپـاكی چارەنووسـە و كـەسمان ناتوانێـت لـە دەسـتی قوتـار ببێـت ، ناپـاكی مەرگـە و مـەرگیش لـە دەرەوەی دەسەڵاتی زیندەوەرانەوەیە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"موهتـەدا " چـاوەکانی لێـك نـابوو لـە ناکـاو "مەریـەمی مەلـەکووتی" بـە سەرپۆشێکی سپی یەوە هاتە پێش چاو ، لە پڕ چاوی کردەوە و سەیری دەور و بەری خۆی کرد ، بەلأم کەسی نـەبینی و وای لێکدایـەوە فـراوان بـوونی خـەیاڵی بوو بێت ، بۆیە دیسان چاوەکانی لێکنایـەوە ، ئـەمجارەیان گەشـتر و ڕۆشـنتر "مەریەم" ی هاتە پێش چاوان ، بەلأم بە سەرپۆشێکی ڕەشەوە ، دیسان چاوی کردەوە و لە چوار دەوری خۆی ورد بوویەوە ، دیار بوو کەس لەو ناوەدا بـوونی نەبوو ، هەستایە سەرپێ و کانیاوەکەی بەجێهێلا و بەرە و ماڵی کـاك "عەبـدوڵلا " گەڕایـەوە و ڕووی لـە دیوەخانەکـە کـرد ، بـینی بـابی و کـاك "عەبـدوڵلا " دانیشتوون و " مەریەم " یش سفرەی بۆ داخـستوون و لـە پـاڵ سـەماوەرەکەدا دانیشتووە و چایان بۆ تێ دەکات ، "مەریەم" بە بینینی "موهتـەدا " بزەیـەکی زۆر هێواشی خستە دەرەوە و "موهتـەدا"ش بـە تیلـەی چـاوەکانی بـە خێرایـی سەیرێکی "مەریەم "ی کرد ، سەیر لـەوەدا بـوو ئێـوارە کـە "مەریـەم" ی بـینی سەرپۆشێکی سپی لەسەر نابوو ، بـەلأم ئـەو بەیانییـە سەرپۆشـەکەی بـە ڕەش گـۆڕی بـوو ، دیـار بـوو "مەریـەم" چـاوەڕوانی گەڕانـەوەی "موهتـەدا " بـوو ، چاوەڕوانی یەکەشی لەسەر کانیاوەکە بۆ "موهتـەدا" لـە شـێوەی "مەریـەم" دا بەرجەستە بوو بوو...

سـفرەی بـەیانیان لـە مـاڵی کـاك "عەبـدوڵلا " لـە هـەموو ژەمـەکان زیـاتر دەڕازێنرایەوە ، پـەنیری کـوردی و هێلکـەی مریـشکی خۆمـاڵی و ماسـتی مـەڕ و کولێرەی تەنووری گەرم و هەنگوینی کوردی پاڵقتە بە هەمیشەیی سفرەی مـاڵی کاك "عەبدوڵلا " ی بەجێ نەدەهێلا...

دوای خواردنی ژەمی بەیانی "مەنسوور و کاك عەبدوڵلا " و چـەند دۆسـتێکی تری سەردانی چەند خانەوادەیەکیان کرد ، یەکێك لەو خێرخوازانەی هەمیشە لـە خـەمی هـەژاران و کـەم دەسـتانی شارۆچـکەکەیدا بـوو باسـی چـەند خێزانێکـی هەژاری بۆ "مەنسوور" کرد و داوای لێکرد بە پێی توانا دەست گرۆییان بکـات ، " مەنـسوور " داوای لـە دۆسـتانی کـرد هـەموو ئـەو خانـەوادە هـەژار و دەسـت کورتانەی بۆ دیاری بکەن تاکو بتوانێت کۆمەکییەکیان پێ بکات ، هەرکـەس لـە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

جێگەی خۆیەوە ناوی کۆمەڵێك خێزانی هەژاریان ناونووس کرد و پلەی هەژاری و ژمارەی خێزانیان دیاری کرا و "مەنسووری عەتتار" پارمەتییەکانی بۆ دیاری کردن و داوای لە کاك "عەبدوڵلا" کرد هەموو مانگێك کەسێك بنێرێتە لای و ئەو کۆمەکیانە وەربگرێت و لە رێگەی ئەو پیاوە خێرخوازەوە پێیان بدات...

"موهتەدا" لە ماڵی کاك "عەبدوڵلا" وە داوای مۆڵەتی لە بابی کرد و جارێکی تر بەرەو لوتکەی چیاکە و دارستانە چڕ و پڕەکە بەرێ کەوتەوە ، لەگەڵ نزیکبوونەوە لە دارستانەکە هەنگاوەکانی خێراتر دەبوو ، دەتوت لەسەر سەکۆیەك وەستاوە و زەوی بە ژێر پێیەکانیدا گوزەر دەکات ، ئەو هەستی بە ماندو بوون نەدەکرد ، هەناسەدانی زۆر ئاسایی بوو، سەوزی دارستانەکە لەبەر چاوی شەپۆلی دەدا ، شەپۆلێك پەلی بۆ "موهتەدا" دەهاویشت و دەتوت داوای لێ دەکات بچێتە باوەشیەوە ، زۆری نەبرد شەپۆلی دارستانەکە "موهتەدا"ی لە ئامێز گرت و بردیە ناو هەناوی خۆیەوە، لەگەڵ کەوتنە نێو دارستانەکە "موهتەدا" شتەکانی دەور و بەری لێ بوو بە جیهانێك کە پێشتر شێوەیەکی لەو جۆرەی بە چاوان نەبینی بوو ، رەنگەکان هەزار رەنگ بوون ، سپی تیایدا تەختی ئەو مەملەکەتەی داگیر کرد بوو ، ئاوازێکی ئەفسووناویی لە تان و پۆیەکانی ئەو فەرشە هەزار رەنگانەوە هەڵدەقووڵی و مرۆڤی بەرە و کەنارەکانی مەست بوون پەلکێش دەکرد، لە ناکاو بۆنێکی دڵڕفێن کەوتە بەرهەستی و لە جێگەی خۆیدا کەوتە باڵەتەپە و وردە وردە جەستەی گۆڕا بە پیرە دارێك کە رەگ و ریشاڵی بە هەزاران پێ بە ناخی زەویدا رۆچوو بوو ، پەل و پۆیەکانی لە فەزادا پەرش و بڵاو بوو بوون ، جەستەی بە ملیۆنەها گەڵای سەوز داپۆشرا بوو ، سەرجەم درەختەکانی دارستانەکە لە شەپۆلە فرە رەنگەکانەوە بوونەوە بە درەخت ، درەختەکان بە دەوری ئەو پیرە درەختەدا کە "موهتەدا" بوو کەوتنە سەما و سوڕانەوە ، دیار بوو "موهتەدا" شای درەختان بوو ، بەڵکو شای دارستان بوو ، ئەو کاتێك سەرنجی درەختەکانی دەدا ئەوەی لە یاد بوو کە "موهتەدا"یە و جەستەی بۆ پیرە درەختێك گۆڕاوە ، درەختەکان لە سەما کردن بەردەوام بوون ، تا دەهات خێراتر دەبوون ، پیرە درەختیش لەگەڵ ئەوان کەوتە سە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خولگەیەكی بەریندا بە خێرایی دەسوڕایەوە ، چەقی خولگەكە پیرە دارەكە بوو ، لەگەڵ هەر سوڕانەوەیەكدا شەپۆلێك لە نووری سەوز دەردەپەڕی و هەموو ئاسۆكانی گەردوونی سەوز و ڕۆشن دەكرد ، سوڕانەوەی خێرا نێوانی درەختەكانی كەمتر دەكردەوە ، هەر هەموویان ئاوێزانی پیرە درەختەكە بوون ، یەكێك پێی دەوت : بابە ، یەكێك باپیر ، یەكێك بابە گەورە ، یەكێكی تر باپیری مەزن ، هەر یەكێك بە ناوێك بانگی دەكرد ، پیرە درەختەكە ئادەمی هەموو درەختەكانی تر بوو ، لە پشتی ئەوەوە هاتبوونە دەرەوە و لەوەوە سەرچاوەیان وەرگرت بوو ، درەختەكان بە لێشاو خۆیان دەكرد بە جەستەی پیرە درەختەكەدا ، ئەم كارەیان بەردەوام بوو تا سەرجەم درەختەكان لە جەستەی پیرە دارەكەدا بزر بوون ، خۆی بە تەنها مایەوە ، بە قووڵایی گەردووندا شۆڕ دەبوویەوە ، ئەوەندە ڕۆیشت تا لە بیری چوو ئەو درەختە یان تەنێكی بزر بووی نێو قووڵایی گەردوونە ، لە ناكاو ئاسۆ سەوزەكان بە دەركەوتن ، دارستانێكی چڕ و پڕ هاتە بەردەمی ، دوای گەڕان و وردبوونەوە بۆی دەركەوت سەرجەم ئەو دارستانە یەك درەختە و پەل و پۆی بە هەموو لایەكدا لێ داوە و پەخشی كردۆتەوە ، ڕۆیشتە بەردەمی و پرسیاری مەزنی و گەورەیی ئەوی كرد ، ئەویش بە ئاماژە داوای لێ كرد زیاتر بێتە پێشەوە ، بەرەو پێشەوە چەند هەنگاوێكی نا تاكو پەل و پۆیەكانی بەر پەل و پۆیەكانی درەختە مەزنەكە كەوت ، لەگەڵ بەریەك كەوتنیان درەختە مەزنەكە پیرە درەختەكەی گرتە ئامێز و لە ناخی خۆیدا بزری كرد ، بزر بوون توانەوەی ئەو بوو لە كۆی ئەو مانایانەی درەختە مەزنەكە لە خۆی گرت بوو ، لە سەرەتاوە وای دەزانی لە ناو ئەو درەختە مەزنەدا بوونی هەیە و نەتواوەتەوە ، بەڵام دواتر بوونی گۆڕا بۆ بوونی درەختە مەزنەكە و لە بیری چوویەوە سەرەتای ئەو چی بووە ، بەڵكو تەنها درەختی مەزن بوونی هەبوو ، لە ناكاو درەختی مەزن مانای درەختبوونی لە بیر چوویەوە ، ئەو دەیزانی هەیە ، بەڵام نەی دەزانی چی یە ، زەمەنێك لەو سەرسامی و حەیران بوونەدا ژیانی بەسەر برد ، تا وای لێ هات هەستی بە بوونی خۆی لە دەست دا و دەیزانی كە بوونی نییە ، تەمەنێكی لە نەبووندا بەسەر برد تا گەیشتە ئەو جێگەی هەست كردن بە نەبوونی خۆی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كۆتایی پێ هات و هەموو شتێك پێچرایەوە و خۆی خزانە دەریای نەبوون ، لە دەریای نەبووندا چەندە مایەوە؟ كەس نازانێت ، چونكە بوونی نەبوو تا بزانێت چەندە ماوەتەوە ، كە هاتەوە هۆشی خۆی لە دارستانی دامێنی چیایەكەدا ڕاكشاوە و سەری بە پیرە دارێكەوە ناوە ، بەلاّم كات لە خۆرئاوابووندایە ، بۆیە بە پەلە هەستایە سەر پێو بەرەو ماڵی كاك "عەبدوڵلاّ " بەرێكەوت و لەگەڵ بانگی ئێوارەدا گەیشتەوە ماڵی كاك عەبدوڵلاّ ، " نازدار " ی دایكی مەریەم هات بە پیریەوە و بۆ ژوورەوە فەرمووی لێ كرد ، "موهتەدا " پرسیاری كرد لە دایكی "مەریەم " بچمە كام ژوورەوە ، ئەویش فەرمووی لێ كرد بۆ دیوەخانەكە ، "موهتەدا " هێشتا خۆی بە پیرە درەختەكە دەزانی و پرسیاری لە دایكی "مەریەم " كرد : بلێی لەو ژوورەدا جێگەم ببێتەوە؟

دایكی "مەریەم " پێی وت : گەر پەل و پۆیەیەكانت كۆ بكەیتەوە جێگەت دەبێتەوە ، "موهتەدا" دەستێكی بەسەریدا هێنا و چووە ژوورەوە ، كاتێك ئەو گفتوگۆیە بە نێوان "موهتەدا" و " نازداری مەلەكووتی " دا تێ پەڕی "مەریەم" لەو جێگەدا وەستا بوو ، پرسیاری لە دایكی كرد: ( ئەو قسانە چی بوو بە نێوان تۆ و "موهتەدا" تێ پەڕی ؟)

دایكی مەریەم: ( "موهتەدا" شا درەختێكی مەزنە)

دیسان "مەریەم" هیچ تێ نەگەیشت و بڕیاری دا چیتر پرسیار نەكات ، چونكە وەلاّمی پرسیارەكان ئاڵۆزتری دەكرد...

" كاك عەبدوڵلاّ و مەنسووری عەتتار " لە بەیانییەوە نەگەڕا بوونەوە ، دیار بوو بۆ ژەمی ئێوارە بانگهێشتی ماڵی یەكێك لە دۆستان كرا بوون، "موهتەدا " لە ڕێگەی دایكی یەوە داوای كرد لە ژوورێكی بێدەنگدا جێگەیەكی بۆ ڕا بخەن و تاوێك تیایدا بنوێ ، ئەوانیش جێگەیەكیان بۆ ئامادە كرد و "موهتەدا " تیایدا كەوتە ناو خەوێكی قووڵەوە ، دەتوت چەند سەدەیەكە نەخەوتووە ، هەر ئەوەندە سەری نایە سەر سەرینەكە چاوەكانی ئاوا بوون و ڕۆحی جەستەی بەجێ هێلاّ و لەو دونیا بێسەر و بنەدا كەوتە باڵە تەپێ و گەردش و دەوران ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەیانی زوو بە ئاگا هات و بۆ خۆدانە بەر شەپۆلی بەرە بەیان لە ماڵی کاك "عەبدوڵلا" دوورکەوتەوە...

هەر ئەو ڕۆژە "مەنسووری عەتتار" مۆڵەتی لە کاك "عەبدوڵلا" و دۆستانی وەرگرت و بەرە و شارەکەی خۆیان لەگەڵ هاوسەرەکەی و "موهتەدا" گەڕانەوە...

پاش چەند هەفتەیەك مامۆستا ئایینییەکە لە گوندەکەی ماڵی کاك "عەبدوڵلا" وە بە سەردانی " موهتەدا " هات بۆ شار ، مزگەوتەکەی "مەلای گەورەی" دۆزییەوە و لەگەڵ "موهتەدا " چاویان بە یەکتر کەوت ، " موهتەدا " میوانەکەی بۆ ماڵەوە هێنایەوە و دوای خواردنی ژەمی ئێوارە لە دیوەخانەکە بە ئامادەبوونی " مەنسوور " ی بابی هەرسێ دانیشتن و کەوتنە وتووێژ ، سەرەتا " موهتەدا " مۆڵەتی لە بابی خواست و " مەنسوور " یش فەرمووی لێکرد و وتی: مۆڵەتی من بدەن تەنها گوێتان لێبگرم ، خۆ ئەگەر ناچاریش بم ئەوا قسەیەکم لەو نێوانەدا دەبێت...

موهتەدا ( مامۆستای بەڕێز پرسیارەکەی ئەو شەوەت دووبارە بکەرەوە)

مامۆستا ئایینییەکە — پارچە کاغەزێکی دەرهێنا کە دەقی پرسیارەکەی تیادا نووسی بوویەوە ، وتی ( دەقی پرسیارەکە وەك خۆی دووبارە دەکەوە:

مرۆڤ بە ئەقڵ و تەجروبەی کەڵەکە بوو دەتوانێت نهێنییەکانی خۆی و ژیان و گەردوون پەی پێ ببات و لەبەردەم ئەو یاسا پەی پێ براوانەدا ژیانی دونیایی خۆی ڕێك بخات ، بە جۆرێك لە ئەمڕۆدا هەموومان دان بەو نیزامە سیاسی و ئابورییەدا دەنێین کە ئەقڵی خۆرئاوا بەرهەمی هێناوە ، پرسیارەکە ئەوەیە: ئەگەر ئەقڵ ئەم دەسەڵاتەی هەبێت ، ئیتر وەحی و هاتنی پەیامە ئاسمانییەکان و ناردنی پێغەمبەران بۆچی یە و لە پێناوی چیدا بووە؟!)

موهتەدا ( سەرەتا دەبێ بزانین مێژووی ئەم زانست و تەکنۆلۆژیایەی ئەمڕۆ لە " دوو سەد" ساڵ تێناپەڕێت ، مێژووی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە سەدان جار بەرانبەر ئەو مێژوویەیە ، بۆیە مێژووی هەموو مرۆڤایەتی بەم دوو "سەد ساڵە"

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ناپیۆرێت ، لەم "دوو سەد" ساڵەشدا دەیان جەنگی خوێناوی سەری هەڵداوە و ملیۆنەها مرۆڤ بوونەتە قوربانی ، تەنها قوربانییەکانی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی بە دەیان ملیۆن کوژراو و بریندار دەخەملێنرێت ، ئەوەی قوربانییەکانی جەنگی زۆرتر و زیاتر کرد ئەو تەکنۆلۆژیایە بوو مرۆڤ دایهێنا ، ئەو شمشێری بە بۆمبی ئەتۆمی گۆڕی و لە چەند چرکەیەکدا گیانی "سەدان هەزار" مرۆڤی کێشا ، زانست و زانیاری مرۆڤ زیادی کردووە بەلاّم شەڕەنگێزییەکانی گەر زیادی نەکردبێت کەمی نەکردووە، نابێت ئەو لاپەڕە زێڕین و پرشنگدارانەی مێژووی مرۆڤایەتی لە یاد بکەین کە چەندین زانای پایە بەرز لە مەیدانی فیکر و زانست و فەلسەفەدا نەخشاندوویانە ، هەموو مرۆڤایەتی قەرزاری " لویس پاستێر" ن کە بە دۆزینەوەکانی لە مەیدانی پزیشکیدا دەیان نەخۆشی کوشندەی بنبڕ کرد و بەختەوەری بۆ مرۆڤایەتی هێنا ، بەلاّم ئەوەی "لویس پاستێر" و زانا مەزنەکانی تر دایان هێنا و دۆزیانەوە لە لایەن کۆمەڵێك مرۆڤی شەرشەنگێزەوە بەکارهێنرا و لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا قۆرغیان کردووە..

لەم دەستەکەی ترەوە هاتنی پێغەمبەران لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا کاریگەری گەورەی لەسەر تەکانی زانستی بووە ، من نالێم ئەوان زانا بوون چونکە ئەو پۆشاکە بۆ بالاّی پێغەمبەران تەسك و نەشیاوە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا هاتنی ئەوان تەکانی گەورەی کۆمەلاّیەتی و زانستنی و فیکری لێکەوتۆتەوە ، دروستکردنی کەشتییەك کە بە قەدەر ئوستولێکی زەبەلاحی سەربازی ئەمڕۆ بووە لە لایەن حەزرەتی "نوح"ە وە بۆ ئەو سەردەمە شۆڕشێکی تەکنۆلۆژی گەورە بووە ، کارە چاکسازییەکانی حەزرەتی "یوسوف" لە مەیدانی ئابووری و سیاسیدا شۆڕشێکی مەزن بووە بۆ سەردەمی خۆی ، داهێنانی پۆشاکی سەربازی لە لایەن حەزرەتی " داوود"ە وە داهێنانێکی گەورە بووە و پێشخستنێکی مەزن بووە لە مەیدانی سەربازیدا ، هاتنی حەزرەتی "عیسا" تەکانی گەورەی بە مەیدانی کاری پزیشکی داوە ، هەر بەو جۆرە شۆڕشێك بووە دژ بە زوڵم و زۆری دەسەلاّتدارانی ئایینی و سیاسی ، دەرکەوتنی حەزرەتی "محەمەد" لە نیمچە دورگەی عەرەبیدا مەزنترین شۆڕشی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئایینی بووە ، بۆیە هات...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بۆ پەوڕەوەی مرۆڤایەتی و لە دوای ئەوانیش ڕیفۆرمستە ئایینییەکان کاری گەورەیان لەسەر پەیامەکانی ئەوان کردووە..

کرۆك و گەوهەری پەیامی پێغەمبەران ڕاست کردنەوەی بیر و بینشی مرۆڤە لەمەڕ مرۆڤ و ژیان و گەردوون و خودا ، پاشان پەیوەست کردنی هەموو ئەمانە بەیەکەوە بە پەتی خۆشەویستی و تەبایی ، نابێت پێمان وابێت ئەوەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لەسەریەتی تەنها ئەقڵی ڕووت دروستی کردووە ، نەخێر ، بەڵکو پەیامە ئاسمانییەکان کاریگەری قووڵیان لەسەر ئەخلاق و کولتور و ڕۆشنبیری و عورف یاسایی بەجێهێشتووە..

پەیامە ئاسمانییەکان بۆ مرۆڤایەتی هەڵگری بەهای ڕۆحی مەزنن ، مرۆڤ بە بێ ئایین ناتوانێت خۆشبەخت بێت ، ئایینە هاوسەنگی دەخاتە ناو ژیانەوە ، ئایینە مانا بە ژیان دەدات ، ئایینە مانا بە چاکەخوازی دەبەخشێت ، ڕۆح بە بەری دادپەروەریدا دەکات ، مرۆڤ زۆرجار لە دەستی یاسا قوتاری دەبێت ، بەڵام ئایین پێی دەڵێت: ناتوانیت لە دەستی عەدالەتی خودا دەربچیت...)

مامۆستا ئایینییەکە ( لێرەدا پرسیارێکی تر دروست دەبێت: بۆچی هاتنی پێغەمبەران کۆتایی پێ هات؟)

موهتەدا ( دیاریکردنی پێغەمبەرێك و ناردنی بۆ سەر گەل و نەتەوەیەك بە بڕیاری خودا بووە نەك حەزی مرۆڤ ، بۆیە هاتن و نەهاتنی پێغەمبەران ویستی مرۆڤی تێدا نییە و تەنها بۆ ئەو دەگەڕێتەوە ، ئێستا دەچمە سەر پرسیارەکەی تۆ ، قورئان حەزرەتی محەمەد بە دوایین پێغەمبەری پەیامدار دەزانێت ، بەلآم دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە ئیمامە مەزنەکان و نوێخوازان ( المجددون ) ی ئایینی ئیسلام لە پلە و پایە و گەورەیدا هیچیان لە " ئەنبیا"ی بەنی ئیسرائیلی کەمتر نییە ، خودا چۆن بە وەحی پشتیوانی لە دایکی موسا و مەریەم و حەوارییەکانی حەزرەتی عیسا و یارانی ئەشکەوت کرد بە هەمان پێودان کۆمەکی و پشتیوانی هەموو ئەو ئیمامە مەزنانە دەکات کە بەیداخی گەشاندنەوەی پشکۆی ئایین هەڵدەگرن و گیانێکی تازە بە بەر مرۆڤایەتیدا دەکەنەوە ، ئێمە نابێت پێمان وا بێت بە مردنی حەزرەتی "محەمەد" پەیوەندی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

زەوی لەگەڵ ئاسمان پچڕا و تەنها ڕێگەی ژیری بۆ مرۆڤ ماوەتەوە ، خودا کۆمەکی و پشتیوانی خۆی بۆ دەستەیەکی تایبەت بە بەردەوامی دەنێرێت و پەیوەندی خۆی بەردەوام دەکات )

مامۆستا ئایینییەکە ( دەتوانیت بەڵگەیەکم لە قورئان بۆ ئەم قسەت پێ بدەی ؟)

موهتەدا ( مامۆستای بەڕێز چی لەم ئایەت تێدەگەیت؟ خودا کاتێك وەسفی دەستەیەك لە باوەڕداران دەکا دەفەرموێت ( أولئك كتب في قلوبهم الأيمان و أيدهم بروح منه) ، ئەوانە خودا باوەڕ لە ناو دڵیان دەنووسێت و کۆمەك و پشتیوانیان دەکات بە ڕۆحێك کە لەلای خوداوەیە..

سەرنجی ئەم ئایەتە بدە ( ينزل الملائكة بالروح من أمره على من يشاء من عباده أن أنذروا أنه لا اله الا أنا فاتقون ) ، فریشتە بە ڕۆحێکەوە کە بەشێکە لە ئەمری خودا بۆ سەر هەر بەندەیەك لە بەندەکانی دادەبەزێنێت ، بیانترسێنن هیچ خودایەك جگە لەمن نییە و خۆتان بپارێزن..

سەرنجی فەرمانی ( ينزل ) بدە کە باس لە داهاتووە و قورئانیش بۆ سەر حەزرەتی محەمەد دابەزیوە و ئایەتەکەش باسی چیرۆکی گەل و نەتەوەکانی پێشوو نییە ، دیسان سەرنجی وشەی ( من عباده ) بدە و دواتر لە مانای ( أن أنذروا ) بکۆڵەرەوە...)

"مەنسوور" ی بابی "موهتەدا " کە تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو ، هاتە دەنگ و وتی ( لەمە زیاتر مەڕۆ ، چونکە پەردە لادانە لەسەر نهێنییەك کە ئاشکرا کردنی گرفتی گەورە بۆ مرۆڤە سادەکان دەخولقێنێت)

موهتەدا ( دوایین قسەم ئەوەیە کە لە دوای حەزرەتی "محەمەد" هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدار نایەت و هەر نوێخواز ( المجدد ) ێك سەر هەڵدەدات لە ناو ئەو پەیامەدایە کە دوایین پێغەمبەر بە مرۆڤایەتی گەیاندووە ، بەڵام ئەو نوێخوازانە خاوەنی پەیامی بچووك ( الرسالة الصغرى ) ن و تەنها حەزرەتی "محەمەد " ە پەیامی مەزن ( الرسالة الكبرى ) ی پێدراوە ، لێرەوە ئەو بیرە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

چەوتەی کە مرۆڤ دایهێناوە و قۆناغەکانی بیری مرۆڤایەتییان بۆ: ئەفسانە و ئایین و فەلسەفە و زانست دابەش کردووە لە خۆیدا ئەفسانەیەکی گەورەیە و هیچ ئەرزشێکی نییە ، چونکە خودا مرۆڤ و ژیان و گەردوونی وێڵ نەکردووە و بۆ تەنها ساتێکیش لێی بێ ئاگا نابێت...)

مامۆستا ئایینییەکە ( پێم وایە دەرگایەکی فراوان و ئاسۆیەکی بەرینت بە رووم دا والآ کرد ، بەلآم پێویستم بە بیرکردنەوەی زۆرتر و زیاترە...)

مەنسوری عەتتار ( مامۆستا و زانست بۆ مرۆڤ تەنها نیشاندانی ئاسۆیەك و کردنەوەی دەرگایەکە ، خۆ گەیاندنە ئەو ئاسۆیە و تێگەیشتن لەو جیهانەی دەرگاکەی بە رووتدا والآ کراوە پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

– ١ –

# مانگی هەنگوینی و ژیانی خێزانی

"مەنسوور" لە ڕێگەی "مەعسومە"ی هاوسەریەوە وەلامی "موهتەدا"ی لەسەر داخوازیکردنی "مەریەم " بە دەست کەوت و پاش ماوەیەك لەگەڵ چەند کەسێکی تر چوونە داخوازی "مەریەم" و داوایان کرد بۆ "موهتەدا"، داواکردنی دەستی "مەریەم" بۆ "موهتەدا" جێگەی دڵخۆشی کاك "عەبدوڵلا و نازدار" ی هاوسەری بوو ، چونکە ئەوان باشترین هاوسەر و چاکترین خانەوادەیان بۆ کچەکەیان بەدەست کەوت بوو...

شەوی بووك و زاوایی "مەریەم و موهتەدا " لە شەوی بووك و زاوایی خەڵکانی تر جیاواز بوو، ئەو شەوە هەموو گیانیان بۆ پارچەیەك لە شەرم گۆڕا بوو ، هەردوو بۆ خۆ دزینەوە لەوەی ژن و مێرد لە شەوی یەکەمدا ئەنجامی دەدەن بە بەردەوامی خەریکی قسە کردن بوون ، قسەیان لەسەر هەموو شت دەکرد ، هەریەکەیان بە دوور و درێژی باسی ژیانی منداڵی خۆی کرد ، لەگەڵ یەکتر – تا درەنگانێکی شەو – سەرگەرمی قسە کردن بوون ، لە قسەکردن ماندو بوون ، دەستیان بە باوێشکدان کرد ، چاوەکانیان ئاوابوون و کەوتنە ناو خەوێکی قووڵەوە، بەیانی بە ئاگا هاتن ، لەسەرەتاوە هەندێك لە یەکتر دوور کەوتنەوە ، هەریەکەیان بوونی کەسێکی تر لە پاڵیدا ترس و داچڵەکانی بۆ دروست دەکرد ، بە تەواوی هۆشیان بەر هاتەوە و ئەوەیان بیر کەوتەوە ئەوان ژن و مێردی یەکترن ، بە یەکتری نامۆ نین ، هەریا...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بن ، دەبێ لە نێوانیاندا شەرم و شکۆ بمێنێت ، چونکە دوو مرۆڤی سەربەخۆ و جیاوازن لە یەکتری...

مانگی هەنگوینی ئەو دوو مرۆڤە نامۆیە بە قسە کردن بەسەر چوو ، دایکی "مەریەم" و دایکی "موهتەدا" بۆ ئەو بارە نا سروشتییەی نێوان "مەریەم و موهتەدا " کەوتنە ڕاوێژ و بیرکردنەوە ، لە سەرەتاوە پەنایان بۆ نزا و پاڕانەوە برد...

پاشان لە یەکێ لە دیدەنییەکانی "مەریەم" بۆ ماڵی باوکی ، دایکی مەریەم کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ مەریەم و پرسیاری ژیانی ژن و مێردی لێ کرد ئەویش لە وەڵامیدا وتی: ( ئێمە هەموو شەوێك تا درەنگانێك تەنها باسە ڕۆحانییەکان بە نێوانماندا تێدەپەڕێ و هیچ کامێکمان بیرمان لە شتی تر نەکردۆتەوە ، بەڵکو حەز ناکەین هیچی تر بە نێوانماندا تێپەڕێت...)

دایکی مەریەم باسی ژیانی ژن و مێردی بۆ "مەریەم" ی کچی کرد ، ئەوەی بۆ باس کرد کە ژن و مێرد تەنها قسەکردن بە نێوانیاندا تێناپەڕێت ، بەڵکو پێویستە مافی یەکتری بدەن...

مەریەم پرسیاری کرد: ( مافی یەکتری چی یە؟ ئێمە یەکترمان خۆش دەوێت و لە یەکتری ڕازین و زوڵم و زۆر لە یەکتری ناکەین )

دایکی لە وەڵامیدا وتی: ( ئێوە دەبێت منداڵتان ببێت)

– : ( ئەگەر خودا بیەوێت منداڵیشمان پێ دەبەخشێت )

+ : ( کچم گەر تۆ و "موهتەدا " ئەو کارە ئەنجام نەدەن منداڵتان نابێت و هەردووکتان عەیبدار دەبن بە تایبەت "موهتەدا"ی هاوسەرت )

– : ( بۆچی عەیبدار دەبین ؟!)

+ : ( ئەگەر پیاوێك نەتوانێت بڕواتە لای هاوسەرەکەی لە لای خەڵکی بە چاوی ناتەواو سەرنج دەدرێت و پێی دەڵێن : ئەو کەسە پیاو نییە ، لەم لاشەوە خەڵکی هەزار ناو و ناتۆرە بۆ تۆ دروست دەکەن..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

— : ( من دەبێ چی بکەم ؟)

+ : ( تۆ دەبێت ئەم شتانە بۆ "موهتەدا " باس بکەیت ، زیاتر لە "موهتەدا " نزیك ببیتەوە ، ئێوە هاوسەری یەکترن ، خودا ئێوەی بە چەند کەلیمەیەك بۆ یەکتر حەلاڵ کردووە ، ئافرەت دەبێ گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بێت ، گەر دەتەوێت خودا لە خۆت ڕازی بکەیت داوا ڕەواکانی هاوسەرەکەت جێبەجێ بکە..)

— : ( بەڵام ئەو هیچ داوایەکی لە من نییە ؟! )

+ ( لەوانەیە ئەو پیاوێکی شەرمن بێت ، بەڵام تۆ نابێ وابیت )

"مەریەم " بێدەنگییەك داگیری کرد و پاشان هەستا و دایکی بەجێهێڵا...

"مەنسوور" لە ڕێگەی " مەعسومە " ی هاوسەریەوە بە حاڵەتەکەی " موهتەدا " و "مەریەم" ی زانی بوو ، بۆیە بۆنێکی زۆر تایبەتی بۆ دروست کردن و دای بە " مەعسومە " تا بە مەریەمی بگەیەنێت ، ئەویش بۆنەکەی بە مەریەم دا و داوای لێکرد شەوانە لە خۆی بدات...

لە یەکێك لە شەوەکاندا "مەریەم" بۆنەکەی بەکار هێنا و قسەکانی دایکی بۆ " موهتەدا " گێڕایەوە ، ئەویش لە وەڵامیدا وتی: ( من هەموو ئەو شتانە دەزانم ، کەسێکی نەزان نیم ، مەدرەسەی زانستە شەرعییەکان و زانکۆشم تەواو کردووە ، بەڵام لای من نزیك بوونەوەی پیاو لە ئافرەت ، یاخود بە پێچەوانەوە تەنها لەباری پێویستیدایە ، من ئەم ماوەیە کە لەگەڵ یەکتر ژیاوین هیچ پێویستییەکی جەستەیم بەو نزیکبوونەوەیە نەبووە ، وام هەست دەکرد تۆش هەروەکو من وابیت ، بۆیە لەو بارەیەوە هیچ بە نێوانماندا گوزەری نەکردووە )

مەریەم: ( منیش هەروەك تۆ وام ، بەڵام با قسە و باسی خەڵکی لەسەر خۆمان لابەین ، لە زۆر لاوە خزمان و دەورو بەرمان قسە لەسەر من و تۆ دەکەن ، هەندێکیان بە خەمخۆری و هەندێکی تریان بۆ تانە و توانج ، هەردوو — بۆ دایك و باوکمان — بووین بە گیروگرفت...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کە گەیشتنە ئەو بڕیارە جەستەی ئەو دوو فریشتەیە کەوتە لەرزین و ئارەق کردنەوە ، هەموو بوونیان بوو بە تنۆکێك لە شەرم :

دەرگا و پەنجەرەکانیان کلۆم دەکرد ، پەردەیان دادەدایەوە ، گڵۆپەکانیان خامۆش دەکرد ، پاشان گڵۆپەکەیان پێ دەکردەوە و هەریەکەیان چەند قومێك ئاوی دەخواردەوە ، گڵۆپەکەیان دەکوژاندەوە ، دواتر بۆ هێنانی بەتانییەکی پان و پۆڕ گڵۆپەکەیان هەڵدەکردەوە ، "مەریەم" بەتانییەکەی بەخۆیدا دەدا و "موهتەدا" گڵۆپەکەی دەکوژاندەوە ، لەسەر جێگەکە ڕاست بوونەوە و بەتانییەکەیان لەسەر خۆیان لادا ، مەریەم دەیوت: ئەم بەتانییە زۆر گەرمە با بەتانییەکی تەنك تر بهێنم ، دیسان گڵۆپەکەیان هەڵدەکردەوە ، بەتانییەکەیان دەگۆڕی ، "موهتەدا" خۆی بە بەتانییەکە دادەپۆشی و "مەریەم" گڵۆپەکەی دەکوژانەوە ، خۆیان لە ژێر بەتانییەکە دەنا ، ماوەیەك بێدەنگ دەبوون ، "موهتەدا" دەیوت: تەقەیەك کەوتە بەر گوێم پێدەچێت پشیلە بۆ کەنارییەکان هات بێت ، هەڵدەستا و گڵۆپەکەی پێدەکردەوە و دەچووە دەرەوە و تاوێك بە حەوشەکەدا دەسوڕایەوە و پاشان دەهاتەوە و دەیوت: دەنگی هیچ شتێك نایەت ، "مەریەم" دەیپرسی سەیری ژوورە بچووکەکەی ئەو لات کرد؟ "موهتەدا" دەیوت: نەخێر ، چاکتر وایە سەیرێکی ژوورەکەش بکەم ، پیاسەیەکی تری بەناو ژوور و حەوشەکەدا دەکرد و دەهاتەوە ژوورەوە و دەیوت: لەم ڕۆژانەدا پشیلە زۆر بووە ، زۆر کەس دەڵێن باڵندە و پەلەوەرەکانی ماڵەوەمان خوراوە ، گڵۆپەکەی دەکوژاندەوە و تا دەگەیشتەوە سەر جێگەکەی و پاڵ "مەریەم" ی هاوسەری چەند سەرسمێکی دەدا ، مەریەم دەیوت: یا اللە ، ئازارت نەگەیی؟ )

موهتەدا: ( تۆزێك پەنجە گەورەم ئازار دەکات )

"مەریەم" گڵۆپەکەی دەکردەوە و سەیری پەنجە گەورەی "موهتەدا" ی دەکرد و هەندێك دەیشێلا ، پاشان دەیوت: ( تۆ بچۆ ژێر بەتانییەکە من گڵۆپەکە دەکوژێنمەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەم جارەیان "مەریەم " شوێنەکەی خۆی لێگۆڕا و بەسەر "موهتەدا" بەر بوویەوە ، "موهتەدا" دەیویست لە جێگەکەی خۆی ڕاست ببێتەوە ، بەلاَم نەیتوانی ، چونکە "مەریەم" بەسەریدا کەوت بوو ، پرسیاری لە "مەریەم" کرد: ( ئازارت نەگەیی؟)

مەریەم: ( نەخێر )

بەو دونیا شەرمەوە سەرەتای ژن و مێردی " مەریەم و موهتەدا " دەستی پێکرد...لە دوای ئەو شەوە پڕ لە شەرم و تەریقبوونەوەیە چەند هەفتەیەکی تر بە نێوانیاندا گوزەری کرد بیّ ئەوەی هیچ یەکێکیان بیانەوێت شەوێکی تری پڕ لە شەرمەزاری وەك ئەو شەوە بە نێوانیاندا تێبپەڕێت ، ئەوان بەو کارەیان دەمی خەڵکیان بەست و قسەو باسیان کۆتایی پیّ هێنا ، دایکی "مەریەم و موهتەدا " دونیایەك ئاسودەیی ڕووی تێکردن ، نەیاندەویست منداڵەکانیان بە ناتەواو بکەونە بەرچاوانی مەردوومان ، شوکر بۆ خودا خودا ئەو گرێیەی دەروونیانی کردەوە و تەم و مژێك کە لەسەر ئەو ژن و پیاوە گەنجە بوو ڕەوییەوە...

"مەریەم" زۆربەی کاتەکانی بە خوێندنی قورئانەوە بەسەر دەبرد ، خوێندنی قورئان تێکەڵ بە خوێن و دەمارەکانی بوو بوو ، شەوان بۆ خوێندنی قورئان هەڵدەستا ، بە دەنگێکی ئارامی پڕ لە غوربەت کە لە دەنگی بولبولێکی بەندکراو دەچوو قورئانی دەخوێند ، ئەو لەسەر یەك بەیەکی ئایەتەکان دەوەستا و دووبارە و سێبارەی دەکردنەوە ، هەندێك ئایەت چاوەکانی پڕ دەکرد لە ئاو و بە ئارامی فرمێسکەکانی لە چاوانی هەڵدەوەراند ، هەندێك لەو شەوانە خەوی لە "موهتەدا" دەتۆراند و ئەویش لەسەر جێگەکەی هەڵدەستا و دەستنوێژی دەشۆری و دەهاتە پاڵ "مەریەم" و گوێی لە خوێندنی قورئانەکەی دەگرت ، "موهتەدا " بە گوێگرتن لە "مەریەم" دەکەوتە باڵەتەپە و وەك چۆلەکەی سەربڕاوی لێدەهات و زۆرجار لەگەڵ بانگی بەیانیدا بە هۆش دەهاتەوە....

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ساڵێك لە ژیانی ژن و مێردایەتی "مەریەم و موهتەدا" بەو شێوەیە تێپەڕی ، دایکی "مەریەم" پرسیاری منداڵی دەکرد ، "مەریەم" یش لە وەلأمیدا دەیوت : خودا نایدات...

"مەریەم و موهتەدا " لەو باوەڕەدا بوون کە تەنها بۆ دروستبوونی منداڵ و لە کاتی پێویستی جەستەیاندا پێویستە لە یەکتری نزیك ببنەوە ، هەردوو وایان دەزانی بە نزیکبوونەوەی یەکەمین شەویان لە یەکتری گەر خودا بیەوێت منداڵیان پیێ دەبەخشێت ، کە منداڵیان نابێت خودا نایدات و دەستی ئەوانی تێدا نییە...

ڕۆژێك "موهتەدا " لە "مەریەم" ی پرسی: ( مەریەم ، من بۆ خۆم پێویستی جەستەیم زۆر کەمە ، بۆیە لە تۆ نزیك نابمەوە ، بەلأم ناشمەوێت مافی تۆ بخۆم و تەنها بە ویستی خۆم بکەم ، چونکە تۆ هاوسەری منی ، خۆشم دەوێیت ، شەوێك لەگەڵم نەبیت هەست بە تەنهایی دەکەم ، کاتێك ئاسوودەم لە تەنیشتی تۆوە دادەنیشم ، تۆ هاوسەر و هاودەمی ژیانی منی...)

مەریەم: (موهتەدای خۆشەویستم ، من نازانم چۆن خۆشەویستی خۆمت بۆ دەربڕم ، هەمیشە ئاواتم بوو خودا کەسێکی وەکو تۆ بە هاوسەرم بکات ، من کە مێردم بە تۆ کرد وام هەست دەکرد جارێکی تر لە دایك بوومەتەوە ، منیش ماوەیەکە دەمویست لەسەر ئەو مەسەلەیە قسە و گفتوگۆت لەگەڵ بکەم ، من بۆخۆم حەزی جەستەییم کز و لاوازە ، بەلأم هەموو جەستەم بۆ تۆیە ، نامەوێت تۆ لەخۆم بێبەش بکەم ، تۆ پیاویت ، پیاو وەکو ئافرەت نییە ، با لای خودا بەرانبەرت گوناهبار نەبم ، تکا دەکەم شەرم نەتگرێت و حەزی پیاوەتی خۆت جێبەجێ بکە ، من حەلأڵی تۆم ، دایك و باوکمان گەر لە یەکتری نزیك نەبوونایەتەوە من و تۆیان نەدەبوو ، پێغەمبەران گەر ئەو سوننەتەیان جێبەجێ نەکردبایە منداڵ و وەچەیان نەدەخستەوە ، من و تۆش مرۆڤین لە پێغەمبەران و دایك و باوکمان چاکتر و پاکتر نین..)

موهتەدا: ( مەریەم گیان ، من هەموو ئەوانە دەزانم ، تۆ بە حەلأڵی خۆم دەزانم ، خۆشەویست و هاوسەری تەمەنمی ، بەلأم من هیچ حەزێکم نییە ، وا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەست دەکەم ئەو حەزە تیامدا زۆر کز و لاوازە ، من تەنها خەمی تۆمە ، باسەکەشم بۆ ئەوە بوو ماف تۆ نەخۆم ، تووخودا "مەریەم" شەرم مەکە و گەر دەزانیت مافت دەخۆم ئاگادارم بکەوە...)

"مەریەم" لێی کردە شۆخی و وتی: ( جا ئەگەر تۆ هیچ حەزێکت نەبێت با منیش بڵێم ماف منت خواردووە ، سوودی چییە ؟!)

موهتەدا — بە پێکەنینەوە —: ( بڵێی ماف تۆم پێنەدرێت ؟!)

خەندەیەکی پڕ لە شەرم کەوتە سەر لێوانی "مەریەم" و وتی: (پێوتن و قسە کردن دەربارەی ئەو مافە — بۆ ئافرەت — زۆر گرانە ، پیاو زۆرتر لەو کارە بەرپرسیارە...)

ئەم دوایین قسەی "مەریەم" ئەوەی دەگەیاند کە حەزێکی جەستە لە ناخیدا بوونی هەیە ، بەلام زۆریش داگیری نەکردووە و باکێکی پێی نییە ، وەلێ گەر "موهتەدا " بیەوێت دەتوانێت ئەو حەزەی "مەریەم" بوروژێنێ و تێری بکات....

"موهتەدا " زۆر لە ئاماژەکەی "مەریەم" نەگەیشت ، وایدەزانی "مەریەم" لەو کارە خۆی دەدزێتەوە ، بۆیە باسەکەی گۆڕی و پرسی: ( کەی حەز دەکەی سەفەرێکی ماڵی بابت بکەیت ؟)

مەریەم: ( کەی تۆ مۆڵەتم بدەی )

موهتەدا: ( هەفتەی داهاتوو خوێندنی قوتابخانە تەواو دەبێت و گەر باوك و دایکم مۆڵەتمان بدەن دەتوانین سەردانێکی ماڵی باوکت بکەین )

مەریەم: ( یانی تۆش لەگەڵم دێیت ؟!)

موهتەدا: ( گەر کارێکی زەروور نەیەتە پێش ئەمجارەیان بۆخۆم لەگەڵت دێم ، پێت خۆشە هاوسەفەرت بم ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەریــەم: ( تــەنها بـۆ ســەفەری مــەرگ حەزناکــەم لەگــەڵم بیــت ، چــونکە حەزدەکـەم خـودا مـەرگم پـێش مـەرگت بخـات ، ئـەگینا پێمخۆشـە شـەو و ڕۆژ لەگەڵت بم )

ژیانی ژن و مێردی "موهتەدا " و "مەریەم" لەسەر تەرزی جـارانی بـەردەوام بوو ، خۆشەویستی بە بێ حەزی جەستە و نزیك بوونەوە لە یەکتری ، هەندێك لە شەوانی زستان "موهتەدا " بە ئاگا دەهات و دەیبینی هەموو لەشـی بـە ئـاوێکی لینج تەڕ بووە ، دیار بوو خەونی بینیوە و لەو خەونەدا خۆی خاڵی کردۆتـەوە ، کاتێك ئەوەی بەخۆیەوە دەبینی هەستی گوناه و شەرمەزاری داگیری دەکرد ، بە ئەسپایی هەڵدەستا و دەچووە حەمامەکە و لە جێگەی ئاوی گەرم ئاوی سـاردی بۆ خۆشۆرین بەکار دەهێنا و سزای جەستەی خۆی دەدا ، پاشـان بـە بێـدەنگی دەهاتەوە ناو جێگەکەی تاکو "مەریەم" بە ئاگا نەیەت و بە حاڵی ئەو نەزانێت ، بەلاّم "مەریەم" لە ناو جێگەکەوە چاودێری ئەوی دەکرد و بـە ئاگـا بـوو لـەوەی چی لە "موهتەدا " ڕووی داوە ، سەیر لەوەدا بـوو هەنـدێك لـەو شـەوە سـاردانە دووجار و سێ جار دەبوا خۆی بشۆردبایە و هەموو جارەکانیش بـە ئـاوی سـارد سزای خۆی بدابایە ، "مەریەم" بۆ ئـەو حاڵـەی "موهتـەدا " هەسـتی بـە گونـاه دەکرد ، بەلاّم وای نیشان نـەدەدا بـە حـاڵی ئـەو ئاگـادارە ، شـەرم ڕێگـەی پـێ نەدەدا لەو بارەیەوە بۆ "موهتەدا " قسە بکات...

شەوێك پێی لە جەرگی خۆی ناو وتی: ( ئەم شەو زۆر ساردە ! )

موهتەدا: ( گەرم خۆت داپۆشە با سەرمات نەبێت )

– : ( سەرماکەی لە ڕادە بەدەرە ! )

+ : ( بچم بەتانییەکی زیادەت بۆ بهێنم ؟ )

– : ( نا ، زەحمەت مەکێشە.... شەوانی سارد چیرۆك گێڕانەوە زۆر خۆشە ، چیرۆکێکت لە یاد نییە بۆم بگێڕیتەوە ؟ )

+ : ( ئێستا شتێکم لە یاد نییە ، تۆ ش ... ؟ )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

— : ( بڵێم چی؟ چیرۆکێکم دێتەوە یاد ، کاتی خۆی داپیرەم بۆی دەگێڕاینەوە ، بەڵام هەندێکیم لە بیر ماوە)

+ : ( ئەوەی لە بیرت ماوە بیگێڕەرەوە)

— : ( با بیربکەمەوە بزانم لە چییەوە داپیرە دەستی پێ دەکرد ، ئا دەیوت: کاتی خۆی ژن و پیاوێك زۆر یەکتریان خۆش ویستووە ، پیاوەکە حەزی دەکرد شەوان بە تەنها بنوێت و ژنەکەش بە پێچەوانەوە حەزی دەکرد لە پاڵ هاوسەرەکەیدا و لەسەر یەك نوێن ڕۆژ بکەنەوە ، چەندین جار ژنەکە ئەم داوایەی لە مێردەکەی دەکرد ، بەڵام ئەو داوای لێبووردنی دەکرد و دەیوت: لە منداڵییەوە وا ڕاهاتووم ، تەنانەت دایکم دەیوت : لە باوەشی ئەویشدا ئۆقرەم نەگرتووە...

ژنەکە ماڵیان لە وڵاتێکی تر دەبێت ، وەرزێکی زستان پیاوەکە دەیەوێت ژنەکەی بۆ ماڵی بابی بباتەوە ، لە ڕێگە بەفر و کرێوە لێیان هەڵدەکات و ڕێگەیان پێدەگرێ و ناچاریان دەکات لابدەنە ئەشکەوتێك ، ئەشکەوتەکەش زۆر سارد دەبێت ، هەردوو لە ناویدا هەڵدەلەرزن ، پیاوەکە دەڵێت: ئافرەت با لە پاڵ یەکتردا دابنیشین بۆ ئەوەی یەکتری گەرم بکەینەوە ، ژنەکە و پیاوەکە دەچنە پاڵ یەکتر و بە یەکترەوە دەنوسێن ، ماوەیەك دەستەکانی یەکتر بە فوو گەرم دەکەنەوە و ماوەیەکیش سەر دەنێن بە لای یەکترەوە )

"مەریەم" قسەکانی زۆر بە هێواشی دەکرد ، دیار بوو چیرۆکەکە خۆی دروستی کرد بوو ، بەڵام بە ناوی داپیرەوە دەیگێڕایەوە ، بۆیە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە دوا دەکەوت ، چونکە دەبوا لە زەینیدا ڕووداوەکانی ڕێك بخستبایە ، کە مەریەم لە قسە کردن درەنگ دەکەوت موهتەدا دەیوت: ( ئێ ؟! )

مەریەم: ( پاشان پیاوەکە پشت بە ئەشکەوتەکەوە دەنێت و ژنەکەی لە باوەش دەگرێت ، ژنەکە پرسیار لە پیاوەکەی دەکات: پیاوەکە ئێستا خۆشترین شتێك ئاواتی بۆ بخوازیت چییە؟ پیاوەکە دەڵێت: ئێستا خۆشترین شت لە لام جێگەیەکی دوو کەسیی گەرمە کە پێکەوە و لە ژێر یەك بەتانی ڕاکشابین ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ژنەکە وتی: بەڵێنم پێدەدەی گەر ڕزگارمان بوو نوێنێکی دوو کەسی بە دروست کردن بدەی ، تا مردن پێکەوە لەسەری بنوین؟ پیاوەکە وتی: بەڵێن بێت ، خودا وای هێنا کاروانییەك بەو ڕێگەدا تێپەڕی و ژن و پیاوەکەیان ڕزگار کرد)

موهتەدا: ( پیاوەکە بەڵێنەکەی بردە سەر؟)

مەریەم: ( بەڵێ ، بەڵێنەکەی بردە سەر ، بەڵام کە هاوین هات وتی: ئافرەت تۆ بەڵێنی زستانت لێ وەرگرتووم ، بۆیە هاوینان گەرمە و چاکتر وایە دوور لە یەکتری بنوین )

موهتەدا: ( ئەی فێڵبازی بەڵێن شکێن! )

"مەریەم" پێکەنینێکی بۆ کرد ، پێکەنینەکەی مەریەم بۆ ئەوە بوو کە موهتەدا قسە بە خۆی دەڵێت ، چونکە لە زەینی مەریەمدا کارەکتەری پیاوەکە "موهتەدا" یە ، لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی خۆی بەردەوام بوو: پاش چەند ساڵێکی تر بڕیاریاندا سەفەرێکی تری ماڵی بابی ئافرەتەکە بکەن ، وەرزەکەی هاوین بوو ، لە ڕێگەدا گەیشتن بە دەستەیە چەتە ، سەرۆکی چەتەکان وتی: ئێمە یاسامان وایە ئەگەر لە وەرزی هاویندا ژن و پیاوێك بگرین پیاوەکە دەکوژین و ژنەکە ڕزگار دەکەین مەگەر ژنەکە داوای لێبوردن بۆ مێردەکەی بکات ، خۆ ئەگەر لە وەرزی زستاندا بیانگرین ژنەکە دەکوژین و پیاوەکە ڕزگار دەکەین مەگەر پیاوەکە داوای لێبوردن بۆ ژنەکەی بکات ، ئێستا لە یەکتر جیا ببنەوە...

ژن و پیاوەکە لە یەکتر جیابوونەوە و پیاوەکە تکای لە ژنەکەی کرد داوای لێبوردنی بۆ بکات ، ئەویش وتی: ئەگەر بەڵێنم پێ دەدەی جێگەم لێ جیانەکەیتەوە ، ئەوا داوای لێبوردنت بۆ دەکەم ، پیاوەکە وتی: بەڵێن بێت ، لە دەستی چەتەکان ڕزگاری بوو ، ئەو هاوینە پێکەوە نووستن و پایز بە دوایدا هات ، پیاوەکە وتی: ئێمە بەڵێنمان تەنها هاوین بووە نەك پایزیشی لەگەڵ بێت ، بەوجۆرە پایز جێگەی لە ژنەکەی جیاکردەوە ، پاش ماوەیەکی تر وەرزی بەهار هات و بڕیاریان داپێکەوە گەشتێکی چیاکە و دارستانە چڕ و پڕەکە بکەن

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

، ئـەو ڕۆژە تـا دوانیـوەڕۆ زۆر بەخۆشـی بەسـەریاندا تێپـەڕی ، پیـاوێكی ڕیش سپییان لە دارستانەكە پێگەیشت و سەیرێكی ئافرەتەكەی كرد و وتـی: تـۆ زۆر میهرەبانی، مێردەكەی خۆتت خۆش دەوێت ، بۆیە لە پاداشتی ئەوەدا خودا دوو داوات لیّ قبوولّ دەكات ، بەلاّم ئاگاداربە و بزانە نزاكانت چۆن بـەكار دەهـێنی ، پیرەمێردەكە ئەمەی وت و لەبەرچاوان ون بوو ، لەگەلّ ونبوونی پیرەمێردەكـەدا پیاوەكە تكای لە ژنەكەی كرد یەكێك لە دوعاكان بۆ دەولّەمەندی بـەكار بهێنێـت ، ئەویش وتی: ئاخر دەبیّ بەلّێنم پیّ بدەی هەر چوار وەرزەكە لێم جیانەبیتەوە و بیـانوو دروسـت نەكـەیت ، پیاوەكـە وتـی بـەلّێن بێـت ، ئافرەتەكـە دوعـای دەولّەمەندی كرد و پـاش ماوەیـەكی كـەم خەزنەیـەكی زێڕیـان لـە زەویەكەیانـدا دۆزییەوە و زۆر پێی دەولّەمەند بوون ، پیاوەكە ناوبانگی دەركرد و هەسـتی بـە گـەورەیی خـۆی كـرد ، پاشـان بڕیـاری دا ژنێكـی تـر بهێنێـت ، چـونكە زۆر زۆر دەولّەمەند بوو بوو ، ژنەكە وتی: تۆ بەلّێن دەشكێنی، چـونكە هەنـدێك شـەو لـە من جیا دەبیتـەوە و دەچیت بۆ لای ژنەكـەی تـرت ، پیاوەكـە وتـی: مـن و تـۆ بەلّێنمان لەسەر چوار وەرزە بـووە نـەك هـەموو شـەوێك ، هـەركاتێك لەگـەلّ تـۆ بمێنمەوە لە هەر وەرزێكدا بێت جێگەمان پێكەوە دەبێت ، ژنەكـە هەسـتی كـرد پیاوەكەی دەیەوێت ستەمی لیّ بكات ، بۆیە هەڕەشەی لە پیاوەكەی كرد و پێی وت: لـە بـیرت نەچـێت نزایـەكی تـرم بـە دەسـتەوە مـاوە ، پیاوەكـە ئەوەنـدە دەولّەمەند بوو بوو لە نزا نەدەترسا و باكێكی بە كەس نەما بوو ، ئـەو لـە بـیری چوو بوو خودا بە دوعای ژنەكەی دەولّەمەندی كرد ، هـەموو جارێـك بـیّ منـەتی خۆی دەردەبڕی و دەیوت: ئەو خەزنەیە لە زەوی باب و باپیرمدا بووە و چەندین جار بابم باسی لە بارەوە كردووە و هـیچ پەیوەنـدی بـە نـزا و پاڕانـەوەی تـۆوە نییە ، ژنەكە ئەم هەلّوێستەی مێردەكەی زۆر لا گران بـوو ، بۆیـە ڕۆیـشتەوە بـۆ ناو دارستانەكە و لە خودا پاڕایەوە تاكو پیرەمێردەكـەی بـۆ ڕەوانـە بكـات ، لـە ناكاو پیرەمێردەكە دەركەوت و ژنەكە سكالاّی خۆی بـردە لای و داوای لـیّ كـرد تەگبیرێكی بكات ، پیرەمێردەكە پێی وت: دوعایەكت لە دەسـتدا مـاوە و ئەگـەر بزانیـت چـۆن بـەكاری بهێنیـت خـودا داوای سێیەمیـشت لـیّ قبـولّ دەكـات ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئافرەتەکە وتی: چۆن ئەو دوعایە بەکار بهێنم؟ پیرەمێردەکە وتی: ئەوەیان تۆ دەیزانی و من ناتوانم لە جێگەی تۆ بڕیار بدەم...

ئافرەتەکە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە و کەوتە بیرکردنەوە لە بەکارهێنانی نزایەکەی ، سەرێك دەیوت: دوعا بکەم ئەوەندە جوان ببم هەرچی ئافرەتی دونیایە لە بەرچاوی هاوسەرەکەم هەڵبخەم ، دواتر بیری دەکردەوە دوعا لە مێردەکەی بکات و لە جێگەدا بیخات و لە بەردەستیدا کەسیف ببێت ، ئەوجا بیری دەکردەوە داوا بکات ئەوەندە دەوڵەمەند ببێ لە مێردەکەی زیاتر ناو و ناوبانگ دەربکات ، سەرێکیش دەیویست داوا بکات خودا هەموو ماڵ و سامانەکە لە مێردەکەی وەربگرێتەوە، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر بڕیاری دا نزایەکەی لە هیچ کام لەوانەدا بەکار نەهێنێت ، ئەی لە کوێدا بەکاری بهێنێت؟ بیری کردەوە هەموو ئەوانە کاتین و کۆتاییان پێ دێت ، چاکتر وایە دوعایەکەی لە ڕەزامەندی خودا دا بەکار بهێنێت ، بۆیە دەستی بۆ لای خودا بەرزکردەوە و وتی: ئەی خودایە ، تۆ خودای منی ، من بەندەی تۆم و تۆ دروستت کردووم ، لە قاپی ڕەحم و بەزەیی تۆ داوامە خۆشەویستی خۆت لەناو دڵمدا دابنێیت و لە هەرچی دروستکراوی خۆتە بێنیازم بکەیت ، خودایە ئەم داوایەم بە گەورەیی خۆت لێ وەربگرە...

هەر ئەو شەوە سینە و دڵی ئەو ئافرەتە خوداناسە بە خۆشەویستی خودا لێوان لێو بوو ، پاش ماوەیەك پیاوە ڕیش سپییەکە سەردانی کرد و وتی: ئافەرین کچم ، داوایەکەت لە جێگەی خۆی بەکارهێنا ، تۆ داوای خۆشەویستی خودات کرد ، خوداش خۆشەویستی خۆی پێداوی ، بۆیە ئەوەی چاوی بە تۆ بکەوێت بەهۆی خۆشەویستی خوداوە تۆی خۆشدەوێت بە تایبەت هاوسەرەکەت ، مژدەت لێ بێت لێرە بەدواوە داوایەکانت لەلای خودا ناگەڕێنەوە و هەمووی لەلای ئەو قبوڵە...

بە ماوەیەکی کەم مێردەکەی هاتە سەردانی و داوای گەردن ئازادی لێ کرد و بڕیاری دا تەنها هاوسەری تەمەنی ئەو ئافرەتە خوداناسە بێت و نیوەی سەروەت و سامانەکەشی بۆ ئەو بێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( چەند چیرۆکێکی خۆش بوو پێموایە ئەو شەوە بە ئارامی پێکەوە نووستبن )

مەریەم: ( بەڵێ ، ئەوەم لە بیرچوو ، ئەو شەوە دەست لەملانی یەکتری بوون و بڕیاریان دا هەتا مردن جێگە لە یەکتر جیانەکەنەوە)

موهتەدا: ( بەڕاستی چیرۆك بێژێکی زۆر بە توانای ، ئەو ڕووداوانەت چۆن بۆ دەهات و چۆن ڕێکت دەخست؟!)

مەریەم: ( دووری لە تۆ منی کردووە بە چیرۆکخوان )

موهتەدا: ( ئێمەش لە ئەم شەوەوە بڕیار دەدەین جێگە لە یەکتر جیانەکەینەوە)

مەریەم: ( منیش هەرجارە و چیرۆکێکت بۆ باس دەکەم )

هەردوو هەستان جێگەکانیان ڕێکخست و ئەو شەوە زۆر بە ئارامی لێی نووستن....

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٢ -

# بەگەڕکەوتنی لەتیفەکان و سەرهەڵدانی عیرفانێکی بەڵگەدار

"موهتەدا " ماڵەوەیانی بەجێهێڵا و ڕووی لە خوێندنگەکەی "مەلای گەورە" کرد...

لە وانەی عیرفاندا شاگردێك پرسیارێکی ئاراستەی "موهتەدا " کرد کە بوو بە جێگەی قسەکردن و مشتومڕی نێوانیان و دەیان پرسیاری تری بەدوای خۆیدا هێنا...

شاگردەکە: ( مامۆستا ، ماوەیەکە شەوانە بە ئاگا دێم و دەچمە حەوشەکەمان و بە ئارامی لێی دادەنیشم ، زۆر بە ئاشکرا هەست بەبوونی گورزەیەك لە شەپۆلی نووران دەکەم کە مرۆڤ بە چاوی سەر هەست بە بینینیان ناکات ، بەلاّم بوونیشیان هەیە ، حەقیقەتی ئەو شەپۆلانە چین و لە کوێوە سەر هەڵدەدەن ؟)

موهتەدا: ( سەرەتا دەبێ هەموومان پیرۆزباییت لێبکەین کە توانات هەیە خەو لە خۆت حەرام بکەیت و بۆ یاد و بیرکردنەوە جێگەی گەرم و نەرم بەجێ بهێڵیت ، شەپۆلە مەعنەوییەکان بۆ هەموو مرۆڤێکە بە بێ جیاوازی ئایین و زمان و ڕەنگ و ڕوو ، ئەو شەپۆلانە بە هەمیشەیی بوونیان هەیە ، بەلاّم هەندێك لە مرۆڤەکان دەتوانن ئامێری ناخی خۆیان بەگەڕ بخەن و ئەو شەپۆلە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەعنەوییانەی پێ وەرگرن ، یاخود پێ هەڵمژن ، هەندێكیش ئامێرەكەی ناخی تۆزی لێنیشتووە و توانای وەرگرتنی ئەو شەپۆلانەی نییە)

شاگردەكە: ( مەبەستت چییە بە " ئامێری ناخی مرۆڤ " ؟)

موهتەدا: ( لای ئەهلی عیرفان مرۆڤ خاوەنی پێنج لەتیفەیە — هەندێكیشیان دەڵێن دەیە — كە لە مرۆڤدا دانراوە ، ئەو پێنج لەتیفەیە دەكەونە سەر سنگ و دەوروبەری سنگ ، ئەوانە وەك پێنج وێستگەی نوورانی وان ، یاخود پێنج محەویلەن و نوور بە هەموو جەستەدا پەخش دەكەنەوە ، سەرچاوەی ئەو نوورە ، یاخود هێزی ئەو نوورە كە محەویلەكان ( پێنج لەتیفەكە ) دابەشی دەكەن لەو شەپۆلە مەعنەوییە گەردوونیانەوەیە كە بە هەمیشەیی ڕوویان لەم زەوییە كردووە...)

یەكێكی تر لە شاگردەكان: ( ئەو پێنج لەتیفەیە ناویان چییە و شوێن و جێگەیان لە سنگی مرۆڤدا لە كوێدایە؟)

موهتەدا: ( ناو لێنانی ئەو پێنج لەتیفەیە گرنگ نییە ، بەڵكو دۆزینەوە و كارپێكردنیان نهێنی كارەكەیە ، ئەهلی عیرفان ناویان ناون: دڵ — ڕۆح — نهێنی — شاراوە— شاراوەتر — كە لە زمانی عەرەبیدا ( قلب — روح — سر — خفي — أخفى ) ی بۆ دانراوە...

جێگەی دیاری كراوی ئەم پێنج وێستگەیە هەردوو ژێر مەمكەی چەپ و ڕاست و هەردوو سەرو مەمكەی چەپ و ڕاست و چاڵایی خوارەوەی سەر سنگە...)

شاگردێكی تر: ( چۆن ئەم لەتیفانە بەگەڕ دەكەون و بەكاری خۆیان هەڵدەستن ؟)

موهتەدا: ( پایەكانی پرۆسەی بە گەڕخستنی ئەم پێنج لەتیفەیە ئەمانەن: لەتیفەكان — شەپۆلە مەعنەوییەكان — ئارامی و بێدەنگی— یاد — یەكانگیربوونی ئەم چوار پایەیە...)

هەمان شاگرد: ( مامۆستا ، پێمان خۆشە لەسەر هەر یەكێك لەو پێنج پایەیە قسە بكەیت بۆ ئەوەی بابەتەكە زۆرتر [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( لەتیفەكان : هەر ئەوەندە باسە جێگە و شوێنی لەتیفەكان لە مرۆڤدا بزانیت ، نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت كە ئەم لەتیفانە سەر بە جیهانی فەرمان (عالم الامر ) ن ، نەك جیهانی ئەفران (عالم الخلق ) ، واتە ئەگەر هەموو لەشی مرۆڤ توێكاری بكەیت ئەو لەتیفانە وەكو پارچە گۆشتێك یان بوونێكی ماددی نابینیتەوە ، بوونی ئەو لەتیفانە بوونێكی مەعنەویە نەك ماددی ، لەو لەتیفانە نوور بە هەموو گەردیلەكانی بوونی مرۆڤدا پەخش دەكەنەوە و مرۆڤ دەگۆڕن بۆ كائینێكی نوورانی...

شەپۆلە مەعنەوییەكان: ئەو شەپۆلانەن كە لە جیهانی مەلەكووتەوە دادەبارێنە سەر زەوی و ژیانی مرۆڤ و زیندەوەران و سەرجەم بوونەكانی تر بەو شەپۆلە مەعنەوییانەوە بەردەوامە ، مرۆڤ تاكو نەكەوێتە نێو ئەو جیهانە لە حەقیقەت و نهێنی ئەو شەپۆلانە ناگات...

ئارامی و بێدەنگی: مەبەستمان پێی ئەو كات و شوێنەیە بۆ وەرگرتنی شەپۆلەكان تیایدا دادەنیشیت ، لە شەودا شەپۆلەكان بەهێزترن وەك لە ڕۆژدا ، شەوان شەپۆلەكان دەگەنە لوتكەی چڕ و پڕییان ، یەك دوو كاتژمێرێك بەر لە بەرەبەیان لەتیفەكان وەك دەمی گوڵ زار دەكەنەوە و تامەزرۆی لێزمەی شەپۆلە مەعنەویەكانن ، مرۆڤ دەبێت لە جێگەیەكی زۆر بێدەنگدا بێت و هەوڵبدات تەنها بێت...

یاد: مەبەستم پێی ئەو كەلیماتانەیە كە یادكار دەیەوێت بۆ بەگەڕخستنی لەتیفەكان بەكاریان بهێنێت ، "یادكەر" ئەوەندە لە یاد دا قووڵ دەبێتەوە تا "یاد" بۆ "یادكراو" دەگۆڕێت ، بەردەوامی لە یاد خودی یادكەر لە بیر دەبرێتەوە و تەنها یادكراو دەمێنێتەوە ، واتە یاد و یادكەر و یادكراو ( ذكر و ذاكر و مذكور) دەبن بە یەك...

یەكانگیربوونی ئەو چوار پایەیە: كەوتنە ناو پرۆسەی یاد و بیركردنەوە لە كەش و هەوایەكی زۆر ئارام و شیاودا و بەكارهێنانی ئەو كەلیماتانە و دابەزاندنیان بۆسەر لەتیفەكان ، هەموو لەتیفەكان دەهرووژێنێ و دەكەونە گەڕ و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەست بە هەڵمژینی شەپۆلە مەعنەوییەکان دەکەن و نوور بە هەموو لایەکدا پەخش دەکەنەوە...

شاگردێکی تر: ( مرۆڤ هەست بە بوونی ئەو نوورە دەکات؟)

موهتەدا: ( ئەگەر مرۆڤ ماوەیەکی زۆر کار لەسەر ئەو لەتیفانە بکات بە ئاشکرا ئەو نوورەی لا بەرجەستە دەبێت و دەبینێت دوای لێوان لێو بوونی وجوودی خۆی بەو ڕۆشناییە ، نوورەکە سەردەکات و دەوروبەریشی دەگرێتەوە...)

هەمان شاگرد: ( گرنگی ئەم نوورە بۆ مرۆڤ لە چیدایە ؟)

موهتەدا: ( زیندوویێتی باری مەعنەویی مرۆڤ بە بوونی ئەو نوورەوە وابەستەیە ، لە دەستدانی ئەو نوورە لە دەستدانی ڕۆشناییەکە کە مرۆڤ لە تاریکستانی وجوودی قوتار دەکات و بۆ جیهانێکی پڕ لە نوور و ئاسودەیی پەلکێشی دەکات...)

کاتێك گەیشتە ئەم جێگەیە مۆڵەتی لە شاگردەکانی خواست و بە شێوەی جارانی خۆی بە منارەکەدا سەرکەوتەوە...

دوای عەسرێك "مەلای گەورە" بۆ حوجرە تایبەتەکەی خۆی "موهتەدا" ی بانگ کرد و دوو بە دوو بەم جۆرە لەگەڵ یەکتر کەوتنە قسە وباس: ( کوڕم "موهتەدا " تۆ بۆخۆت دەزانیت من یەکێکم لەو زانایانەی لە زانستە شەرعییەکاندا وەك مەرجەعێك مەلایان و زانایان پشتم پێدەبەستن ، سوێند بێت بە خودا هیچ زانستێکی شەرعی نییە تیایدا کەسێك لە خۆم بەزاناتر بزانم ، لەگەڵ ئەوەشدا وا هەستدەکەم کۆی ئەو زانستە جۆرا و جۆرانە ئارامییەکی پێ نەبەخشیوم تا لە پەلکوتین بکەوم و ڕێگەی خۆم – لە سەر یەقین – بگرمە بەر ، دەمەوێت لەم مەیدانەدا ڕاوێژت پێ بکەم و سەرنج و ڕای خۆتم پێ بڵێیت )

موهتەدا: ( جەنابی مامۆستا ، من لە تۆوە فێری زانست بووم ، ئەوەی لەلای منە سەرچاوەکەی لای بەڕێزتانە ، ئێستا چۆن بتوانم لەبەردەمی گەورەی خۆمدا دەم بکەمەوە و قسان بکەم ؟!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەلای گەورە: ( کوڕم ، ڕاستە لە زانستە شەرعییەکاندا من مامۆستای تۆم ، پرسیارەکەی من لە زانستی شەرعی نییە ، یاخود ڕاستر وایە بڵێم لەو جۆرە زانستە شەرعییانە نییە من وەرم گرتووە و بە قوتابییەکانم وتۆتەوە ، پرسیارەکەی من لە زانستێکە وا دەزانم لەلای تۆ هەیە و ئەو زانستەش لە منت وەرنەگرتووە ، بۆیە وەك مامۆستایەك وەڵام بدەرەوە و وا سەیرم مەکە کە مامۆستای تۆ بم ، من زۆر ئاتاجم و پێویستم بە کەسێکە لەو ئاڵۆزییە گەورەیە قوتارم بکات ، من لە "مەولانای ڕۆمی" مەزنتر و گەورەتر نیم کە لە بەردەم "شەمس"ی شاگردی خۆیدا چۆکی دادا و دیوانیً شیعری بە باڵایدا هۆنییەوە و ناوی لێنا دیوانی " شەمس")

"موهتەدا " بە بیستنی ئەو قسانە مەزنیی "مەلای گەورە" ی بۆ دەرکەوت ، تاکو ئەو ڕۆژە مامۆستای بەو گەورەیە نەبینی بوو ، دەربڕینی ئەو ڕاستییانە ساغی و پاکی "مەلای گەورە"ی نیشان دەدا ، ئەوەی دەسەلماند کە "مەلای گەورە" مرۆڤێکە عاشقی حەق و عەوداڵی ڕاستییەکانە ، ئەو کەسێکە بۆ گەیشتن بە مانا دروستەکان ئامادەیە پێشێلی زۆرێك لەو ناو و نیشانانە بکات کە هەندێك جار دەبێتە هۆی ملپێچی لە ڕاستی و دان نەنان بە حەقدا ، ئەو قسانەی "مەلای گەورە" قووڵی و بەرینی زانستی "مەلای گەورە"ی نیشان دەدا ، ئەو بە لێوەشاوەیی خۆی کۆی زانستە شەرعی و ئەقڵییەکانی پشکنی بوو ، بە وێستگەیەکەوە نەوەستا بوو ، بە زانستێکەوە گیرۆدە نەبوو بوو ، لە گەشە و گۆڕانێکی بەردەوامدا بوو ، گەیشتبووە خاڵێك کە پێی وابوو زانستی زاهیری شەرعی و ئەقڵی ناتوانێت " یەقین " بە مرۆڤ ببەخشن ، بەڵکو لەگەڵ قووڵبوونەوە و تەی کردنی ئەو مەیدانەدا مرۆڤ بە ڕووی دەرگایەکی کڵۆمدا هەڵدەشاخیً و وا هەست دەکات بیابانێکی پان و بەرینی بۆ گەیشتن بە سەرچاوەی ئاو بڕیوە و ئێستا گەیشتۆتە بەردەم قەڵایەك کە نازانێت لەو دیو دەرگاکەیەوە چ جیهانێکە ، نازانێت چۆن دەرگای ئەو قەڵایە دەکرێتەوە ؟ ئایا ئەوەی ئەو بە دوایدا دەگەڕێت لەو دیوی دەرگاکەوەیە؟ ئایا سەرچاوەی ئاوی ڕەوانی لەو جیهانە بەر دەست دەکەوێت؟ ئەو جارێکی تر ناتوانێت بە شوێنی خۆیدا بگەڕێتەوە و دەست بە پشکنینەوەی بیابانەکە بکاتەوە، "مەلای گەورە"

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بیابانی زانستە شەرعی و ئەقڵییەکانی تەی کرد بوو ، نەیدەتوانی بۆ پاراو کردنی خۆی و بە دەستهێنای ئارامی جارێکی تر نێو ئەو زانستە ئەقڵی و شەرعییانە بپشکنێتەوە...

"موهتەدا " بە باشی دەرکی ئەوەی کرد بوو کە "مەلای گەورە" لە قووڵبوونەوەی بێ سنوورەوە ئەو حاڵەتەی بۆ دروست بووە ، لە کەمی زانستەوە نییە کە ئەو پرسیارە دەکات ، بەڵکو بە ئەندازەیەك زانستەکەی بەرین بووە ، تەنانەت لە بیری بردۆتەوە کە ئەو "مەلای گەورە"یە و مەرجەعی ئاینی خەڵکی ئەم وڵاتەیە ، پاش بێدەنگییەك کە بە نێوانیاندا تێپەڕی "موهتەدا " سەیری مامۆستای کرد و وتی: (مامۆستای بەڕێزم ، هەندێك دەرد و ئافەت بۆ زانا دروست دەبێت هۆیەکەی بۆ کەمی زانست دەگەڕێتەوە ، بەڵام ئەم حاڵەتەی بەڕێزت دەرد و ئافەت نییە و لە قووڵی و بەرینی زانستەوە سەری هەڵداوە ، چارەسەرەکەشی قسە نییە ، چونکە من هەر قسەیەك بکەم لە مەیدانی زانستێکەوە بە دەستم هێناوە و لە بەڕێزتەوە زانستەکەشم وەرگرتووە، ئەم حاڵەتەی ئێوە هەمان ئەو حاڵەتەیە کە هەشت سەد ساڵ لەمەوبەر " غەزالی " بۆی دروست دەبێت ، دەرچوونی بەڕێزت لەو حاڵەتە بە یەکێك لەم دوو ڕێگەیە دەبێت: تەنهایی و یاد و بیرکردنەوەی بەردەوام و سەروبڕ ، یاخود بوونی عاریفێك تاکو بتوانێت لەم هەوارەوە بۆ هەوارێکی نوێ بتگوێزێتەوە...)

مەلای گەورە: ( چارەسەری یەکەم کە تەنهایی و یاد و بیرکردنەوەی بەردەوامە ئێستا لە ناویدا دەژیم و بەشێکی زۆر لە کاتەکانی داگیر کردووم ، بۆ چارەسەری دووەمیش ئەگەر لە ئەمڕۆدا عاریفێك هەبێت ئەوا بە تۆی دەزانم و لەو مەیدانەدا چیت پێ دەکرێت بۆمی ئەنجام بدە...)

موهتەدا: ( مامۆستا گیان ، هەمیشە متمانەی زۆری تۆ بە منی شاگردی خۆت تەکانی گەورەی پێداوم و وای لێکردووم لە ئاستی ئەو متمانەیەدا بم ، تۆی گوڕ و تەکان بە من دەدەی...)

مەلای گەورە: ( کوڕم ئەم بیرکردنەوەشت نیشانەی عاریف بوونی تۆیە ، ئەوەش بزانە خودا زانستی نهێنی و شاراوەی خۆی بە کەسانێك دەدات کە خۆی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەیەوێت ، نەك ئێمە دەمانەوێت ، زانستە شەرعییەكان دوو جۆرن: زانستی كەسپكراو و بە دەست هێنراو مەبەستم ( العلوم المكتسبة ) یە لەگەڵ زانستی تایبەتكراو و بەخشراو لە لایەن خودا خۆیەوە كە ( العلم اللدني ) پێ دەوترێت ، زانستی نهێنی زانستێكی كەسبی نییە و بە هەوڵ و تێكۆشانی مرۆڤ بەدەست نایەت ، بەڵكو بەخششێكە خودا بە بەندە تایبەتەكانی خۆی دەدات ، من بڵێم چی خودا بەشێكی گەورەی بە تۆ داوە و بە كەسانی تری نەبەخشیوە، خۆ دەشزانم خودا دادپەروەرە و كار و بڕیارەكانی هەڕەمەكی و لەخۆوە نییە..)

موهتەدا: (مامۆستا گەر هەموو تەمەنم لەبەر دەرگای بەڕێزتاندا بوەستم و خزمەتت بكەم هێشتا حەقی مامۆستایی و گەورەیی تۆم نەداوە...)

كە ئەو قسەی كرد چاوەكانیان پڕ بوون لە فرمێسك و بێشەرمانە بە ڕوومەتیاندا داباری و بێدەنگی و خامۆشییەك باڵی بەسەریاندا كێشا ، پاشان "موهتەدا " مۆڵەتی لە مامۆستا خواست و بۆ ماڵەوە گەڕایەوە...

سبەینێ عەسرەكەی ، پاش وتنەوەی وانەكانی حوجرە "موهتەدا " بۆ ژوورەكەی "مەلای گەورە" ڕۆیشت و زۆر بە ئەدەبەوە داوای لێكرد لەگەڵیدا بە منارەكەدا سەربكەون و بچن بۆ ژوورە بچووكەكەی لوتكەی منارەكە ، "مەلای گەورە" دەیزانی داواكەی "موهتەدا " حیكمەتێكی مەزنی لە پشتەوەیە ، بۆیە بە بێ دوو دڵیی ڕەزامەندی نیشان دا و هەردووكیان بە قادرمە پێچاوپێچەكاندا سەركەوتنە سەرەوە ، لەگەڵ بڕینی هەر قادرمەیەكدا خورپەی دڵی "مەلای گەورە" زیادی دەكرد ، ئەو لە سەرەتاوە وای دەزانی ماندوبوونی قادرمەكانە ، بەلاّم لە ڕاستیدا ترسێك هەموو ناوەوەی داگیر كرد بوو ، بۆخۆشی نەیدەزانی حەقیقەتی ئەو ترس و بیمە لە چیدایە ، بۆ لەو سەركەوتنە دەترسێت ، بەلاّم لە ڕاستیدا سەركەوتنی "مەلای گەورە" بە قادرمەكاندا سەركەوتن بوو بە پێپلە واتە ( مدارج ) ە بێشومارەكانی عاریفاندا ، لە سەرەتای سەركەوتنەوە بە پێپلەكاندا هەستی بە گەرمی و داگیرسانی جەستەی دەكرد ، بەلاّم لەگەڵ بەرزبوونەوەی زیاتردا هەستی بە دابەزینی گەرمای جەستەی و فێنكی ڕێگەكە دەكرد ، لەشی بەرە و ئارامی و سووكبوون دەڕۆیشت ، هەنگاوەكانی بە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کـەمترین زەحمـەت ڕێگـەی بـەرەو ئاسمانیـان دەبـڕی ، لـە ناکـاو هەسـتی بـە بەختـەوەری و ئاسـوودەییەکی لـە ڕادەبـەدەر کـرد ، چـەندین قادرمـەی بـە ئاسـوودەیی بـڕی ، نوورێـك سـەرجەم پلـەکانی ڕۆشـن کردبـوەوە ، هـەتا سـەر بکەوتبایـە پلـەکان نـوورین تـر دەبـوون ، نـوورینی پلـەکان سەرسـامییەکی بـۆ دروست کرد ، نەیدەزانی ئایا بە قادرمەدا سـەردەکەوێت یـان بـە گورزەیـەك لـە نووردا ؟ لە بەرزبوونەوە بەردەوام بـوون تـۆ بلـێ لـە گـوزەر کـردن بـە دەریـای نووریندا ماندو نەدەبوون ، پلەکانی بەختەوەری لە هەژمار نەدەهاتن ، دەیـان و سەدان پلـەیان بـڕی و هێـشتا نەگەیـشتبوونە لوتکـەی منارەکـە ، تـەکانیان بـە خۆیان دەدا ، هەنگاوەکانیان خێراتر دەبوو ، هەزاران پلەیان تەی کرد ، هێـشتا لوتکەی منارەکە دوورە دەست بوو ، "مەلای گەورە" پرسیاری لـە "موهتـەدا " کرد: ( کەی دەگەینە لوتکەی منارەکە؟! )

موهتەدا: ( گەیشتن بە لوتکەی منارەکە تەنها خەونە و هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بە لوتکەی منارەکە شاد ببێت)

مەلای گەورە: ( بۆچی ئەم منارەیە لوتکەی نییە؟! )

موهتەدا: ( ئەم منارە تەنها بەناو لوتکەی هەیە ، ئەگینا بـە قـوولایی بووندا لوتکەکەی ڕۆچووە و هیچ کەس ناگاتە مەنزڵی کۆتا )

مـەلای گـەورە: ( ئـەی بـۆ لـە دەرەوە لوتکەکـەی دیـارە و هـەموومان دەیبینین؟! )

موهتەدا: ( لە دەرەوە؟ بەڵێ لە دەرەوە وا دەردەکەوێت ، بەڵام لـە نـاوەوە ناکۆتایـە و گەیـشتن بـە لوتکەکـەی خـەونێکی بـەدی نـەهاتووە ، ئەوانـەی لـە دەرەوە سەیری پلەکانی عیرفان دەکەن هەنگاوی یەکەم و کۆتایان لـێ دیـارە ، واتە سەرەتای قادرمەکان و لوتکەی منارەکەیان دێتە بەرچـاوان ، بـەڵام کاتێـك بـە مەدرەجـەکانی عیرفانـدا بـەرز دەبنـەوە تـەنها پلـە و پلیکانـە دەبـڕن و ئـەو گەشتەش هەرگیز کۆتایی نایەت )

مەلای گەورە: ( تۆ باسی عیرفان دەکەیت یان باسی منارەکە ؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتـەدا: ( ئـەم منارەیـە تـەنها لـە دەرەوە منارەیـە و نـاوەوەی عیرفانـە و قادرمەکانی ئەو پلە و مەداریجانەن کە عاریفان پیایدا سەردەکەون )

مەلای گەورە: ( واتە ئێمە ئێستا بە پلەکانی عیرفاندا سەردەکەوین؟! )

موهتەدا: ( بەڵێ )

مەلای گەورە: ( ئەی بۆ هیچ گرانی و ئەرك و ماندوبوونێکمان نەدی؟ )

موهتەدا: ( ماندوبوونی عیرفان ئەو بەرەژان و ئازار و دڵەڕاوکێیـە یـە بـەر لـە پێخستنە ناو یەکـەمین پلـەی عیرفـان بـۆ هـەموو مرۆڤێـك دروست دەبێـت، تـۆ سەردەمێکە لە ئازاردا دەتلێیتەوە، سەردەمێکە نائارامی و دڵـەڕاوکێ ژیـانی لـێ تاڵ کردووی ، ئێستاش کاتی بەختەوەری دونیای عیرفانە ، دێرە هۆنراوەی ئـەو عاریفە مەزنەت نە بیستووە کە دەڵێت:

مەقامی عاریفان بێ زەحمەت و ڕەنج و مەشەققەت دیم

لە زومرەی عاشقانم ، بۆیە عالەمم لێ تەبەڕایە....)

کاتێك "مـەلای گـەورە" ئـەو چـەند قـسەیەی لـە "موهتـەدا " بیـست پـڕ بـە قوڕگی کەوتە هاوار کردن و ڕاکردن بەرەو سەرەوە بە قادرمەکاندا ، زۆری بڕی ، کول نەدەبوو ، هاواری دەکرد ، دەنگ و سـەدای فـەقێکانی بـە ئاگـا هێنـا و بـە پەلە بە قادرمەکاندا سـەرکەوتن و "مـەلای گـەورە" یـان لەسـەر قادرمـەکان بـە بوراوەیی بینی ، چەند فەقێیەك چوونە ژێر باڵی و هێنایانە خوارەوە و بردیان بۆ ژوورەکەی خۆی ، پاش ماوەیـەك "موهتـەدا " ش لـە منارەکـە دابـەزی و هاتـە ژوورەوە ، "مـەلای گـەورە" بـە بێهۆشـی لـە ژوورەکەیـدا ڕاکشابوو ، فـەقێکان دەربـارەی مامۆسـتای گـەورە پرسـیاریان لـە "موهتـەدا " کـرد ، ئـەویش لـە وەلامیاندا وتی: (سەرکەوتن بە پلەکاندا ئارامی لێبڕیوە...)

ئـەم قـسەیەی "موهتـەدا " دوو ڕووی هـەبوو ، لای خـۆی مەبەسـتی لـە "پلەکان" پلەکانی عیرفان بوو ، بەڵام فەقێکان وا حاڵی بوون گوایە قادرمـەکان و پیرییەتی مامۆستا ماندوی کردووە و نەیتوانیوە بەناو منارەکەدا سەر بکەوێت

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

، ئەو بە بێهۆشی هەندێك وشە لە لێوەكانی دەبیستران : " ئەو پێپلانە چەند نوورانی بوون! با سەركەوین ، عیرفان.."

"مەلای گەورە" نزیكەی هەفتەیەكی ویست تا كەوتەوە سەر پێی خۆی و توانی هات و چۆی خوێندنگەكەی بكات ، هەموو ئەو ماوەیە لە بیری ئەو ڕووداوەدا بوو ، چەندین جار لە دووی "موهتەدا" ی نارد و دوو بە دوو گفتوگۆی گەرم بە نێوانیاندا گوزەری دەكرد ، دیار بوو "مەلای گەورە" بڕیاری دابوو ئەو بەشەی تەمەنی لە دونیای عیرفاندا بەسەر بەرێت ، بۆ دونیای عیرفان "موهتەدا"ی بە مامۆستا و ڕێنیشاندەر دەزانی ، حەزی لەوە بوو شەو و ڕۆژ پێكەوە بن و لەمەڕ دونیای عیرفان قسەی بۆ بكات...

ڕۆژێك مەلای گەورە "موهتەدا " ی بۆ ژوورەكەی خۆی بانگهێش كرد و دوو بە دوو كەوتنە گفتوگۆ.. دیار بوو ئەو تامەزرۆی بینینی "موهتەدا " بوو ، داوای لێكرد گوێی بۆ بگرێ و كۆمەڵێك نهێنی ئەو چەند ڕۆژەی بۆ باس بكات : ( پێرێ عەسرەكەی زۆر خەستە و ماندو بووم ، نەمتوانی بۆ خوێندنگە بێم و لەماڵەوە مامەوە ، بۆ سبەینێ كە هاتم بۆ خوێندنگە داوای لێبوردنم لە شاگردەكان كرد و هۆی نەهاتنەكەم بۆ باس كردن ، پێم وتن : نەخۆش بووم ، بۆیە نەمتوانیوە بۆ خوێندنگەكە بێم ، هەموو سەیری یەكتریان كرد و پاشان وتیان: مامۆستا تۆ دوێنێ هاتیت و وانەشت بە هەمووەمان وتەوە ، زۆر لەسەر ئەوە چووم كە ئێوە هەڵەن و ڕۆژێكی تر بووە ، دیار بوو شاگردەكان ڕاستیان دەكرد و خەریك بوو گومانی ئەوەیان بۆ دروست دەبوو كە یان نەخۆشم یان تێكچووم ، بۆیە وتم: لێی گەڕێن ، پێم بڵێن بە كوێ گەیشتوون ؟ لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو وانەی ئەو ڕۆژەیان خوێند بوو ، پرسیارم لێكردن لە كاتی وانە وتنەوەدا هەستتان بە هیچ شتێكی نامۆ نەكرد ، وتیان: " نەخێر "...

بەڵام شاگردێكیان وتی: مامۆستا من هەستم بە شتێك كرد ، تۆ ئەمڕۆ پێڵووی چاوەكانت نەرمن ، بەڵام دوێنێ چاوەكانت زۆر توند و تیژ بوون ، چەند جارێك ویستم ئەو پرسیارەت لێبكەم ، بەڵام قسە دەهات بە بەردا و لە بیرم دەچوویەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئێستا شاگردەکان لە ترس و پرسیارێکی زۆر گەورەدان و پێویستە تۆ چارەسەرێکیان بۆ بدۆزیتەوە )

موهتەدا: ( مامۆستا گیان ئەوەی نموونە وێنە ( الصورة المثالیة ) ی مرۆڤ دەیکات هەرگیز مرۆڤ بۆخۆی ناتوانێت ئەو کارە سەیر و سەمەرانە ئەنجام بدات ، مرۆڤ لە یەك کاتدا – بە پێی هێز و توانای دڵی – دەتوانێت لە دەیان و سەدان جێگەدا جیلوە (تجلي ) بکات و ڕۆڵیش ببینێت ، عاریفان دەڵێن: کاتێك لەگەڵ نموونە وێنەکەماندا دادەنیشین زۆرجار خۆمان لەگەڵ ئەو وێنەیەدا لێ تێك دەچێت ، نەماندەزانی کامیان وێنە نموونەکەیە و کامیان مرۆڤە ڕاستەقینەکەی سەر زەوییە ، ئەوەی وانەی وتۆتەوە وێنە نموونەکەتە و بۆخۆشت لە ماڵەوە بوویت ، ئەمەیە نهێنی مرۆڤ و مەزنی ئەو هێزە مەعنەویەی کە تێیدایە)

موهتەدا لای مامۆستا هەستا و بۆ لای شاگردەکان ڕۆیشت ، بڕیاری دا ئەو ڕۆژە وانە نەخوێنن و کاتەکەیان بۆ پرسیار و گفتوگۆ تەرخان بکەن ، ڕووی لە شاگردەکان کرد و وتی: ( ئەگەر کەسێکتان پرسیارێکی هەیە با بیخاتە مەیدانەوە و هەموومان قسەی لەسەر بکەین)

شاگردێك : ( جا بە تەنها یەك پرسیار؟! کوڕە دەیان و سەدان پرسیار ناخی داگیر کردووین )

موهتەدا: ( یەکێك لەو پرسیارانە بخە بازاڕەوە )

شاگردەکە: ( ئەو ڕۆژە مامۆستای گەورە لەگەڵت بە منارەکەدا سەرکەوت چی لەناو ئەو منارەیەدا ڕوویدا کە وای لە مامۆستا کرد ببورێتەوە؟ لەو ڕۆژەوە مامۆستا گۆڕاوە بە کەسێکی تر ، چەندین شتی سەیر و نامۆمان لێ بینیوە ، ڕازی ئەو نهێنییانەمان بۆ ئاشکرا بکە)

موهتەدا: ( مەعریفە و زانستی بەرینی مامۆستا بە بەردەوامی تەکان و بەرەو پێشچوون بە ئەو دەدا ، مامۆستا بە ڕشتەی مەعریفەدا گوزەری کردووە و خۆی لە کەنارەکانی دەریای عیرفاندا بینیوەتەوە ، بۆیە ئاساییە چەندین کاری پڕ لە نهێنی و سەیر و سەمەرەی تریشی لێ بوەشێتەوە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شاگردەکە: ( بەڵام چەند ساڵە مامۆستا شتێکی لەوجۆرەی لێ نەبینراوە؟! )

موهتەدا: ( دەفر کە پڕ بوو لێی دەڕژێت ، ئەوە نیشانەی پڕبوونی مامۆستایە بە عیلم و عیرفان )

شاگردەکە: ( ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت مامۆستا لە منداڵییەوە تاکو ئەمڕۆ زانست وەردەگرێت و ئێستا پڕ بووە و لێی دەڕژێت! )

موهتەدا: ( ئەگەر وا بێت هیچ نەنگی و ناتەواوییەکی تێدا هەیە ؟! مەگەر فەرمانمان پێ نەکراوە بڵێین: " خودایە زانستمان زیاد بکە "، پێمان نەوتراوە: " لەسەرو هەموو زانایەکەوە زاناترێك بوونی هەیە "؟)

شاگردەکە: ( ناڵێم نەنگی و ناتەواوی یە ، بەڵام بۆ دەبێت لە کۆتایی تەمەندا مرۆڤ بە عیلم و عیرفان پڕ ببێت؟! )

موهتەدا: ( پڕ بوونی مرۆڤ بە تەمەنەوە نەبەستراوە ، هەر مرۆڤە و جۆرە دەفرێکە ، هەیانە زوو پڕ دەبن و هەشیانە زۆر دەخایەنێت ، نە زوو پڕ بوون نیشانەی گەورەی یە ، نە درەنگ پڕ بوونیش ناتەواوی و کەم کەماڵی یە ، هەندێك دەفر بچووکە و زوو پڕ دەبێت ، هەندێکی تر فراوانە و تەمەنێکی دەوێت تا لێوان لێو دەبێت ، مامۆستای گەورە دەفرێکی بەرینە و زۆری ویستووە تا پڕ بووە )

شاگردەکە: ( ئایا لە بنچینەوە پڕبوون بوونی هەیە؟)

موهتەدا: ( ئێمە ناومان ناوە پڕ بوون ، ئەگینا بریتی یە لە گەیشتن بە کەماڵی ڕێژەیی خۆ و هاتنە بەری داری باوەڕ ، مرۆڤ وەکو درەختی میوە وایە ، هەیانە بە " سێ " ساڵ بەردەدات و هەشیانە دە –دوازدە ساڵێك دەخایەنێت ئەوجا دەکەوێتە بەردان )

شاگردەکە: ( مەبەستت بە بەری درەختەکە چییە؟)

موهتەدا: ( مەعریفە و زانست درەختەکەیە و عیرفانیش بەری درەختەکەیە ، درەخت تا نەگاتە کەماڵی خۆی بەر نادات ، مرۆڤ تا داری زانستی ڕیشە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دانەكوتیێ و پەل و پۆ نەهاوێت بەری عیرفان ناگرێت ، بەلأم دەبێ زانست و مەعریفە تەنها بە خوێندن و خوێندنەوەی كتێب و زانستە گەردوونی و مرۆیی و ئایینییەكان تێنەگەین ، زانست دوو جۆری هەیە: جۆرێكیان بەدەست هێنراوە مەبەستم ( مكتسب )ە و جۆرێكی تری زانستێكە بە ناخی مرۆڤدا چێنراوە و بە خۆ هەڵكۆڵین مرۆڤ دەیگاتیێ ، سەرجەم زانستەكان بەری خۆهەڵكۆڵینە و پاشان میتۆدی بۆ دارێژراوە و مەیدانی بۆ دیاری كراوە و بە پێی كاركردن لەو مەیدانەدا زانستەكە شێوەی گرتووە و چوارچێوەیەكی تایبەتی بۆ دیاری كراوە ، بنچینەی هەموو زانستەكان ئەو زانستەیە لە قووڵاییەكانی دەریای ناوەوەی مرۆڤدایە و مەلەوانە شارەزاكان دەریان هێناوە و وەك دوڕ و مرواری خستوویانەتە بازاڕی زانستەوە)

شاگردێكی تر: (تەجروبە لەم مەیدانەدا ڕۆڵی چییە؟)

موهتەدا: ( تەجروبە ڕاڤەی شتەكانی دەرەوەمان بۆ دەكات ، لە چەندین ڕووداو یاسایەكمان بۆ دادەڕێژێت ، تەجروبە بە بینین (بصر)ەوە بەستراوە ، جگە لە مرۆڤ هەموو گیاندارە بالأكان ڕووداوەكان پچڕ پچڕ لە یەكتر دەبینن ، ئەوان ناتوانن پەیوەندی لە نێوان دیاردە و ڕووداوەكاندا بدۆزنەوە ، بەڵكو هەر ڕووداوێك بە جیا لە ڕووداوێكی تر دێتە بەرچاویان ، تەنها مرۆڤە دەتوانێت ڕووداو و دیاردەكان پێكەوە گرێ بدات و لە كۆی ئەو بە یەكتر بەستنەوەش یاسایەك دابڕێژێت ، یاخود مانایەكی نوێ هەڵبهێنجێت)

** ** ** ** ** **

"مەریەم و موهتەدا " پێكەوە سەفەرێكی لای ماڵی بابی "مەریەم" یان كرد ، "موهتەدا" ئۆتۆمبێلەكەی بابی هێنا بوو ، بەیانی زوو لە ماڵەوە دەرچوون ، ڕەنگ و تام و بۆنی ئەو بەیانییە لە ڕۆژەكانی تر جیاواز بوو ، بینینی ڕەنگی سەوز لە ماڵی خۆیانەوە دەستی پێكرد ، باخچە بەرینەكەی ماڵیان سەوزی پۆشی بوو ، درەختەكان لە سەوز هەڵژەنرابوون ، ئەو بەیانییە "مەنسوور"ی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بابی قاتێکی سەوزی ورشەداری لەبەر کرد بوو ، پۆشاکەکانی بەری دایکی سەراپا سەوز بوون ، "مەریەم" بە جلە سەوزەکانی بەریەوە سفرە سەوزەکەی هێنا و بۆ هەموانی ڕاخست ، هەموو سیمایان سەوز هەڵگەڕا بوو ، ئایا بۆخۆیان سەوز بوون ، یاخود ڕەنگی سەوزیماڵەکەیان لە ڕوویاندا پەخش بوو بوویەوە ؟ ماڵەکەیان سەراپا سەوز بوو ، دەتوت لە ئاسمانەوە بە سەدان قوتووە بۆیاخی سەوز بەسەر ئەو ماڵەدا ڕژێنراوە، لە ماڵەوە بەڕێکەوتن و سواری ئۆتۆمبێلە سەوزەکە بوون و بە شەقامە سەوزەکاندا تێدەپەڕین تا سەرئەنجام شاری لێوان لێو لە سەوزییان بەجێهێڵا ، لە دوورەوە بینینی شار دەتوت دارستانێکی چڕوپڕە و لە کاولکاری دەستی مرۆڤ بە دوورە و هەزاران ساڵە لەناو خۆیدا چڕ دەبێتەوە ، "مەریەم و موهتەدا " ئەوەندە ڕەنگی کەسکیان هاتبووە بەرچاوان هەموو شتێکیان بە کەسك دەبینی ، ئەو بەیانییە ئەوەندە لێزمەی سەوز باری بوو تەنانەت تیشکی هەتاو شی دەبوویەوە و ڕەنگی کەسکی تیادا زاڵ دەبوو ، وردە وردە لە شار دوور کەوتنەوە و لەگەڵ دوورکەوتنەوەیاندا ڕەنگی کەسك کاڵ بوویەوە و تەنها "مەریەم و موهتەدا " بە سەوزی مانەوە و شتەکانی تر پەردەی سەوزیان لەسەر هەڵگیرا و هەموو شتێك ڕۆیشتەوە دۆخی جارانی ، "مەریەم" ڕووی کردە "موهتەدا " و وتی: ( بۆچی شتەکان لە ڕەنگی سەوز خاڵی بوونەوە ؟)

موهتەدا: ( ئێمەین لە سەوزی خاڵی دەبینەوە )

مەریەم: (چۆن؟)

موهتەدا: ( لێشاوی شەپۆلی سەوزی ناخی ئێمەیە بە دەوروبەرماندا دەکێشێت ، لەگەڵ نیشتنەوەی شەپۆلەکان و کۆتا هاتنی هەڵچوونەکانیان دەوروبەر بۆ دۆخی پێشووی دەگەڕێتەوە...)

مەریەم: ( دەتەوێت بڵێیت ئێمەین دەوروبەرمان سەوز دەکەین؟! سەوزی ئێمەیە هەموو شتەکانی بە سەوز گۆڕیوە ؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( كاتێك مرۆڤ هەموو بوونی بە شتێك پـڕ دەبێـت دەوروبـەری خـۆی لێدەبێت بەو شتە ، ئێمە بە ڕەنگی كەسك لێوان لێو بـوو بـووین ، بۆیـە هـەموو دەوروبەرمان بە كەسك لێگۆڕا بوو)

مەریەم: ( مرۆڤ چەند هونەرمەندێكی ناوازەیە ! ئەو دەتوانێت بە بـێ فلّـچە و بۆیاخ سەراپای گەردوون ڕەنگ بكات)

سنووری شارۆچكەكە بەدەركەوت و گەیشتنە ماڵی بابی "مەریـەم" و دایكـی لە بەردەرگاكەدا چاوەڕوانی دەكردن و وتی: لە بەیانییەوە چاوەڕوانتانم..

"سمكۆ و عەبدوڵلا " ی بابی بۆ پاككردنەوەی باخە ڕەزەكانیان ڕۆیشتبوونە لادێ ، لادێكەیان زۆر لە شارۆچكەكەوە دوور نەبوو، بە پێیان دوو كاتژمێر ڕێگـە بوو، ئەو ماوەیەش دەبوا بەناو چیا و ڕێگە پێچاوپێچەكاندا گوزەرت بكردبایـە ، دوانیوەڕۆكەی بـۆ ئاگاداركردنـەوەی كـاك "عەبـدوڵلا " ی خـەزوری لـە هاتنیـان "موهتەدا " بڕیاری دا ڕوو لە ئەو لادێیە بكات ، بەرەو چیا مەزنەكە بەڕێكەوت و بـە توولـە ڕێ پێچاوپێـچەكانی نـاو چـیاكەدا بەسـەركەوت ، تـەنهایی ڕێگەكـە و سەختی سەركەوتن و مەزنی چیاكە زۆر مانای پـەنهانی بـە بـیر هێنایـەوە ، ئـەو چیا مەزنەكە و بڕینی ڕێگەكەی لێگۆڕا بە كاروانی عیرفان و گرتنەبەری سەفەری هات و نەهات ، سەرەتاكانی عیرفان بـڕینی زەویـە پـان و بەرینەكانـە و پـڕە لـە چێژ و خۆشی ، بەڵام ناوەڕاستی عیرفان سەركەوتنە بە چیایەكی مەزندا كە دوو مەترسی گەورەی تێدایە: ماندو بوون و ئەگەری ورەبەردان و گەڕانەوە ، لەگـەڵ لێ بزربوونی ڕێگەكە و بەربوونەوە و هەڵدێران...

"موهتەدا " لە سەركەوتن بە چیا مەزنەكەدا بـەردەوام بـوو ، تینـوێتی زۆری بۆ هێنا و بیری لەوە دەكردەوە كە پێدەچێت سـەر لوتكـەی چـیایەكە كانیـاوی تێدا بێت ، دوای زیاتر لە یەك كاتژمێر لە بڕینی توولە ڕێگاكـان و بەرزبوونـەوە و نزیك بوونـەوە لـە ئاسمـان گەیـشتە سـەر لوتكـەی چـیاكە ، سـەرەوەی چـیاكە پانتاییەكی بەرین بوو، سەراپای لە سەوزی هەڵژەنرا بوو، گـوڵی ڕەنگـا و ڕەنـگ لـە سـەر تـەختی سـەوز تابلۆیـەكی نەخـشاندبوو كـە بـە هـەزار هونەرمەنـدی دەستڕەنگین ڕەنگەكانی پـێ ڕێكنـەدەخرا ، ئـەو بـە دوای تـەری و سـەوزییەكدا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەگەڕا ئاوی لە دەوروبەر بێت ، بەرەو چەند گابەردێك كە چەند دارێكی بە دەوردا ڕووا بوو بەسەركەوت ، یەكێك لە بەردەكان دەمی كردبووەوە و كانیاوێكی ڕۆشنی لە گەرو هەڵدەقوولا و ئاوەكەی دوای چەند هەنگاوێك بە دیوی خۆرئاوای چیایەكەدا شۆڕ دەبوویەوە و لە ناو تاشە بەردەكاندا بزر دەبوو ، تێر لە كانیاوەكە ئاوی خواردەوە و پاراو بوو ، پاشان هەستا و كەوتەوە سەر ڕێگەكەی خۆی و بەرەو دیوی دووەمی چیاكە بەڕێكەوتەوە ، دیوی دووەم سەرەولێژگە بوو كە ڕێگەكەی بەرەو دۆڵێكی فراوانی لێوان لێو بە باخە ڕەز شۆڕ دەبوویەوە ، لە چەند ڕەزەوانێك پرسیاری كاك "عەبدوڵڵا " ی كرد و ئەوانیش شوێنەكەیان پێ نیشان دا و ڕۆیشتە لایان و بەخۆشییەوە كاك "عەبدوڵڵا و سمكۆ " بەخێرهاتنیان كرد و تا ئێوارەیەكی درەنگ لەسەر ڕەزەكان پێكەوە مانەوە و پاشان بەرە و ماڵەوە گەڕانەوە ، لە ڕێگەی گەڕانەوەیان "موهتەدا " باسی ئەو ئاوەی بۆ "عەبدوڵڵا "ی خەزوری كرد و پرسیاری كرد : ( بۆچی سوود لەو ئاوەی سەر لوتكەی چیایەكە نابینن ؟! )

كاك "عەبدوڵڵا " لە وەڵامی "موهتەدا " وتی: ( تاكو ئێستا لەسەر ئەو چیایە ئاو نەبینراوە ، زۆرم پێ سەیرە باسی بوونی ئاو دەكەیت ! )

موهتەدا: ( بۆخۆم تێر ئاوم لێ خواردەوە ! )

عەبدوڵڵا: ( كە چووینە سەر چیاكە پێم نیشان بدە )

هەركە بە لوتكەی چیاكە گەیشتن "موهتەدا " كاك عەبدوڵڵا و سمكۆ" ی بۆ ناو كۆما بەردەكە برد و چوونە پاڵ ئەو بەردەی دەمی كردبووەوە و بینی نەك ئاوی لە گەرو هەڵناقوولێت ، بەڵكو گژوگیای وشك ناو دەمی بەردەكەی پڕ كردووە ، "موهتەدا " بەسەر سوڕمانەوە وتی: ( لێرەدا ، ئا لێرەدا! لێرەوە هەڵدەقولا! ئەی كوا ئاوەكەی؟! )

"سمكۆ " هەندێك پێكەنی و وتی: ( پێدەچێت سەردەمانی پێشوو ئەم جێگە ئاو بوو بێت و تۆش ڕێت لەم جێگە كەوتبێت ، یا لەوانەیە خەونت بینی بێت؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کاك "عەبدوڵلاّ " لەوە حاڵی بوو کە ئەو ئاوە تەنها بۆ "موهتەدا" بووە و دڵنیاش بوو لەوەی "موهتەدا" لەو ئاوەی خواردۆتەوە ، چونکە ئەو "موهتەدا" دەناسی و دەزانی مرۆڤێکی زانا و عاریفێکی مەزنە..

"موهتەدا" لەوە گەیشت کە ئەو کانیاوەی لەسەری پاراو بوو کانیاوی عیرفان بووە ، بۆیە داوای لێبووردنی کرد و وتی: ( پێدەچێت ئەوەندە سەرکەوتن بە چیایەکەدا ماندوی کردبم شەپۆلی گەرمام لێ بووبێت بە ئاو..)

هەرسێکیان دایان لە قاقای پێکەنین و بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە ، لەبەر دەرگاکەدا " نازداری مەلەکووتی" لە پاڵ "سمکۆ " ی کوڕی و "عەبدوڵلاّ " ی هاوسەریدا لە "موهتەدا " ی پرسی: ( تێر ئاو بوویت لە کانیاوی سەر لوتکەی چیاکە؟!)

موهتەدا: ( بڵێم چی؟!)

سمکۆ: ( ناشێ تۆ ناونیشانی کانی و ئاوت پێدابێت؟! دایە بۆ خاتری خودا ، هەزاران ساڵە ئەو چیایە چیایە و کەسێك ئاوی لەسەر نەبینیوە ، تۆ بۆ ئەم هەژارەت بە هەڵەدا برد ؟ ئەو قسەکەی تۆی لێ بوو بوو بەڕاست )

"سمکۆ " پێکەنینێکی بۆ کرد و ڕۆیشت ، "موهتەدا و کاك عەبدوڵلاّ و نازدار" یش چوونە ژوورەوە ، "موهتەدا " سەیرێکی "نازدار" ی خەسووی کرد و وتی: ( ئەی بۆ زوو وشکی کرد؟!)

نازدار: ( وشکی نەکردووە ، بەڵام هەموو کەسێك بەشی لەو کانیاوەدا نییە)

موهتەدا: ( خۆزگە کاك "عەبدوڵلاّ و سمکۆ"ش لێیان دەخواردەوە )

کاك عەبدوڵلاّ — بە شۆخییەوە —: ( بۆ " نازدار " دێڵێت دوو خێرمان دەستگیر بێت؟!)

نازدار — بە پێکەنینەوە —: ( من و هەرچی خێری منە هەمووی تۆ خاوەنیتی)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

عەبدوڵڵا — دیسان بە شۆخییەوە —: ( "موهتەدا " ئەم خەسوەت بەم قسانە منی فریوداوە ، بە خـودا لـە ڕۆژی دادگـادا دەڵێم: خودایـە گـەر دەمنێریـت بـۆ دۆزەخ دەبێ ئەو ژنەشم لەگەڵ بێت ، چونکە من بە بێ ئەو ناحەوێمەوە...)

نازدار: ( بە خودا گەر خودا بەهەشتم بە پێ ببەخشێت ناچمە ئـەو بەهەشـتە تاکو تۆم لەگەڵ نەنێرێت ، دەبێت دەستمان لە نـاو دەسـتی یـەکتر بێـت کاتێـك یەکەم هەنگاو بۆ ناو بەهەشت هەڵدەگرین )

عەبدوڵڵا: ( خودا بۆم ڕێك بخات بەر لە تۆ بچمە بەهەشت ، تاکو تۆ دێیت من سێ و چوار ژنم هێناوە )

هـەموو دەسـتیان بـە پێکـەنین کـرد و "مەریـەم" سـفرەی ئێـوارەی بـۆ ڕاخستن...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٣ -

# دوو ئەقڵی یاخی
# یەك شێوازی بیرکردنەوە

شەو بۆ نووستن "موهتەدا و سمکۆ " لە ژوورێکدا جێگەیان بۆ ڕاخرا، "موهتەدا " بۆ گوێگرتن لە "سمکۆ " تامەزرۆ بوو ، ئەو دەیزانی " سمکۆ " خوێنەرێکی کەموێنەیە و کەوتۆتە ناو دەریایەکی قووڵی ئەندێشەوە و شەپۆلەکانی بیرکردنەوە کەشتی بوون و خەیاڵی ئەو ئەم دیو ئەودیو دەکەن...

هەرچەند ئەو ڕۆژە تا ئێوارە "سمکۆ " کاری کرد بوو ، کەچی کتێبێکی قەبارە "چوارسەد" لاپەڕەیی هێنا و دەستی بە خوێندنەوەی کرد ، ئەو زۆر باکی بە "موهتەدا " نەبوو ، نەیدەویست پابەند بێت بەو هەڵسوکەوتە تەقلیدییەی لەگەڵ میواندا بەڕێ دەکرێت ، بۆیە لەسەر جێگەکەی خۆی بە خامۆشی لێی دانیشت و دەستی بە خوێندنەوە کرد، "موهتەدا " ش بۆ ئەوەی ئارامی ئەو نەشێوێنێت هیچی لێ نەپرسی و لەسەر جێگەکەی خۆی ڕاکشا ، چەند کاتژمێرێك بەو جۆرە بە سەریاندا تێپەڕی ، "سمکۆ " دەیخوێندەوە و "موهتەدا " ش لە ناو بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوو ، لە پڕ " سمکۆ " پەردەی خامۆشییەکەی لادا و ئارامی ژوورەکەی بە پرسیارێك لە "موهتەدا " شڵەقاند: ( من دەپرسم لەوانەیە پرسیارەکەشم لە خۆم بێت نەك لە تۆ: بڵێی شتێك لە ژیاندا هەبێت مانا ببەخشێت ، یاخود ماندار بێت؟! بڵێی ژیان — بە من و تۆ و پرسیارەکانمەوە — مانایەکی تێدا هەبێت؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( ئەگەر پرسیار لە خۆت دەکەیت ئەوا من مافی وەلآمدانەوەم نییە ، بەلآم گەر پرسیارەکە ڕوو بە منە ئەوا دەتوانین گفتوگۆی لەسەر بکەین )

سمکۆ: ( تۆش هەروەکو منی ، من و تۆ وەکو هەموو مرۆڤێك نوقمی هەزاران پرسیاری بێ سەروبەر بووین ، بۆیە من بە دوای وەلآمدا بگەڕێم یان تۆ جیاوازییەکی نییە و لام یەکسانە)

موهتەدا: ( گرفت لەو جێگەدا نییە کە پرسیارمان هەیە ، چونکە کاتێك مرۆڤ مرۆڤە پرسیاری هەبێت ، هەرکاتێك مرۆڤ پرسیاری لێبڕا ، یاخود وای هەست کرد پرسیاری نەماوە ئەو کەسە لە مەرگەوە نزیکترە تا ژیان و زیندەگی )

سمکۆ: ( پێم سەیرە مرۆڤێکی ئایدۆلۆژیستی وەك تۆ کە لێوان لێوی بە ئایدۆلۆژیای ئایینی باس لە گرنگی پرسیار دەکات ، یاخود پێیوایە پێویستە مرۆڤ خاوەنی پرسیار بێت ! )

موهتەدا: ( نازانم ئەو بڕیارە پێشینە لە کوێوە هاتووە کە لەناو ئاییندا پرسیار نییە ، بە پێچەوانەوە ئایین پرسیار بۆ مرۆڤ دەخولقێنێت ، کام مرۆڤەی دەگاتە لوتکەی باوەڕی ئایینی هێشتا لێوان لێوە بە پرسیار و دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە ، قووڵبوونەوە لە ئاییندا و بەرزبوونەوە لە باوەڕدا لە پرسیارەوە دەست پێ دەکات و پرسیاری قووڵتر و مەزنتر بە دوای خۆیدا دەهێنێت ، نابینی موسا – سەلامی خودای لەسەر بێت – داوا لە خودا دەکات خۆی پێنیشان بدات؟! ئەو بە تەنها قسەکردن لەگەڵ خودادا دڵی ئاوی نەدەخواردەوە، دەیویست بە چاوانی سەری خودا ببینێت ، سەرنجی پرسیارەکەی ئیبراهیم – سەلامی خودای لەسەر بێت – نادەیت داوا لە خودا دەکات نیشانی بدات چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە؟! کاتێك خودا دەپرسێت بۆ باوەڕت بە زیندوو بوونەوە نییە؟ لە وەلآمدا دەڵێت: با ، بەلآم بۆ ئەوەی دڵم ئاو بخواتەوە و سوکنایم بۆ بێت... سەرنج بدە پێغەمبەرێکە و هێشتا دەڵێت: بۆ ئەوەی دڵم ئاو بخواتەوە و سووکنایی بۆ بێت...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سمکـۆ: ( بـەڵام ئایـدۆلۆژیا پرسـیار دەمرێنێـت و وەهمـی ئـەوە بـۆ شوێنکەوتوانی دروست دەکات کە سەرجەم پرسیارەکان وەڵام دراونەتەوە)

موهتەدا: ( کاك "سمکۆ " ئایدۆلۆژیا و فۆرم گـرتنی ئایـدۆلۆژیا کـاری مرۆڤـە نەك ئایین ، ئایین لە ئەوپەڕی ڕەهایی و بەرینیدایە تا ئـەو کاتـەی مـرۆڤ دێـت و بیرو تێگەیشتنەکانی خۆی دەکات بـە پۆشـاکێکی بەرتەسـك و بـە بـەر ئایینیـدا دەکات ، ئایدۆلۆژیای ئایینی ئـەو پۆشـاکە کـەم و کورتەیـە بـە بـاڵای ئایینیانـدا بڕیوە و ئایین لە ڕەهایی و گەردوونی بوونـەوە بـۆ چوارچێوەکان دادەبـەزێت و زۆرێك لە مانا بەرز و بڵندەکانی خۆی لە دەست دەدات..)

سمکۆ: ( بەڵام دەقەکانی ئایین بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ بەجێهێڵراوە و بمانەوێ و نەمانـەوێ مـرۆڤ خوێندنـەوە بـۆ ئـەو دەقانـە دەکـات و لەوێـشەوە ئایـدۆلۆژیای ئایینی فۆرم دەگرێت ؟!)

موهتەدا: ( دروستە ، گرفتەکە لەو جێگەدا نییـە مـرۆڤ خوێندنـەوە بـۆ ئـایین دەکات )

سمکۆ: ( ئەی لە کوێدایە ؟)

موهتەدا: ( لەو جێگەدایە تێگەیشتنی مرۆڤمان لـێ ببێـت بـە ئـایین ، یـاخود تێگەیشتنە مرۆییەکانمان بە ئایین پێ بفرۆشـن ، لـەو بـارەدا پـیرۆز و ناپیرۆز ، ڕەها و سنووردار ، ئاسمانی و زەمینی، خودا و مرۆڤ ، تێکەڵ بە یـەکتر دەکـرێن ، لەوێشەوە کارەساتە جەرگبڕەکانی مێژوو کە بە نـاوی ئایینـەوە ئـەنجام دراوە ڕوودەدەن ، جەنگەکانی مرۆڤ دەبن بە جـەنگی خـودا و نـاوی جـەنگی پـیرۆز: ( Holly War ) ی بۆ دادەتاشـرێت ، ئەمەیـە مەرگەسـاتی مـرۆڤ ، کەسـانێك بەناوی ئایینەوە دێن و حەز و بیر و بەرژەوەندییەکانیان تێکەڵ بە ئایین دەکـەن و کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی پڕ بە قەیران و تووند و تیژی دەکەن )

سمکۆ: ( بەڵام ئـایین پرسـیارکردن بـە ڕەوا بزانێـت یـان بـە نـاڕەوا هـیچ لـە ڕەشبینی من بەرانبەر بە ژیان کەم ناکاتەوە)

موهتەدا: ( پێشتر وتم: گرفت لەو جێگەدا نییە کە پرسیارمان هەیە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سمکۆ: ( ئەدی گرفت لە کوێدایە ؟)

موهتەدا: ( گرفت لەو جێگەدایە نەتوانین و نەزانین چۆن بە دوای پرسیارەکاندا بگەڕێین ، مرۆڤ لە سارایەکدا بە دوای کانیاوێکدا دەگەڕێت تاکو خۆی لێ تێر ئاو بکات ، بەڵام دوو خاڵ گرنگە ، یەکەم دەبێ گەشبین بێت و ئیرادەی گەڕانی هەبێ و دەستە ئەژنۆ لێی دانەنیشێت ، دووەم بزانێت چۆن دەگەڕێت و کوێ دەگەڕێت)

سمکۆ: ( گرفتەکە لەو جێگەدایە ئاو لە ساراکەدا نییە )

موهتەدا: ( گرفتەکە لەم جێگەدایە کە تۆ باوەڕت بەوە هێناوە ئاو لە سارەکەدا نییە ، دەمەوێت بپرسم ئەو بڕیارەت لە کوێ هێنا و چۆن باوەڕت بە خۆت کرد ئاو لەو سارایەدا بوونی نییە ؟)

سمکۆ: ( کاتێك سەیری چوار دەوری خۆم دەکەم کەلاکی هەموو ئەوانەم دێتە پێش چاو بە دوای ئاودا گەڕاون و ئاویان نەدۆزیوەتەوە ، سەرئەنجام لە تینوێتیدا خنکاون )

موهتەدا: ( بەڵام ژمارەی کەلاکەکان زۆر کەمترن لە ژمارەی ئەو کەسانەی ڕوویان لە ساراکە کردووە ، دەبێ ئەوانی دی بە ئەنجامێکی تر گەیشتبن ، ناکرێت بڵێین هەموو ئەوانەی ڕوویان لەو سارایە کرد لە تینوێتیدا مردن )

سمکۆ: ( ئەو بڕیارەت لە کوێ هێنا ژمارەی موسافیرانی سارا لە ژمارەی کەلاکەکان زۆرتر و زیاترن ؟)

موهتەدا: ( تۆ ئەو بڕیارەت لە کوێ هێنا کە هەموو ئەوانەی کاروانی سارایان گرتەبەر جەستەکانیان بریتی یە لەو کەلاکانەی لە ساراکەدا بەجێماون؟)

سمکۆ: ( لەو جێگەوە کە ناکرێت سارا ئاوی تێدا بێت )

موهتەدا: ( ئەمەش دیسان بڕیارێکی بێ بەڵگەیە )

سمکۆ: ( بەڵام بڕیارەکەی تۆش کە دەڵێیت ئەو سارایە ئاوی تێدا هەیە ، زۆر بێ بنەما و بێ بەڵگەیە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( بەڵێ ، ئەگەر سارا ئەو مانا و مەدلولەی هەبێت کە لە زەینی تۆدایە ئەوا ئاوی تێدا نییە ، بەلاّم گەر تێگەیشتنی خۆمان بۆ سارا و بیابان بگۆڕین ، دەگونجێت سارا ئاو و باخ و بێستانیشی تێدا هەبێت )

سمكۆ: ( سارا هەر سارایە ، ژیانیش هەر ئەم دۆزەخەیە )

موهتەدا: ( بەم قسەیەدا دەیسەلمێنی تۆ ئایدۆلۆژیستی نەك ئەمن ، بۆ دەبێت بڕیار بدەی سارا تەنها یەك مانا و مەدلولی هەیە ؟! )

سمكۆ: ( چۆن دەتوانیت بیسەلمێنیت مانایەکی تر بۆ ژیان هەیە ؟)

موهتەدا: ( لەو جێگەوە کە چاویلکەی ڕەشی بیری ئالۆز و ئایدۆلۆژیای بەرتەسك دابکەنین و بە چاوی سەر لە سارای ژیان ورد ببینەوە )

سمكۆ: ( لە مەبەستت ناگەم ! )

موهتەدا: ( هەموو ئەو تێڕوانینانەی بۆ ژیان لامان خولقاوە ئێمەی مرۆڤ دروستمان کردووە ، مرۆڤ بیروباوەڕ دەخولقێنێ و دواتر پێیەوە گیرۆدە دەبێت ، ئەو بۆ ئاسوودەیی و بەختەوەری زیاتر بیری خۆی بەگەڕ خستووە ، بەلاّم زۆرجار بیر و تێڕوانینەکان ئاسوودەیی لێوەردەگرنەوە و دەبێت بە کۆیلەی بیروباوەڕەکانی )

سمكۆ: ( بەلاّم ناکرێت مرۆڤ لە بیر و تێڕوانین خاڵی ببێتەوە ! )

موهتەدا: ( بەڵێ وایە ، بەلاّم نابێت بە تەنها یەك جۆر بیر و یەك تەرز لە بیرکردنەوەو تێڕوانینەوە خۆی ببەستێتەوە )

سمكۆ: ( باشە ، گریمان تۆ بە کانیاوی سارا گەیشتووی ، پێمان بڵێ یەکەم: چۆن باوەڕ بە تۆ بهێنین کە کانیاو لە سارادا بوونی هەیە ، دووەم: پێمان بڵێ چۆن بگەینە ئەو کانیاوە ؟)

موهتەدا: ( قسەکانی من بۆ ئەوە نەبوو بە بەڕێزت ڕابگەیەنم وەرە ڕوو لە کانیاوی سارا بکەین ، بەڵکو بۆ ئەوە بوو پێت بڵێم: ئەو بیر و بڕیارەی تۆ لە تێڕوانین بۆ سارا گرتووتەتە بەر با دوایین بڕیارت نەبێت و گەشبینانە تر لە ژیان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بڕوانە و بە یەك جۆر لۆژیکی بیرکردنەوەوە خۆت مەبەستەوە ، تـەکانی زۆرتـر و زیاتر بە خۆت بدە ، گەرەکە ئەوە بزانیـت لـە سـارادا کـەس فریادڕەسـی کـەس نییە و دەبێت خۆت بە هانای خۆتەوە بێیت ، تۆی بیر دەکەیتەوە و هەر تۆشـی بڕیار دەدەیت، من ناتوانم لە جێگەی تۆ بڕیار بدەم )

موهتەدا: ( باسی تەجروبەی خۆتم بۆ بکە )

موهتەدا: ( هەر مرۆڤێك تەجروبەیەکە ، بـەڵام دەکرێـت کـەڵك لـە تەجروبـەی یەکتری وەربگرین ، پرسیار لە تەجروبەی من بکە با وەڵامت بدەمەوە)

سمکۆ: ( چۆن باوەڕت بەخۆت هێناوە کە ژیان دۆزەخ نییە؟)

موهتەدا: ( لە تەمەنمدا هەمیشە هەوڵمداوە بـە وێستگەیەکی بیرکردنـەوەوە خۆم نەبەستمەوە ، هەوڵمداوە لە توێکڵی شتەکانەوە بـۆ نـاوەڕۆك و لەوێشەوە بۆ ڕۆح و جەوهەری شتەکان بگوێزمەوە ، ڕواڵەتی دەرەوەی ژیان پڕ لە وەڕسی و بێزاری یە ، بەڵام کرۆك و جەوهەری پڕ لە چێژ و مانایە ، ژیان لای من خواردن و خواردنەوە و لەزەتـەکانی جەسـتە و حـەزی دەسـەڵات نییـە ، هـەموو ئەوانـە ڕواڵەت و توێکڵی ژیـانن ، کـرۆك و ڕۆحـی ژیـان شـتێکی تـرە ، ئـەو شـتەش لـە دەرەوە بەدەست نایەت ، بـەڵکو لـەناوەوەی مرۆڤدایـە ، دەگونجێـت دیلێـك لـە چوارچێوەی بەندیخانەدا لە کەسێکی ئازادی سەر شـەقامەکان زۆر ئاسـوودە تـر بێت ، لە کاتێکدا کەسە ئازادەکـە هیـچی لـە ژیـان کـەم نـەبێت و دیلەکـەش لـە هەموو زیندەگییەك مەحروم کرابێت)

سمکۆ: ( لەوانەیە دیلەکە بە وەهم و خەیاڵ خۆی ئاسوودە کرد بێت)

موهتەدا: ( تۆ مافی خۆتە ناوی وەهم و خەیاڵی لێ بنێیت ، بەڵام دەبێـت ئـەو مافەش بە من بدەی کە بڵێم: گەورەترین حەقیقەت لەو جیهانەدایـە و شـتەکانی ئەم جیهانە باوەی مرۆڤ بەراورد بەوانەی ناوەوەی سێبەرێکە و هیچی تر)

سمکۆ: ( بەڵگەی ڕاستبوونی ئەو جیهانە لە چیدایە؟)

موهتەدا: ( ئەگەر سروشتی ئەو فەزا مەعنەویە لەم جیهانە باوە جـودا بێـت ، ئەوا بەڵگەکانیشی لە بەڵگە و بورهانەکانی ئەم جیهانە جیاوازن)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سمكۆ: ( پێت وانییە بەو قسەیەت دەتەوێت لە بەڵگە هێنانەوە هەڵبێیت ، چونکە هیچ بەڵگەیەکت لە لا نییە ؟)

موهتەدا: ( با ، چونکە ئەو بەڵگەیەی تۆ داوای دەکەی لە لام نییە ، تۆ بەڵگەی ماددی و دەستبۆبراو لە من داوادەکەی ، منیش بۆ ئەو جیهانەی ناوەوەی مرۆڤ هیچ بەڵگەیەکی ماددی شك نابەم ، چۆن بە تۆی بسەلمێنم دوێنێ لەسەر لوتکەی چیایەکە من تێر ئاوم لە کانیاوێك خواردەوە ، چ بەڵگەیەکی ماددی و ئەقڵی بۆ تۆ بهێنمەوە کاتێك دەچینە شوێنی ئەو کانیاوە جگە لە پووش و پەلاش و بەردێکی ڕەق و تەق شتێکی ترمان بەرچاوان ناکەوێت؟!)

سمكۆ: ( خەیاڵت بەرین بووە و لە تینوێتیدا سەرابت لێ بووە بە ئاو)

موهتەدا: ( دەبێت پێت بڵێم تۆ ڕاست دەکەی ، چونکە هیچ ئەقڵێك قوبوڵی ئەو قسەیەی من ناکات و بەوجۆرەش بیرناکاتەوە ، بەلام کاتێك تەنها دەکەوم و دێمەوە بۆ ناو خۆم باوەڕی تەواوم بەخۆم هەیە کە من دوێنێ چوومە سەر کانیاوەکە و ئاوم خواردەوە و دەم وچاوم شۆری ، ئینکارکردنی تۆ لە باوەڕی ناوەوەی من ناگۆڕێت ، ماف خۆتە دانیش نەنێیت بەو ڕاستییەی لە لای منە ، چونکە ژیری و لۆژیك باوەڕ بەو حەقیقەتەی ناوەوەی من ناکات ، ئەوانە حەقیقەتێکن تەنها لە ناوەوەی مندا ڕاست و مانادارن ، بۆیە کاتێك دەکرێن بە قسە و دەخرێنە دەرەوە لە مانا خاڵی دەبنەوە)

سمكۆ: ( ناتوانم ئەقڵ و زانست و لۆژیك وەلا بنێم و باوەڕ بە خەون و خەیاڵ بهێنم )

موهتەدا: ( بەلام منیش ناتوانم کۆی نهێنییەکانی مرۆڤ و ژیان و گەردوون لە زانست و لۆژیکدا کۆ بکەمەوە ، زانست و لۆژیکێك مرۆڤ دایهێناوە و میتۆدی بۆ دارشتووە ، مرۆڤ مەزنترە لەو مرۆڤەی زانست پێناسەی دەکات ، ژیان بەرینترە لەو ژیانەی ئێمە مامەڵەی لەگەڵ دەکەین ، گەردوونیش ئەفسووناوییە و لێوان لێوە لە نهێنی و گۆشەیەکی بچووکی بۆ مرۆڤ ئاشکرا بووە)

سمكۆ: ( گرنگ ئەوەیە زانست و ئەقڵ لەگەڵ منە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( منیش زۆر باوەڕم بە ڕاستییەکانی ناوەوەی خۆمە)

کە گەیشتنە ئەو قسەیە هەردووکیان خامۆشییەك دایگرتن و چاوەکانیان چووە خەو...

ئەو گفتوگۆیەی نێوان " موهتەدا و سمکۆ" دوایین گفتۆگۆی فیکری بوو ، چونکە" سمکۆ " کەڵکەڵەی چوونە " ئەورووپا " کەوتبووە سەری ، بێزی لەو کولتوور و ئایین و پەیوەندییانە دەکردەوە مرۆڤی کورد و کۆمەڵگەی کوردی لەسەر بار هاتبوو ، پاش هەوڵێکی زۆر توانی کوردستان بەجێ بهێڵێت و خۆی بگەیەنێتە " ئەورووپا "...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

– ٤ –

# نەختینەی ناو ژوورەکە و
# نهێنی ناو سندوقەکە

لەمێژ بوو "موهتەدا" تامەزرۆی بینینی ناو ژوورە تایبەتەکەی بابی بوو ، لە منداڵییەوە خولیای ئەو ژوورە پەڕیبووە سەری ، چەند جار هەوڵی دابوو کلیلەکان لە بابی وەربگرێت و دەرگای ژوورەکە بکاتەوە ، بەلام بە هیچ جۆرێك بابی ڕێگەی پێ نەدەدا ، داوای لە دایکی دەکرد کلیلەکانی بۆ پەیدا بکات ، بەلام دایکی دەیوت : کلیل تەنها لە لای بابتە..

یەك دوو جار ویستی پەنجەرەی پشتەوەی ژوورەکە کە دەیڕوانی بەسەر باخچەکەی دواوەی خانوەکەیاندا بشکێنێت و هیچ نەبێت سەیرێکی ناوەوەی ژوورەکە بکات ، بەلام دەترسا بابی دڵگران ببێ ، بۆیە لە ئەنجامدانی کارەکەی پەشیمان دەبوویەوە...

ئەو ژوورە لە لای "موهتەدا" تەلیسمێك بوو کە دەبوا بیشکێنێت ، دەریایەك بوو دەبوا تیایدا فێری مەلە ببێت ، پەیکەرێکی داپۆشراو بوو نەیدەزانی هێمایە بۆ چ جۆرە مەزنییەك ، بیری دەکردەوە جارێك لەگەڵ چوونە ژوورەوەی بابیدا خۆی بکات بە ژووردا و بە خێرایی چاوێك بە ژوورەکەدا بگێڕێت ، بەلام بابی هەرکات بیویستبایە سەرێك لە ژوورەکە بدات هەموو جارێك سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکرد و دواتر دەرگاکەی بە ئەسپایی دەکردەوە و دەچووە ژوورەوە و بەدوای خۆید

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"موهتەدا " نەیدەزانی ئەو گشت حەز و خولیایە بۆ چوونە ناو ژوورەکە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە! ئەو منداڵێکی بێ هاورێ بوو کە لە قوتابخانە دەگەڕایەوە دەبوا سەرقاڵی پێداچوونەوەی وانەکانی ببوایە و دوانیوەڕۆکەشی بۆ وەرگرتنی زانستە شەرعییەکان ڕووی لە خوێندنگە ئایینییەکەی "مەلای گەورە" بکردبایە ، ئەو کاتانەی لە ماڵەوە بوو لە تەنهاییەکی قووڵدا دەژیا ، چونکە بە ڕۆژدا تەنها خۆی و "مەعسومە"ی دایکی لەو خانووبەرە فراوانەدا بوون ، دایکی خانمی ماڵ بوو ، سەرقاڵی ئیش و کار دەبوو ، "موهتەدا " ش تاوێك بە ژوورەکاندا خولی دەخوارد و پاشان دەچوو بۆ باخچەکە و ماوەیەك بە قوڕ خانووی دروست دەکرد و هەندێکیش لەگەڵ بۆقە قوڕینەکاندا کاتی بەسەر دەبرد ، دواتر دایکی دەهات و دەیبردە گەرماوەکە و جلوبەرگەکانی دەگۆڕی و دەست و دەم و چاوی دەشۆری ، پاشان دەگەڕایەوە بۆ نێو تەنهایی خۆی و ئەمجارەیان نەیدەوێرا لە باخچەکەدا خۆی لە قوڕ هەڵبژەنێت ، چونکە کەمێك پێش ئێستا دایکی جل و بەرگەکانی گۆڕی بوو ، بۆیە بیری لە کارێکی تر دەکردەوە بۆ ئەوەی خۆی پێوە خەریك بکات ، بیری دەکردەوە ، بەڵام شتێکی نەدەدەدۆزییەوە خۆی پێوە سەرقاڵ بکات ، دواجار بیری ژوورە تایبەتەکەی بابی دەکەوتەوە سەری و هەوڵی دەدا شتێکی لە بارەوە بزانێت...

"موهتەدا " لە منداڵییەوە وێنەی جۆراوجۆری لەسەر ناوەوەی ژوورەکە لە زەینیدا لا دروست بوو بوو ، سەردەمێك وایدەزانی ئەوە ژووری پادشایە و هەموو جارێك بابی سەر لە پادشا دەدات ، وێنەی پادشا دەهاتە پێش چاوی: لەسەر کورسییەکی زێڕی شکۆدار دانیشتووە و تاجێکی پادشایی لەسەر ناوە ، بەڵام نەیدەزانی پادشا لەو ژوورەدا دەبێ چی بکات؟! ئەی چۆن خواردن و خواردنەوە ناخوات ؟! دیارە پادشا نان و ئاو ناخوات...

لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنیدا وێنەی ناو ژوورەکەش لە زەینی "موهتەدا " دەگۆڕا ، لەوە گەیشت نابێت پادشا لەو ژوورەدا بێت ، (ئەی چی لەو ژوورەدایە؟! ئەو ژوورە خەزێنەکەی بابمە و پڕە لە زێڕ و زیو و پارە ، باشە بابم ئەو هەموو پارەیەی بۆ چی یە؟! لە کوێ هێناویەتی؟! لەوانەیە خەزنەی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دۆزیبێتەوە ! هەموو ئەو زێڕ و زیوە بۆ منە ، کەس ناتوانێت لێمی داگیر بکات ، منیش وەکو بابم کلیلەکەی لە گیرفانم دەنێم ، شەوان دەرگاکەی دەکەمەوە ، چرایەك لەگەڵ خۆم دەبەمە ژوورەوە ، با کەس نەزانێت ، ئەی ئەگەر دز هات چی بکەم؟ واباشە تفەنگێك بکڕم ، دەیکوژم ، نا ، نایکوژم ، بەڵام دەیترسێنم ، دزەکە هەڵدێت ، منیش هەندێك لە دووی ڕادەکەم ، تا کوێ لە دووی ڕا بکەم ؟ تا سەر کۆڵانەکە... نا ، زۆرە ، دزەکە بۆم دەگەڕێتەوە ، زۆر ناچم لە دووی ، تا بەر دەرگاکەی خۆمان ، تا ئەو جێگەیە بەسە...)

بەڵێ ، بەوجۆرە "موهتەدا " ئەو قۆناغەشی بەڕێ کرد ، دواتر لەوە گەیشت لەو ژوورەدا شتێك هەیە لە زێڕ و زیو بەنرخترە بۆیە بەو چەشنە بابی پارێزگاری لێدەکات ، لەوە گەیشت ئەو ژوورە بریتی یە لە مێژوو و سەروەری بنەماڵەکەیان ، بەڵام زۆر تامەزرۆ بوو بۆ بینینی تەواوی ئەو نهێنیانەی لەو ژوورەدا پارێزگاری لێکراوە...

شەوێك "موهتەدا " لە ژوورەکەی خۆی خەریکی خوێندنەوە بوو ، بابی تەقەی لە دەرگا دا و هاتە ژوورەوە ، "موهتەدا " لەبەری هەستا و فەرمووی لێکرد ، بابی پێی وت: ( دەمەوێ ئەم شەو دەرگای ژوورەکە بکەمەوە و هەموو نهێنییەکانت بۆ والا بکەم)

"موهتەدا " لەخۆشیدا هەموو گیانی کەوتە لەرزین و وتی: ( لە منداڵییەوە تامەزرۆی بینینی ناو ئەو ژوورەم)

مەنسوور: ( هەستە وەرە لەگەڵم )

"مەنسوور" لە پێشەوە و "موهتەدا " بە دوایدا بە ڕاڕەوەکەدا تێپەڕین و لەبەردەم ژوورەکەدا وەستان ، "مەنسوور" کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و قوفڵە زەبەلاحەکەی پێ ترازان و پاشان کلیلێکی درێژی دەرهێنا و لە کێلۆنی دەرگاکەی نا و یەك دوو جارێك بەلای ڕاستدا چرکەی پێ کرد و کلیلەکەی دەرهێنایەوە و لە گیرفانی نایەوە ، بە وتنی ناوی خودا دەستی برد بۆ دەسکی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەرگاکە و کردییەوە ، پێشەکی خۆی چووە ژوورەوە و "موهتەدا " ش بە دوایدا...

ژوورەکە بە بۆنی خۆش لێوان لێو بوو ، زۆر بە جوانی شتەکانی ناوی ڕێکخرا بوون ، ژوورێکی بەرین درێژییەکەی خۆی لە " هەشت " مەتر نزیك دەکردەوە و پانییەکەشی لە "شەش " مەتر کەمتر نەبوو ، یەك فەرشی گەورەی "هەزار" ڕەنگ لە ژوورەکەدا داخرا بوو ، دیار بوو "مەنسوور" ی بابی بە تایبەت بۆ ئەو ژوورەی بە دروست کردن دابوو ، لای ڕاستەوە و نزیك بە دەرگاکە خەنجەر و شمشێر بوو کە لە ناو جامی شووشە نرابوون ، هەر پارچەیەك ناوێکی لەسەر نوسرا بوو کە بۆ باپیران و گەورە پیاوان دەگەڕایەوە ، لە ڕیزی خەنجەر و شمشێرەکان پێنج– شەش جۆر تفەنگ و دەمانچە لە پاڵ یەکتردا – بە نووسینی ناو لە سەریان – دانرابوون ، هەموو ئەوانەش لە شووشە نرا بوون ، لەو دیو ئەوانەوە چەندین جۆری جل و بەرگ دەق کرا بوو ، دیار بوو بۆ سەردەمەکانی پێشووتر دەگەڕایەوە ، هەندێك لەو جلوبەرگانە جلوبەرگی سەربازی بوون ، دواتر ئەو دیاری و بەخششانەی لە باپیری مەزن "مەروان" ە وە تا "مەنسوور" بە دەستیان گەیشت بوو بە جوانترین شێوە ڕێکخرا بوون ، پەیکەری فیلێك لە زیو دروست کرابوو ، قەڵایەك لەگەڵ سەربازی ناو قوڵلەکانی کە لە قوڕقوشم دروست کرابوو، ئەو قەڵایە لە لایەن یەکێك لە گەورە پیاوانی شێخانی نەهری یەوە پێشکەش بە بابی "مەنسوور" کرا بوو ، قووتوویەکی توتن ، بەڵام لە زێڕ دروستکراو لەگەڵ چەندین جۆری چەرخ ، پەیکەری گایەکی لە زیو دروستکراو شاخەکانی لە شێوەی شمشێردا بوون ، چەندین مەدالیای زێڕ و زیو کە پێشکەشی باپیرانی کرا بوو ، لە پشتی دیارییەکانەوە چەند دار عەسا و گۆچان ڕیز کرا بوون ، دار سەوڵەجانێك بەسەر هەموویاندا هەڵواسرا بوو ، "موهتەدا" نووسینەکەی خوێندەوە ، لەسەری نوسرا بوو " سەوڵەجانی دەستی میر محەمەدی ڕەواندز "، یەکێك لە دار عەساکان بۆ "پیری مەزن " دەگەڕایەوە ، "مەنسوور" ڕووی لە "موهتەدا " کرد و وتی: ( ئەو دار عەسایە داری دەستی پیری مەزن بوو، کاری سەیر و سەمەرەی بەو دار عەسایە دەکرد ، بە بەرکەوتنی ئەو دار عەسایە نەخۆش لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کارەی سەخت و گران بوایە " پیری مەزن " عەساکەی بۆ ڕەوانە دەکرد و کارەکەی جیٚ بەجیٚ دەبوو ، لە کاتی ترس و شڵەژاندا ئەو دار عەسایە بە پشتی هەر کەسیٚکدا بهیٚنرابایە بە ئارامی و ئازایەتی لیٚوان لیٚو دەبوو ، من بۆخۆم هەندیٚك شتم بەو دار عەساوە بینیوە کە ناتوانم تەنانەت لە لای تۆش باسی لیٚوە بکەم "

ڕیزی لای چەپ کۆمەڵیٚك قاپ و دەوری و فەخفوری و کەوچك و قۆری شووشە و شەکردان و چەندین پارچەی تری گرانبەها بوو کە هەندیٚکیان لە چین و ئیٚرانەوە بە تایبەت هیٚنرا بوون ، چەند فەرشیٚك بە لولکراوی هەڵگیرا بوو نرخی هەریەکەیان هەزاران دینار بوو ، فەرشیٚکی دوو بە یەك بەسەر دیوارەکەدا داکوترا بوو ، میٚژووەکەی بۆ زیاتر لە چوار سەد ساڵ دەگەڕایەوە و لە ژیٚریدا نوسرا بوو " تان و پۆیەکانی بە ئاوی زیٚڕ ئاو دراوە "، لەسەر میٚزیٚك و لە ناو شووشەدا قورئانیٚکی دەستنووس هەڵگیرا بوو کە دایکی "مەروان" بە دەستی خۆی نووسیبوویەوە و سەیرکەرانی بە جوانی خەتەکەی مەدهۆش دەکرد ، بەرماڵیٚکی لە تەنیشت دانرا بوو ، "مەنسوور" دەیوت: دەڵیٚن بابی ئەو ئافرەتە خواناسە کە قورئانەکەی نووسیوەتەوە هیچ داوایەکی لەسەر ئەم بەرماڵە لە لای خودا نەگەڕاوەتەوە ، لە ساڵی بیٚ بارانیدا لەسەر ئەو بەرماڵە دوعا کراوە و ئاسمان بە ماوەیەکی کەم ڕەحمەتی خۆی داباراندووە...

پاشان هەردوو لە بەردەم سندوقیٚکی زۆر گەورەدا وەستان و "مەنسوور" ڕووی لە "موهتەدا" کرد و وتی: ( دەزانی ئەم سندوقە چی تیٚدایە ؟! )

موهتەدا: ( نەخیٚر بابە گیان ، چی تیٚدایە؟! )

مەنسوور: ( ئەم سندوقە چەند کتیٚبیٚکی دانسقەی تیٚدایە کە لە هەموو دونیادا زۆر دەگمەنن ، بەڵکو دەتوانم بڵیٚم لە هیچ جیٚگەیەکی تر ویٚنەی ئەوانەی تیا بەرچنگ ناکەویٚت )

موهتەدا: ( ئەو کتیٚبانە لەسەر چین و دەربارەی چی قسە دەکەن؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( کتێبی یەکەمیان لە دەستی "پیری مەزن"ە وە بە من گەیشتووە و قسە لە عیرفانێك دەکات کە لە کۆن و نوێدا باسی لێوە نەکراوە ، نالێم کتێب لەسەر عیرفان نەنوسراوە ، بەڵکو دەڵێم ئەو مەنهەجەی ئەم کتێبە لە عیرفان دەیگرێتە بەر پێشتر بەرچاو نەکەوتووە ، پیری مەزن دەیوت: " ئەو ڕێگایەی لەو کتێبەدا بەیان کراوە کورتترین و ئاسانترین ڕێگەیە بۆ گەیشتن بە خودا.. "

کتێبی دووەمیان باس لە زانستی پیت ( علم الحروف ) دەکات ، لە "محەمەد " ی باپیری بابمەوە بۆمان بەجێماوە ، زانستی پیت شێخی گەورە " ئیبن عەرەبی " کاری گەورەی تێدا کردووە و یەکێکە لەو زانستانەی لە دونیای ئیسلامدا سەرەتای بۆ دامەزراوە و دواتر لە گەشە وەستاوە و پووکاوەتەوە...

کتێبی سێیەم باسی زانستی لێکدانەوەی خەون ( تأويل الرؤيا ) دەکات ، بە ڕێگەیەکی زۆر زانستیانە قسە لە خەون بینین و لێکدانەوە و ڕەمزییەتی خەون دەکات ، دەڵێن بۆ بنەماڵەی داپیرەی مەزن هاوسەری " مەروان " دەگەڕێتەوە...

کتێبی چوارەم باس لە زانستی بۆن و چۆنێتی دروست کردنی بۆنە نایابەکان دەکات ، لە نووسینی " پیری مەزن " خۆیەتی ، زانستێکی زۆر ورد و تایبەتە و هەموو کەسێك پەی بە نهێنییەکانی نابات ، "پیری مەزن " بەڵێنی لێوەرگرتووم زانستی ناو ئەو کتێبە پارێزگاری لێ بکەم، بەلاَم لە کاری بازرگانی کردن بە بۆن دەستی هەزاران و کاسپکاران بگرم و فێری کەسابەتیان بکەم و بازاڕیان بۆ بکەمەوە ، زانستی ناو کتێبەکە زانستێك نییە مرۆڤ بە خوێندن لێی حاڵی ببێت ، بەڵکو ڕۆحی بالاَ و بیری قووڵ و خەیاڵی بەرینی گەرەکە ، بۆیە بلاَوەکردنی ئەو زانستە بە زیان بەسەر مەردوومانڎا دەشکێتەوە...)

موهتەدا: ( چی تر لەناو سندوقەکەدایە؟! )

مەنسوور: ( یاداشتنامەیەکی "محەمەد" ی باپیرمی تێدیە کە کتێبێکە و بە دەستی خۆی نووسیویەتەوە و بە وردی باس لە ژیانی خۆی و بەشداری ڕاپەڕینەکەی " شێخ عەبدولسەلامی بەرزان و شێخ سەعیدی پیران" دەکات...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( ئەو کتێبەت خوێندۆتەوە ؟)

مەنسوور: ( بەڵێ ، زۆر بە وردی )

موهتەدا: ( دوای گەڕان بەم باخچە هەزار ڕەنگەدا پێم خۆشە کورتەیەکم لەسەر ژیانی "محەمەد " ی باپیرت بۆ باس بکەیت )

مەنسوور: ( من بۆت باس دەکەم ، بەلاّم خۆت دەبێت بە وردی کتێبەکە بخوێنیتەوە)

موهتەدا: ( چی تر لە سندوقەکەدایە ؟)

مەنسوور: (کۆمەڵێك نامە و وەسیێتنامەی تێدایە کە لـ، باپیران و کەس و کارەوە بۆمان بەجێماوە ، ژیانی "عوبەیدوڵلاّ " ی باوکم لە لایەن خۆیەوە نووسراوەتەوە و لەم سندوقەدا پارێزراوە ، کۆمەڵێك وێنەی تێدایە هەندێکی بەدەست کێشراوە و هەندێکی فۆتۆغرافە ، قورئان و بەرماڵ و تەزبێحەکەی دایکم لەم سندوقەدا پارێزگاری لێکراوە ، هەموو جارێك دەریان دەهێنم و تێر بۆنیان دەکەم و یادی منداڵی خۆم و گەنجێتی دایکم دێتەوە بەر خەیاڵم ، ئێستاش ئەو شتانە بۆنی دایکمیان لیّ دێت...)

دوای چەند کاتژمێرێك مانەوە و بینینی چەندین توحفە و شتی دەگمەن و نایاب لە ژوورەکە هاتنە دەرەوە و "مەنسوور" دەرگاکەی قوفڵ کرد و بۆ دیوەخانەکە هاتنەوە ، "مەنسوور" دوو کلیلی دەرهێنا و لە یەکتری جیاکردنەوە و دانەیەکیانی دا بە "موهتەدا " و دانەکەی تریانی خستە گیرفانەوە و بە "موهتەدا " ی وت: ( پارێزگاری لەو کلیلە پارێزگاری یە لە ڕەگ و ڕیشەی بنەماڵەکەت ، بۆیە لە جێگەیەکی زۆر نهێنیدا هەڵیبگرە و تەنها ئەو کاتانە دەری بهێنە کە دەتەوێت سەردانی ژوورەکە بکەیت ، مۆڵەتت نییە جگە لە خۆت کەسی تر ببەیتە ناو ئەو ژوورە ، چەندین ساڵە ئەو ئەمانەتانەم پارێزگاری لێکردووە تۆش وەکو گیان و چاوی خۆت بیانپارێزە ، بە درێژایی تەمەنم ئەگەر شەوێك لە ماڵەوە نەبوو بم دوو پاسەوانم بۆ ئەم ماڵە گرتووە ، بۆ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەوەی تاکو بەیانی پارێزگاری لێبکەن ، من خەمی ماڵ و پارە و سامانم نەبووە ، خەمی ئەو شتانەم بووە بە ئەمانەت دراونەتە دەستی من...)

موهتەدا: ( ئێستا کاتی ئەوەیە کورتەیەکم لە ژیانی " محەمەد " ی باپیرت بۆ باس بکەیت)

مەنسوور: ( سەرەتا دەبێت دەست بخەیتە ناو دەستم و پەیمان و بەڵێنێکت لێ وەربگرم )

موهتەدا: ( لەسەر چی پەیمانم لێ وەردەگری؟!)

مەنسوور: ( لەسەر پارێزگاری لە ئەمانەتی بنەماڵەکەمان )

موهتەدا: ( بابە سەردەمی من سەردەمێکی جیاوازە و دەترسم نەتوانم بەڵێنەکەم ببەمە سەر و شەرمەزاری لای خودا و تۆش ببم )

مەنسوور: ( چەندە دەتوانی ئەوەندە پارێزگاری لێ بکە و لەسەری بەردەوام بە ، من نەمتوانی دروست وەکو بابم ڕەوگەی باپیرانم بگرمە بەر ، دەشزانم تۆش بە ئەندازەی منت پێ ناکرێت ، بەلام وەرگرتنی بەڵێنەکە بۆ ئەوەیە کەمتەرخەمی نەکەیت و کەم بایەخ تەماشای ئەو ڕەگ و ڕیشەیە نەکەیت)

موهتەدا: ( ئەمەیان دەتوانم )

مەنسوور: ( کەوابوو دەستت بێنە )

موهتەدا دەستی خستە ناو دەستی بابی و ئەویش پێی وت: (هەرچیم وت بە دوامدا بیڵێرەوە)

موهتەدا: ( بەڵێ )

مەنسوور: ( بەڵێن دەدەم پارێزگاری لە هەموو ئەو شتانە بکەم لە بنەماڵەکەمەوە بۆم بەجێماوە)

موهتەدا: ( بەڵێن دەدەم پارێزگاری لە هەموو ئەو شتانە بکەم لە بنەماڵەکەمەوە بۆم بەجێماوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( بەڵێن دەدەم ڕێگە و ڕەوگەی ئەوان بزر نەکەم کە ڕێگەی پیاوچاکان و جوامێرانە )

موهتەدا: ( بەڵێن دەدەم ڕێگە وڕەوگەی ئەوان بزر نەکەم کە ڕێگەی پیاوچاکان و جوامێرانە )

مەنسوور: ( بەڵێن دەدەم هەرچی لە توانامدا بێت بۆ خزمەتی میللەت و نەتەوەی خۆمی بەخت بکەم )

موهتەدا: ( بەڵێن دەدەم هەرچی لە توانامدا بێت بۆ خزمەتی میللەت و نەتەوەی خۆمی بەخت بکەم )

مەنسوور: (خودایە تۆ شاهید بە لەسەر ئەم پەیمان و بەڵێنانە)

موهتەدا: ( خودایە تۆ شاهید بە لەسەر ئەم پەیمان و بەڵێنانە )

پاشان دەستیان لە دەستی یەکتر دەرهێنا و "مەنسوور" وتی: (کوڕی خۆم ، من چۆن بەڵێنم لە تۆ وەرگرت ، بابم هەر بەم جۆرە بەڵێنی لە من وەرگرت و داوای لێکردم منیش بەڵێن لە منداڵەکانم وەربگرم ، بۆیە دەبێ تۆش بەڵێن لە نەوە و وەچەکانی خۆت وەربگریت )

موهتەدا: ( ئێستا ژیانی " محەمەد " ی باپیرتم بۆ باس دەکەی؟)

مەنسوور: ( بەڵێ ، محەمەد کوڕە تاقانەی " میران " ە ، وەك پێشتر باسم کرد بابی لە قەڵای " شەبتان " شەهید کرا و کوڕێك و دوو کچی لە شوێن بەجێما ، دایکیان ئازایانە و مەردانە پەروەردەی کردن و لەسەر وەسێتی بابی محەمەدی نارده بەرخوێندن و بوو بە یەکێك لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی ، پەیوەندی ڕۆحی و تێکەڵی کۆمەڵایەتی لەگەڵ شێخانی بەرزاندا هەبووە و ساڵانە بە سەردانیان چووەتە ئەو ناوچەیە ، لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلام دا محەمەدی باپیرم وەك زانایەك و خەباتگێرێك ڕوو لەو ناوچەیە دەکات و بەشداری جەنگی "سەری باز" دەکات و زیانێکی گەورە بە هێزەکەی " فازڵ پاشا " والی موسڵ دەگەیەنن و دواتریش هەمان والی سوپایەکی گەورە پێکەوە دەنێت و بۆجاری دووەم هێرش دەکاتەوە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" شێخ عەبدولسەلام" و لە ئەنجامدا بە خراپترین شێوە تێك دەشكێت و چەك و تەقەمەنییەكی زۆریش دەستی بەرهەڵستكارانی زوڵمی عوسمانی دەكەوێت ، لە ئەنجامدا توركەكان ناچاری ئاشتی دەبن و دوای گۆڕینی والی موسڵ "فازڵ پاشای داغستانی " بە " نازم پاشا " ئاشتی لەسەر چەند مەرجێك لە ناوچەكەدا كەوتە نێوان ئەمارەتەكەی "شێخ عەبدولسەلام" و سوپای دەسەڵاتی توركەكانەوە ، بە پێی بەندەكانی ڕێكەوتنامەكە ئەو چەك و تۆپانەی لە جەنگدا دەستی سوپاكەی شێخ عەبدولسەلام كەوت بوو دەبێت بۆ توركەكان بگەڕێتەوە و بەرانبەر بەوەش توركەكان دان بە ئەمارەتی "بەرزان" دا بنێن و باربووی هەموو زیانەكانیان بۆ بكەنەوە و خزمەتگوزاری لە قوتابخانە و خەستەخانە بگاتە ناوچەكەیان ، دواتریش مەدالیای پلە سێ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بە شێخ عەبدولسەلام درا ، دوای كودەتای سێیەمی ئیتتیحادییەكان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا " سلێمان نەزیف " لە جێگەی " نازم پاشا " كرا بە والی موسڵ ، ئەم والی یە كورد بوو، بەلام سەر بە ئیتتیحاد و تەرەقی بوو ، بانگی بۆ تۆرانییەتی توركەكان دەكرد و بۆ بلاوكردنەوەی فیكرەی "تۆرانییەت" لەوان بەجۆشتر بوو ، ئەو كەسێكی دڵ ڕەق و كینەدار بوو بەرانبەر بە گەلی كورد ، ویستی ئەمارەتی " بەرزان " بشێوێنێ و دەست بەسەر ناوچەكەدا بگرێت ، بۆ ئەو مەبەستە داوای لە " شێخ عەبدولسەلام" كرد خۆی تەسلیم بكات ، شێخ داواكەی " سلێمان نەزیف " ی ڕەد كردەوە و كەوتە ئامادەباشی، "سلییمان نەزیف"یش بە سوپایەكی گەورەوە و بە كۆمەكی هەندێ لە عەشایەرە داخ لە دڵەكانی ناوچەكە هەڵیان كوتایە سەر ئەمارەتی بەرزان ، سوپاكەی " شێخ عەبدولسەلام" بەرگرییەكی بێوێنەیان لە دێی " بلە " دا كرد و داستانێكی قارەمانێتیان تۆمار كرد، دواتر "شێخ" بۆی دەركەوت سوپاكەی " سلێمان نەزیف " و عەشایەرە ناپاكەكان چوار دەوری سوپاكەی ئەویان داوە و گەر بەردەوام بن خوێنێكی زۆر لەو مەیدانەدا دەڕژێت ، بۆیە سوپاكەی بەرە و سنووری ئێران پاشەكشێ پێكرد ، بەهاری " هەزار و نۆ سەد و چواردە " شێخ گەیشتە دێی ڕازان و چاوی بە شێخ " تەهای نەهری " كەوت ، دواتر بە هاوەڵی "سمكۆی شكاك " دەچێتە "ئازربایجان" و لەوێ چاوی بە جێگری "قەیسەر" و سەرۆكی سوپای خواروو دەكەوێت، دیارە لەو سەروبەندەدا " ڕووسەكان "بە گژدا چوونی توركەكان لە بەرژەوەندییان ناب...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

عەبدولسەلام " چاوەڕوانیی بکات ، شێخ دەگەڕێتەوە و بڕیاری بەرگری و بە کۆاداچوونی تورکەکان لە بادینانـدا دەدات ، بەڵام تورکەکان هەنگاو بە هەنگاو چاوەڕوانی گەڕانەوەی " شێخ عەبدولسەلام" یان دەکرد ، سەر ئەنجام بە ڕێگەی خیانەت و بەهۆی دەستەیەك مرۆڤی ناپاکەوە بە دیل دەگیرێت و ڕەوانەی موسڵ دەکرێ و لە دادگایەکی عەسکەریدا بە فەرمانی " سلێمان نەزیف " حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەردەکرێت و بە بێ وەرگرتنی ڕازامەندی سوڵتانی عوسمانی حوکمەکەی بەسەردا جێبەجێ دەکەن )

موهتەدا: ( محەمەدی باپیرت سەرئەنجامی چی بوو؟)

مەنسوور: ( دوای لە سێدارەدانی " شێخ عەبدولسەلام " بێ هیواییەك ڕوو لە پیاوانی شۆڕشەکە دەکات و بە ئازارەوە بۆ ناو ماڵ و خانەوادەیان دەگەڕێنەوە ، بەڵام لە ساڵی هەزار و نۆسەد و بیست و پێنج دا جارێکی تر شۆڕشی کوردان لە سەر دەستی "شێخ سەعیدی پیران" دژ بە تورکەکان بەرپا دەبێت و "محەمەد"ی باپیرم بەشداری لەو شۆڕشەدا دەکات و هەر لەوێش شەهید دەبێت و ئێستا گۆڕەکەی لە گوندێکی نزیك " پیران " ە)

موهتەدا: ( شۆڕشەکەی "شێخ سەعید" تا کەی بەردەوام بوو؟)

مەنسوور: ( لە شوباتی ساڵی هەزار و نۆسەد و بیست پێنج ڕاپەڕین وەك ئاگر بەربوویە پووشی وشك و ناوچە کوردییەکانی گرتەوە و سوپایەکی گەورە لە هەموو پارچەکانی کوردستانەوە لە دەوری "شێخ سەعید"کۆبوویەوە ، بەڵام دیسان خیانەت بەرۆکی کوردی گرتەوە و لە نیسانی هەمان ساڵدا لە ڕێگەی کوردێکی خائینەوە بە ناوی " قاسم بەگ " کە خزم و متمانەپێکراوی شێخ سەعید بوو لە سەر پردی "جهارپوور" شێخ بە دیلی دەگیرێت و دواتر تورکەکان لە سێدارەی دەدەن ، گیرانی شێخ سەعید وورەی شۆڕشگێڕان ناڕوخێنێ و لە جەنگی جەبهەوە بۆ جەنگی پارتیزانی بەرگرییان دەگۆڕن و لەو ناوەندەدا قارەمانێك بە ناوی " حاجو بەگ " سەرکردەی عەشیرەتی "هافرنکی " وەك سەرکردەی موجاهیدەکان دەردەکەوێت و تا ساڵی "هەزار و نۆسەد و بیست و حەوت " بەردەوامی بە شۆڕشەکە دەدات ، بەڵام دواتر بەهۆی نەبوونی پشتیوانییەوە چەك دادەنێن و سوود لەو لێبوردنە وەردەگرن کە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

موهتەدا: ( کێ لە دوای محمەدی باپیرمان بەجێ دەمێنێت ؟)

مەنسوور: ( سێ کوڕ و یەك کچ کە کوڕی بچووکیان عوبەیدوڵڵای بابی منە )

موهتەدا: ( ئەدی دوو کوڕ و کچەکەی تر؟)

مەنسوور: ( دوو کوڕە گەورەکەی " محەمەد " بەشداری شۆڕشەکەی " شێخ مەحمودی نەمر " دەکەن و لەو بەرگری و شۆڕشەدا هەردووکیان لە پاڵ یەکتردا بە شەهیدی سەر دەنێنەوە...)

موهتەدا: ( سەرئەنجامی شێخی نەمر چی دەبێت؟)

مەنسوور: ( "مەلیکی عێراق " زەندەقی لە "شێخی نەمر" چوو بوو، بۆ تیابردنی " شێخ " و شۆڕشەکەی هەموو شکستێکی تری قبوڵ بوو، لە ژێر چاودێری دەوڵەتی " بەریتانیا " دا "مەلیکی عێراق و ڕەزا شا" ناکۆکییە سیاسی و سنوورییەکانی خۆیان وەلا نا و لە "تاران" ڕێککەوتن لەسەر هێرش کردنە سەر " شێخ " و پێشمەرگەکانی ، ئەوکاتانە " شێخ " بۆ سەر سنووری "عێراق — ئێران" پاشەکشێی کرد بوو ، لە " پیران " ی" کوردستانی ئێران " نیشتەجێ بوو بوو ، دوای هێرش و پەلاماری دوو دەوڵەت بۆ سەر " شێخی نەمر " بە ناچاری خۆی تەسلیم بە " سکرتێری مەندوبی سامی بەریتانی لە عێراق" کرد کە لە "پێنجوێن"ە وە چاودێری جموجوڵی سەربازی شێخی دەکرد...)

موهتەدا: ( دوای شەهیدبوونی دوو براکەی " عوبەیدوڵلا " ی بابت لەگەڵ دایکی و خوشکێکی مانەوە ، پاشان چییان بەسەر هات ؟)

مەنسوور: ( بابم تەمەنی شازدە ساڵان دەبێت کاتێك "مەلا محەمەد" ی بابی لە شۆڕشەکەی "شێخ عەبدولسەلام" دا بەشداری دەکات ، لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی " قازی محەمەد " دا لە " کوردستانی ئێران " بابم بە بێ دوو دڵی ڕوو لە " مهاباد " دەکات و بەشداری ئەو شۆڕشە مەزنە دەکات ، ئەو کاتە تەمەنی "پەنجا " ساڵێك دەبوو ، بە شاهیدی ئەوانەی لەگەڵی بوون نموونەی ئازایەتی و قارەمانێتی بووە لە بەرگری شاری " مهاباد " دا ، دوای ڕووخانی "کۆماری مهاباد " و لە سێدارەدانی " قازی نەمر " بۆ " کوردستانی عێراق " گەڕایەوە و ئەو بەشە زۆر کەمەی تەمەنی بە گۆشەنشینی و خو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گوندەکانی نزیك بە سنوور — لە ترسی گرتنی لە لایەن حکومەتی مەلەکییەوە — لەگەڵ دوو دۆستی تری نیشتەجێ بوو ، تەنها یەك ساڵ لەو گوندەدا ژیا و کۆچی دوایی کرد کە تۆ ئەو کاتە تەمەنت چوار ساڵان بوو...)

موهتەدا: ( مردنەکەی " عوبەیدولا " زۆر بە مردنەکەی باپیری مەزنمان "مەروان " دەچێت ، هەردووکیان بە ئازاری شکستەوە گیانیان لە دەست داوە ، هەردوو سەرکردەکانیان شەهید دەکرێن و گیان فیداکانیان بەجێ دەهێڵن...)

مەنسوور: ( بەڵێ ڕاستە ، بەڵام بابم مەرگ مۆڵەتی نەدا ، ئەگینا ئەو بێ هیوا نەبوو بوو ، چاوەڕوانی هەڵگیرسانی شۆڕش بوو تاکو پەیوەندی پێوە بکات ، بەڵام مەرگ بەرۆکی گرت و شۆڕشی تری بە چاوی خۆی نەبینی...

لە " مەروان " ی باپیرە گەورەمانەوە وەسێت کرا بوو کە بەشداری شۆڕش و ڕاپەڕین لەسەر یەك بە یەکی ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە پێویستە و نەکردنی دەرچوونە لە ڕەوگەی باب و باپیران و وەرگرتنەوەی شەرەفی بنەماڵەیە لەو کەسە ، ئەمەیە نهێنی بەشداربوونی بەردەوامی بنەماڵەکەمان لە شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکاندا..

تەنها من ئەو شەرەفەم پێنەبڕا و وا خۆم دەبینم فەرمانی باب و باپیرانم شکاند بێت..)

موهتەدا: ( بابە تۆ ئەوەندە سەرەکۆنەی خۆت مەکە و خۆت سزا مەدە ، من دەبێ هەموو جارێك یادی تۆی بخەمەوە کە تۆ بە فەرمانی "سەرکردەی گەورە" لە شاردا ماویتەوە ، ئەگینا تۆ لە هەموو کەس زیاتر ئارەزووی هەڵگرتنی چەکت هەبووە)

مەنسوور سەرێکی ڕاوەشاند و وتی: ( بڵێم چی؟)

پاش بێدەنگی و خامۆشییەك "موهتەدا " سەیرێکی بابی کرد و وتی: ( بابە بۆ دەبێت مێژووی کورد مێژووی شکستە یەك لە دوای یەکەکان بێت؟ بڵێی کورد بۆخۆی هۆی ئەو شکستە زۆرانە نەبێت؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مەنسوور: ( دەبێ بزانیت ئەوەی بۆم باس كردووی نیوەی شكستەكانە ، هێشتا نیوەی ماوە و باسم لێوە نەكردووە)

موهتەدا: ( دەمەوێ بپرسم بەشی كورد لەو شكستانەدا كامەیە؟ چەندە خۆی تیایدا بەرپرسیارە و چەندە تاوانی دوژمنەكانی بووە؟)

مەنسوور: ( چەند شتێك بە بەردەوامی لە مێژووی ئێمەدا دووبارە دەبێتەوە ، لەوانە:

یەك نەبوونی كوردان ، خیانەت و ناپاكی ، نەبوونی سوپای مەشقدراو و ڕاهێنراو ، لەگەڵ نەبوونی پشتوپەنای باوەڕ پێكراو...)

موهتەدا: ( پرسیارەكە ئەوەیە بۆ وانەمان لە شكستەكانی یەكتر وەرنەگرتووە؟ بۆ شۆڕشە یەك لە دوای یەكەكان بە هەمان هەڵەی پێشووی خۆیانەوە تێپەڕیوون؟!)

مەنسوور: ( لە كوێ كورد پەرژاویەتی مێژووی شۆڕشەكان بنووسێتەوە و پاشان بیخوێنێتەوە و دەرسی لێ وەربگرێت ؟! ئێمە گەلێك بووین دوژمنان نەیان هێلاوە ببین بە خاوەنی فەرهەنگی گەورە، چونكە هەمیشە جەنگمان بۆ مان و نەمان بووە ، جەنگاوەر دەزانێت بجەنگێت ، وانە وەرگرتن لە مێژوو كۆمەڵێك جەنگاوەری تری گەرەكە ، بەڵام چەكی دەستی ئەو جۆرە جەنگاوەرە قەڵەمە ، قەڵەم بە دەست دەتوانێت هۆی شكستەكان و خاڵە لاوازەكان دیاری بكات و نەوەی نوێی لێ ئاگادار بكاتەوە ، جەنگاوەرانی قەڵەمداری ئێمە دوژمن ناچاری كردوون و قەڵەمەكانیان داناوە ، ئەوان پەلاماری شمشێریان داوە و شان بە شانی جەنگاوەرانی شمشێر بەدەست بەرانبەر دوژمن جەنگاون ، لەگەڵ ئەوەشدا مەیدانی قەڵەم بە تەواوی فەرامۆش نەكراوە و بناغەیەكمان بۆ داڕێژراوە و گەرەكە كەسانی وەك تۆ كاری لەسەر بكات و چینی نوێی لەسەر دابنێت...)

لێرەدا بێدەنگییەك باڵی بەسەریاندا كێشا و "مەنسوور" سەرینێكی لەخۆی نزیك كردەوە و سەری لەسەر دانا و خەو چاوەكانی داگرت و "موهتەدا" ش بە ئەسپایی دەرگاكەی داخست و ژوورەكەی بەجێهێشت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

— ٥ —

## جیلوە لە چاوەکانی میهری دا

خوێندنگەکەی " مەلای گەورە " ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشـە و بـەرە و پێشـچووندا بوو ، " مەلای گەورە" تەنها شاگردی بالاّ و بە تواناى لە خوێندنگەکەی دا قبولّ دەکرد ، ئەو شـاگردانەی کـە قـوولّ بوونەوەیـەکی تـەواویان لـە زانـستە جـۆرا و جۆرەکانــدا هــەبوو لــەو خوێندنگــەدا تاقیکردنەوەیــەك دەکــران و ئەگــەر سـەرکەوتنیان بـە دەسـت بهێنایـە ئـەوا وەردەگـیران ، ئەوانـەی دەردەچـوون و قبولّ دەکران شەرەفێکی زۆر گـەورەیان پـێ دەبەخـشرا ، چـونکە زۆر دەگمـەن بوو ئەوانەی لەو تاقیکردنەوەیەدا دەربچن و شەرەف وەرگرتن بەدەست بهێنن...

ئەو شاگردانەی لـە خوێندنگەکـەی " مـەلای گـەورە " بڕوانامـەیان بەدەسـت دەهێنا کەسانی زانا و هەڵکەوتوو بـوون و جێگـەی ڕێـزی مامۆسـتایان و زانایـان بوون ، ئەوەی خوێندنگەکەی بەناوبانگ کـرد بـوو کەسـایەتی زانـستی " مـەلای گەورە " و بە توانایی " موهتەدا" بوو ، ئەو دوو زانایە لەسـەرجەم زانـستەکاندا مەلـەیان دەکـرد ، ئـەوان لـە قـاڵبی تەقلیـدی وتنـەوەی زانـستەکان هاتبوونـە دەرەوە و لەسەر زانستە ئایینییەکان ڕا و بۆچوونی تایبەت بە خۆیان هەبوو...

یەکێك لە شاگردە بالاّکانی " مەلای گەورە" بە ناوی "مەلا عاسـی بەرقـەلاّ " لە کەڵکەڵەی گەورەبوون و بەدەست هێنـانی ناوبـانگی زانـستیدا بـوو ، بۆخـۆی کەسێکی زۆر زیرەك بوو ، بەلاّم خۆپـەرست و عاشق بە دەسـەلاّت بـوو ، شـەوی دەخستە سەر ڕۆژ و زانستەکانی م...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بۆ خۆ گەورەکردن و ململانێ لەگەڵ " موهتـەدا " بـوو ، ئـاواتی دەخواسـت لـە قۆناغی یەکەمدا – دوای بەدەست هێنانی بڕوانامەی مەلایی – بۆ وتنەوەی وانـە لـە خوێندنگەکـەدا بمێنێتـە و وەکـو " موهتـەدا " شـاگردی هـەبێت و جێگـەی سەرنجی " مەلای گەورە " بێت ، پاشان لە قۆناغی دووەمدا بتوانێت گرەو لە " موهتەدا" بباتەوە و پاش مردنی "مەلای گەورە" خوێندنگەکەی بکەوێتە دەست و ناو و ناوبانگی خۆی پێ گەورە بکات، بەم مەبەستە کەوتە هـەوڵی شـەو و ڕۆژ و جێگەی خۆ کردنەوە لە دڵی "مەلای گەورە" و شاگردەکانیدا...

"مەلا عاسی" دژ بە عیرفان و ڕێچەکە عیرفانییەکان بوو ، عاریفە مەزنـەکانی بە نەزان و گومڕا لە قەڵەم دەدا ، مرۆڤێ بوو تا سەر ئێسقان ڕووالەتگەرا و دوور لە مانا و جەوهەری ئایین ، بەڵام لە زانستی کەلام و عیلمی زاهیردا بـە قـەدەر " دە " شاگرد زانستی کۆ کردبـوەوە و بـەوەش کەسـانێکی سـەرەتا لـە ئـایین و زانستە ئایینییەکان پێی سەرسام بوو بوون...

زۆرجار بۆ نیشاندانی فراوانی زانستی خۆی پرسیاری گرانـی لـە زانـستەکاندا ئاراسـتەی "موهتـەدا" دەکـرد و دەیویـست پرسـیارێکی لـێ بگـیرێ و لـە لای شـاگردەکان مـەزنی کەسـیەتی زانـستی " موهتـەدا " لەکـەدار بکـا و خـۆی لەبەرچاویان گەورە بکات...

ئەو لە ئیدارەکردنی کاروباری شاگردەکانی ناو خوێندنگەکەدا کەسێکی زانا و لێزان و بە توانا بوو ، "مەلای گەورە" ئەرکی ئیدارە کردنی خوێندنگەکـەی بـەو سپارد بوو ، ئەو ئەرکەش خەونی بە دیهاتووی"مەلا عاسی" بوو...

"مەلا عاسی" بڕوانامەی مەلایی لە لای " مەلای گـەورە " وەرگـرت و لەسـەر داوای خـۆی و ڕەزامەنـدی " مـەلای گـەورە " لـە خوێندنگەکـەدا مایـەوە و لـە وتنەوەی وانە و بەڕێوەبردنی خوێندنگەکە بەردەوام بوو...

ئەو شەو و ڕۆژ لە قایمکردنی پێگەی دەسەڵاتی خۆیدا بـوو ، "موهتـەدا " ی بە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم گەیشتن بە حەزەکانی تەماشـا دەکـرد ، لـە دوای

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

چەسپاندنی جێگە پێی خۆی لە خوێندنگەکەدا کەوتە بەگەڕخستنی پیلانەکانی دژ بە " موهتەدا "..

هەندێك جار بە تەنها دەچووە لای " مەلای گەورە " و قسە و باسی لەسەر " موهتەدا " بۆ "مەلای گەورە " دەگواستەوە ، وای لە "مەلای گەورە " دەگەیاند گوایە " موهتەدا " لای شاگردەکان وا نیشان دەدا " مەلای گەورە " شاگردی ئەوە و بە زانستە نایابەکانی"موهتەدا" ئاتاجە ، یاخود دەیوت: "موهتەدا مێشکی شاگردەکانی بە هەندێك ڕا و بۆچوونی خراپ و دژ بە ڕێگەی سەلەفی سالّح تێکداوە ، گەر کار ئاوا بڕوات ئەم شاگردانە تێك دەچن و خوێندنگەکەشمان لەکەدار بێت.."

" مەلا عاسی " بەو قسانە سینەی " مەلای گەورە " ی لە "موهتەدا "پڕ کرد و کەوتە بیرکردنەوە لەوەی گەر بۆ ماوەیەکیش بێت " موهتەدا " کەنارگیر بکات ، " مەلای گەورە " چەند شاگردێکی بانگ کرد و ڕاستی و ناڕاستی ئەو قسانەی لێپرسین و ئەوانیش -- جگە لە یەك کەسیان کە " مەلا عاسی " بە گوێیدا چرپاند بوو -- هەر هەموو شاهیدی پاکی و چاکی " موهتەدا " یان دا و هەموو ئەو قسانەیان ڕەد کردەوە ، پاشان " مەلای گەورە" بانگی " موهتەدا " ی کرد و لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ و ناڕاستەوخۆ ئەو قسانەی بۆ خستە ڕوو ، "موهتەدا " زۆر بە ئەدەبەوە شاگردیی خۆی بۆ " مەلای گەورە " نیشان دا و ئەگەری بوونی هەر حەز و کەڵکەڵەیەك کە مامۆستای گەورە پێی ڕازی نەبێت نەریٚ کرد...

" مەلا عاسی " لە هەوڵی شەو و ڕۆژیدا بۆ لەکەدار کردنی "موهتەدا " دەگەڕا و ئەوەندە قسەو باسی بۆ "مەلای گەورە " گواستەوە تا بڕیاریدا -- بۆ تاقیکردنەوەش بێت -- ماوەیەك "موهتەدا" کەنارگیر بکات و داوای لیٚ بکات وانە بە شاگردەکان نەڵێتەوە...

" موهتەدا " زۆر بەڕێزەوە داواکەی " مامۆستای گەورە " ی وەرگرت و زۆر سوپاسی کرد بۆ ئەو ماوە مۆڵەتەی کە پێیداوە و تیایدا دەتوانێت بە خۆی وکار و بارەکانیدا بچێتەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەلا عاسی " ڕێگەی بۆ تەخت بوو ، وانـە و کاروبارەکـانی "موهتـەدا " ی گرتـە دەسـت و هـەوڵی دەدا ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ جێگـە و پێگـەی خـۆی لـە خوێندنگەکەدا قایمتر بکات ، " مـەلای گـەورە " ش بـە وردی کەوتـە چـاودێری کردنی " مەلا عاسی " و خوێندنگە و شاگردەکان ، تاکو بزانێت بە دیارنـەبوونی " موهتەدا " چ گۆڕانێك لەو خوێندنگەیەدا ڕوودەدات...

" مەریەم " مژدەی دا بە " موهتەدا " منداڵیان بەڕێوەیە ، ئەو مژدەیە بۆ " موهتەدا " و دایك و باوکی خۆشییەکی بێ سنوور بوو ، مانای ڕۆشـنی وەجـاخ و کوێر نەبوونەوەی ئاگری بنەماڵەکەی دەگەیانـد، دوای نـۆ مـانگ خـودا کـوڕێکی چاوگەشی پێ بەخشین و بە ناوی باپیرەی مەزنیانەوە ناویان لێنا " مەروان " ، " مەروان " ڕۆشنایی ماڵەکەیان بوو ، " مەنسوور " ی باپیری لـە " موهتـەدا " زیاتر خۆشیدەویست ، ئەو هەموو جارێك دەیوت:

" ئێستا دوو کوڕم هەیە: " موهتەدا و مەروان"

نزیکـەی سـاڵێك بەسـەر کـەنارگیر کردنـی " موهتـەدا "دا تـێ پـەڕی ، لـەو ماوەیـەدا بـە کـاری مامۆسـتاییەوە لـە قوتابخانـە سـەرقاڵ بـوو ، ئـەو وەك مامۆسـتایەکی " فیزیـا " لـە لای هـەموو مامۆسـتایان و قوتابیـانی شـارەکەی ناسراو بوو ، لە قوتابخانەکانی ترەوە بۆ گوێگرتن لە وانـەکانی دەهـاتن ، چـەند جارێك پەروەردە دەیویست بۆ قوتابخانەیەکی نموونەیی بیگوێزێتەوە ، بەڵام لە یەکەمین قوتابخانەی خۆی مایەوە و دەیوت " پێم خۆشە لەگەڵ منداڵی هەژاران و نەداراندا بمێنمەوە ، چونکە قوتابخانەکە لە گەڕەکێکی هەژاری شاردا دروست کرا بوو ، زۆربەی خوێندکاراکانیش لە خانەوادە هەژارەکانەوە هات بوون...

لەسەر داوای بەڕێوەبەر و چەند مامۆستایەك — لە سەرەتای ساڵەوە — پۆلی پێنجـەمی زانـستی وەرگـرت و دەسـتی بـە وانـە وتنـەوە کـرد ، هـەر قۆناغێـك "موهتـەدای مـودەڕیس " وانـەی " فیزیـا " ی پـێ بوتبانایـە ئـەو قۆناغـە خۆشـبەخت و سـەرکەوتوو بـوون ، زۆرجـار لـە نێـوان خوێنـدکارانی قۆناغـە جیاجیاکان دا لەسەر "موهتەدای مودەڕیس " گرفت سەری هەڵدەدا و ئیـدارەی ناچار بە دەستێوەردان دەکرد...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

قۆناغی پێنجەمی زانستی "شەش" پۆل بوو ، خوێندكارەكانی ژووری سێیەم كە بە "هۆبەی جیم" بەناوبانگ بوو بە ئارامی و ئەدەب و زیرەكی لێوان لێو بوون ، یەكێك بوون لەو پۆلانەی وانەی فیزیایان ئەوەندە لا شیرین بوو لە كاتەكانی پشووشدا دەهاتنە لای مامۆستا "موهتەدا" و گوێیان لە وانەكەی دەگرت ، " موهتەدا " بارێكی دەروونی تایبەت بەرانبەر بە "هۆبەی جیم " داگیری كرد بوو ، ئەو ترس و سامێكی زۆری لەو هۆبەیە هەبوو ، زۆرجار بۆ خۆ رزگاركردن لەو هۆبەیە خوێندكارەكانی "هۆبەی جیم " ی بۆ پۆلێكی تر دەگواستەوە ، لە هۆبەكەی تر ترسی كەم دەبوویەوە ، بەلأم بە تەواوی بنبڕ نەدەبوو...

ترسی "موهتەدا" لەو پۆلە نامۆیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو ، لە یەكێك لە ڕۆژە ساردەكانی زستاندا " موهتەدا " ڕووی لە "هۆبەی جیم" كرد و ئەو ڕۆژە سام و ترسی لە لوتكەدا بوو ، چەند جارێك ویستی ژوورەكە بەجێ بهێڵێت ، بەلأم لەبەر پرسیاری ئیدارە و خوێندكارە كچەكان خۆی ڕاگرت و نەچووە دەرەوە ، لە كاتی نووسین لە سەر تەختە ڕەشەكە یەك — دوو جار دەیویست بەربێتەوە ، بەلأم بە دەست گرتن بە دیوارەكەوە خۆی ڕادەگرتەوە ، خوێندكارێكی كچ پرسیاری تەندروست باشیی لە مامۆستا كرد و ئەویش لە وەلأمیدا وتی "كچم ، من باشم "

خوێندكارە كچەكان هەستیان بە تێكچوونی باری تەندروستی مامۆستاكەیان كرد ، كورسییەكیان بۆ هێنا و لەسەری دانیشت و داوای لە یەكێك لە خوێندكارە زیرەكەكان كرد بڕواتە جێگەی ئەو و وانەكە بۆ خوێندكارەكان تەواو بكات....

" میهری " یەكێك بوو لە خوێندكارە كچەكان ، ئەو كەسێك بوو لێوان لێو بوو بە ئارامی و شەرم ، دەریایەك بوو مەلەوانی شارەزاش نهێنییەكانی بۆ دەرنەدەهات ، لە خانەوادەیەكی هەژار بوو ، بەلأم بە قەدەر كچی پادشایەك سەنگ و قورسیی هەبوو...

" موهتەدا " ڕوو بە خوێندكارە كچەكان دانیشت بوو ، سەرنجێكی " میهری " دا ، بە بینینی چاوەكانی " م

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كورسییەكەی بەربوویـەوە ، خوێنـدكارە كـچەكان مامۆسـتایان بـەرز كـردەوە و ئیدارەیان لێ ئاگادار كرد ، یەكێك لە مامۆستاكان بە هاوكاری چەند مامۆستایەك سواری ئۆتۆمبێلێكیان كرد و گەیاندیانە نەخۆشخانە ، چوار ڕۆژ لـە نەخۆشـخانە بە بێ هۆشـی مایـەوە ، پزیشكەكان لـە نەخۆشـییەكەی " موهتـەدا " سـەریان دەرنەدەكرد ، ئەوەندەیان دەزانی لێدانێكی كتوپڕ بەسـەریدا هـاتووە و تووشـی ئەو حاڵەتەی كردووە ، " موهتەدا " لە نەخۆشخانە دەركرا و لـە ژێـر چـاودێری خێزانەكەیدا لە ماڵەوە مایەوە....

"مەنسوور"ی بابی چووە ژوور سەری "موهتەدا " و لە حاڵەتەكەی پرسی: ( كوڕم ، چیت بەسەر هاتووە ، لە چییەوە ئەم حاڵەتە ڕووی تێكردی؟! )

موهتەدا: ( بابە لە چاوەكانییەوە نوور هەڵدەقووڵی! )

مەنسوور: (چاوی كێ ؟!)

موهتەدا: (چاوەكانی "میهری")

لەگەڵ وتنی: " چاوەكانی میهری "، هـاوارێكی توونـد لـە " موهتـەدا" بـەرز بوویەوە و جارێكی تر لە هۆش خۆی چوو ، پـاش ماوەیـەك بـە ئاگـا هاتـەوە و بابی داوای لێ كرد هێمن ببێتەوە ، چونكە ئەو حاڵەتە بەسەر عاریفە مەزنەكاندا هاتووە...)

" موهتەدا " پرسیاری لە بابی كرد: ( نهێنی ئەو حاڵەتە لە چیدایە؟! )

مەنـسوور: ( ئـەو دیاردەیـە بـریتی یـە لـە جیلـوەكردنێكی نـووری خـودا لـە دروستكراوەكانیدا ، ئەوانەی دەگەنە پلەی باڵای نزیك بوونەوە لە خودا دەگەنـە جیلوەكردنی ئەو نوورە پاكە...)

" موهتەدا " لەسەر جێگەكەی بەرز بوویـەوە و بەرلـەوەی لەسـەر پێیـەكانی خۆی بوەستێت بەربوویەوە و دیسانەوە ئاگای لەخۆی بڕا...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بە درێژایی چەند مانگێك " موهتەدا " ژیانی لە نێوان بێهۆشی و ئاگاهیدا بوو ، "مەریەم"ی هاوسەری و"مەعسومە"ی دایکی بەزۆر خـواردن و خواردنـەوەیان دەرخوارد دەدا ، هاواری دەکرد و دەیوت:

" پیسیم دەرخوارد مەدەن... "

"مەنسوور" ی بابی داوای لـێ دەکـردن لـەوە زیـاتر ئـازاری نـەدەن و بـەزۆر خواردنی دەرخوارد نەدەن ، جەستـەی " موهتـەدا " توایـەوە و بـوو بـە چـڵ و چێو ، مامۆستایان و خوێندکارە کچەکان چەندجار سـەردانی " موهتـەدا " یـان کرد و نەیانتوانی ببینن ، چونکە لە بێئاگایدا بوو...

لە ماوەی دوور کەوتنەوەی " موهتەدا " لە قوتابخانە " میهری"یش پەسـتی و شـێواوییەك ڕووی تـێ کـرد و قوتابخانـەی بـەجێهێلا ، مامۆسـتایان و کـەس و کاری زۆریان هەوڵدا "میهری" بۆ قوتابخانە بگێڕنەوە ، بەڵام سوودێکی نـەبوو ، " میهری " هێـزی زاڵبـوونی بەسـەر خۆیـدا لـە دەسـت دا و شـەو و ڕۆژ هـاواری دەکرد:

" مامۆستا ، موهتەدا ، داری زەیتوون ، کێوی توور "

هاوەڵەکانی "میهری" سەردانیان دەکرد و پێیـان دەوت " بۆچـی خـۆت ئـاوا لێ دەکەیت؟ تۆ نابێت ئازاری خۆت بدەیت ، بەزەیییەکت بەخۆت و بـە ئێمـەش دا بێتەوە "

"میهری" بەم هۆنراوەیە وەڵامی هاوڕێ کچەکانی دەدایەوە و دەیوت:

ئێمە بەوەوە زیندووین

کە ئارام نەبین

شەپۆلین و

بە ئارام گرتن لە بەین دەچین...

پـاش ماوەیـەك کـەس و کـاری ڕەوانـەی نەخۆشـخانەی دەروونییـان کـرد و خستیانە ژێر چاودێریی پزیشکییەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەلا عاسی " و نەیارانی " موهتەدا " کەوتنە توانج و تانە لە "موهتـەدا " و لـەناو خەڵکیـدا بلاویـان کـردەوە گوایـە " موهتـەدا " عاشـقی یـەکێك لـە خوێندکارە کچەکانی خۆی بووە و لەو رێگەیەدا ئـەقڵی لـە دەست داوە و شـێت بووە ، ئەوان تێیان دەپەڕاند و دەیانوت:

چ تاوانێکی گەورەیە مامۆستایەك کچێکی تەمەن حەڤدە ساڵان فریو بدات و تووشی شێتێتی و نەخۆشخانەی بکات... !

" مەنسووری عەتتار " هەموو ئەو قسانەی لـە بـازاڕدا دەبیـستەوە و پـڕ بـە دونیایەك خەمی لێ دەخوارد ، خەمی لە نەزانی و بێ ویژدانی خـەڵك دەخـوارد ، ئەو دەیزانی " موهتەدا " ی کوڕی مرۆڤێکی چاك و پاکە و لە پلەیەکی گەورەی عیرفاندا دەژی و ئەوەی بەسەری هاتووە تاقیکردنەوەیەکی خودایە و رۆژێ دێت لەو تاقیکردنەوەیە دەردەچێت و بۆ مەقامی بەرزی "تەمکین " دەگەڕێتەوە...

" موهتـەدا " پـەتی ژێـری پـچڕا و لـە جێگـەی نەخۆشـیەکەی هەستایەوە و کەوتە ناو بازاڕ و سەرشەقامەکان ، "مەنسوور " ی بابی چەند جارێك هـەوڵی دا لە ماڵەوە بەندی بکات ، یاخود ڕەوانـەی نـاو نەخۆشـە دەروونییـەکانی بکـات ، بەڵام بە ڕێگە نەێنی و مەعنەوییەکەی خۆی ئاگادار دەکرایەوە و فـەرمانیان پـێ دەدا بەر لە " موهتەدا " نەگرێت و لێگەڕێت با بە شەقامەکاندا بسووڕێتەوە...

بەیانی زوو "موهتەدا" لە ماڵەوە دەردەچوو ، شێوان دەگەڕایەوە ، سـەرەتا دەچوو بۆ مزگەوتی "پیری مەزن" و ماوەیەك لەوێ دەمایەوە و دواتـر ڕووی لـە باخچە بەرینەکەی ناو چەقی شار دەکرد و تا نزیکی نیوەڕۆ تیایدا پاڵ دەکـەوت ، دوانیـوەڕۆ دەهاتـەوە بـۆ بـازاڕ و دەسـتی بـە گـەڕان دەکـرد ، سـەرێکی ئـەو شەقامەی دەدا دەرگای قوتابخانەکەی خۆی دەکەوتە سـەر ، دواتـر دەچـوو بـۆ ئەو شەقامەی بە پاڵ نەخۆشـخانەی دەروونیـدا تێدەپـەڕی ، پـشتی بـە دیـواری حەوشەی نەخۆشـخانەکەوە دەنـا و تـا نزیکـی عەسـر لـەو جێگەیـە دەمایـەوە ، سەیر لەوەدا بوو لە دیوی دووەمی دیواری حەوشەکە و لە نـاو نەخۆشـخانەکەوە " میهری " دەهات و پـشتی بـەو جێگـەوە دەنـا کـە "موهتـەدا " لـە دیوەکـەی ترەوە پشتی پێوە نابوو ، زۆرجار پاسەوانەکان " موهتەدا " یـان دەر دەکـرد و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەرگرییان دەکرد لەوەی لەو جێگەیە دابنیشێت ، کاتێك " میهری " دەیزانی دەست بە ڕووی "موهتەدا " وە نراوە دەیدایە قووڵپەی گریان و هەموو نەخۆشەکانی نەخۆشخانەکەی لە خۆی کۆ دەکردەوە...

" موهتەدا "بە شەقامەکاندا دەگەڕا و ناو بە ناوێك بە هاوار و ناڵە و گریانەوە دەیوت:

چ مەیخانەیەکە چاوەکانی میهری !

سووتاو خانەیەکە سارای دڵی میهری !

لە دوای عەسر بۆ تەنیشتی مەیخانەکە دەکشا و هەتا شەو دادەهات لەو جێگەیە دەمایەوە ، هەندێك لەوانەی بە پاڵیدا تێ دەپەڕین ناوی "میهری " یان دەهێنا و " موهتەدا " هاوارێکی لێ بەرز دەبوویەوە و ماوەیەك بێ ئاگا دەبوو ، ئەو یەکێك بوو لە شێتەکانی بازاڕ ، لای خەڵکی شار بە " موهتەدای میهری " ناوبانگی دەرکرد ، شەوانیش بۆ نووستن بە شەکەتی بۆماڵەوە دەگەڕایەوە و "مەریەم" و دایکی و "مەنسوور" ی بابی پەلیان دەگرت و دەیانبردە حەمام و خاوێنیان دەکردەوە و هەندێك خواردنیان بە دەمەوە دەکرد...

حەوت ساڵ " موهتەدا " شێتی ناو کوچە و سەر شەقامەکان بوو ، بە درێژایی ئەو ماوەیەش "میهری" لە نەخۆشخانەی دەروونیدا بوو ، لەو ساڵانەدا " مەنسووری عەتتار " داوای لە "مەریەم " ی هاوسەری " موهتەدا " کرد خۆی بە " موهتەدا " وە نەبەستێتەوە و بۆ ماڵی بابی بگەڕێتەوە و ژیانی خۆی بۆ " موهتەدا " تیا نەبات ، چەند جارێك داواکەی لە "مەریەم " دووبارە کردەوە ، لە دواجاردا " مەریەم " بۆ ماڵی بابی گەڕایەوە و منداڵەکەشی لەگەڵ خۆی برد ، " مەریەم " بەو کارەی ماڵەکەی " مەنسوور " ی بێ ناز کرد و خانەی دڵی ئەو و "مەعسومە"ی هاوسەری وێران کرد ، لە دوای ڕۆیشتنی " مەریەم " و منداڵەکەی سروور و پێکەنین لە خێزانەکە بڕا و تەم و مژی خەم و پەژارە هەموو سووچێکی ماڵەکەی تەنییەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مەنسووری عەتتار " کۆڵی خەمەکان چەماندی و بە دونیایەك ئێش و ئازارەوە کۆچی دوایی کرد و " موهتەدا " و " مەعسومە " ی هاوسەری بە تەنها بەجێهێلاَ ، خەمەکانی " مەعسومە " ی دایکی "موهتەدا " زیادی کرد و لە بەیانییەوە تاکو شێوان چاوەڕوانی گەڕانەوەی " موهتەدا " بوو ، لەگەڵ تەقەی دەرگای حەوشەکەدا بە خۆشییەوە هەڵدەستا و پێشوازی لە "موهتەدا " دەکرد و خاوێنی دەکردەوە و خواردنی بە دەمەوە دەکرد...

لە دوای "حەوت" ساڵ بەیانییەك بە پێچەوانەی عادەتی جارانی "موهتەدا " درەنگانێك لەخەو هەستا و هات بۆ چێشتخانەکە و سەلامی لە دایکی کرد ، دایکی گەشایەوە و سەلامەکەی وەلاَمدایەوە ، پاشان "موهتەدا " پرسیاری کرد: ( دایە بابم لە کوێ یە؟ بۆسەر ئیش چووە؟)

دایکی: ( کوڕم ، ئێستا باشی؟! ئاگات هاتۆتەوە بەر خۆت؟!)

موهتەدا: ( بۆ من چیم بەسەر هاتووە؟! نەخۆشم؟! شتێك ڕوویداوە من لێی ئاگادار نەبم؟!)

" مەعسومە " ی دایکی بە دوور و درێژی باسی تێکچوونەکەی بۆ کرد و پێی وت: بابت بە خەمی تۆوە سەری نایەوە و " مەریەم " یش لەگەڵ منداڵەکەی بۆ ماڵی بابی گەڕایەوە)

" موهتەدا " هەموو گیانی لە فرمێسك هەڵژەنرا ، دەستەکانی دایکی ماچ کرد ، پێی ڕاگەیاند: ( وام دەزانی خەونم بینیوە ، نەم زانی خەونەکەم "حەوت" ساڵی خایاندووە..)

" موهتەدا " چەند هەفتەیەك لە ماڵەوە دەرنەچوو ، دایکی کەس و کار و دۆستان و ناسراوانی "مەنسووری عەتتار " ی لەو هەواڵە خۆشە ئاگادار کردەوە و خەڵکی دەستە دەستە دەهاتنە ماڵیان و خۆشحاڵی خۆیان بۆ " مەعسومە " خاتوون و " موهتەدا " ی کوڕی دەردەبڕی ، سەیر لەوەدا بوو " مەلای گەورە " و شاگردەکانی ناو خوێندنگەی "مەلای گەورە " کەسیان بە میوانیی نەهاتن و لە تەندروستی "موهتەدا " یان نەپرسی ، " موهتەدا " ش لەوبارەیەوە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پرسیاری لە كەس نەكرد ، چونكە دەترسا هەواڵێكی چاوەڕوان نەكراو بە گوێیدا بدرێت ، دوای تەواوبوونی میوانەكان " موهتەدا " ویستی سەردانێكی خوێندنگەكەی "مەلای گەورە " بكات ، سەرلە بەیانییەك خۆی كرد بە مزگەوتەكەدا و بەرەو خوێندنگەكە هەنگاوی هەڵگرت ، گەیشتە بەردەم حوجرەی فەقێكان و بینی دەرگا داخراوە و بێدەنگییەك ناوەوەی حوجرە و خوێندنگەكەی داگیر كردووە ، گەڕایەوە و بەرەو ژوورەكەی "مەلای گەورە " دیسان دەرگای داخرا بوو ، بەناو مزگەوتەكەدا گەڕا و مجەوەرەكەی بینییەوە و دەستیان لە گەردنی یەكتری ئاڵاند و ماوەیەك پێكەوە فرمێسكیان هەڵوەراند ، پاشان پرسیاری " مەلای گەورە " و خوێندنگەكەی لە مجەوەرەكە كرد ، ئەویش بە هەنسك و فرمێسكەوە سەرگورشتەی ئەو "حەوت " ساڵەی بۆ گێڕایەوە: ( لە دوای دەركردنی تۆ و دەستگرتن بەسەر خوێندنگەكەدا " مەلا عاسی"ی نەفرەتی لە پیلانەكانی بەردەوام بوو ، لە پیاوانی دەوڵەت خۆی بردە بەرەوە و بوو بە ئیمامی ڕەسمی مزگەوتەكە و بە تەواوی خۆی بەسەر خوێندنگەكەدا سەپاند ، " مەلای گەورە " بە پیلانەكانی زانی و ویستی دەری بكات ، بەڵام مەلای نەفرەتی پشتیوانی قایم بوو ، باكێكی بە " مەلای گەورە " نەبوو ، تا گەیشتە ئەوەی " مەلای گەورە" ی بە خانەنشین دا و تەنانەت حوجرەكەشی لێ داگیر كرد ، ماوەیەك خوێندنگەكەی بەردەوام بوو ، بەڵام كۆمەڵێك شاگردی هەبوو كە هەروەكو خۆی خراپەكار و دوور لە خودا بوون ، بە ئەنجامدانی چەندین كاری خراپەوە لەم مزگەوتەدا چاوم پێیان كەوتووە ، بە "مەلا عاسی " م دەوت و ئەویش بە كژ مندا دەهات و دەیوت:

" تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەستی... "

لە دوایین جاردا هەڕەشەی لێ كردم گەر لەسەر ئەو تۆمەتانە بەردەوام بم لەلای ئەوقاف بە دەركردنم دەدا ، بۆیە منیش وازم لە قسەكردن هێنا و تەسلیمی دەستی خودام كردن ، سێ ساڵ لەمەوبەر "مەلای گەورە " كۆچی دوایی كرد ، هەتاكو مرد ناوی تۆی لەسەر زمان نەبڕا ، بە خەم و ئازاری تۆوە سەری نایەوە..

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە کۆتاییدا وادەی تۆڵەی خودایی لە "مەلا عاسی" نزیك بوویەوە ، بە شاهیدی چەند شاگردێك " مەلا عاسی " بەکارێکی زۆر ناشیرینەوە لە حوجرەکەی خۆیدا گیرا و لەم مزگەوتە دەریان کرد و خوێندنگەکەیان پێ داخست ، ئەویش لەشەرمەزاریدا سەری خۆی هەڵگرت و ئەوە دوو ساڵە ناو و ناونیشانی بزر بووە...)

" موهتەدا " داوای لە مجەوەرەکە کرد ژوورەکەی " مەلای گەورە"ی بۆ بکاتەوە و تاوێك بۆ مەزنی ئەو لە ژوورەکەیدا دابنیشێت و چاوێك بە کتێبخانەکەیدا بخشێنێت...

عەسرێکی درەنگ بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە ، لە ڕێگە چەند منداڵێك بەلایدا گوزەریان کرد ، ئاگای لێ بوو دەیانوت:

(ئەوە " موهتەدا " ی "میهری " یە...)

پاشان دەستیان بە گاڵتە پێ کردنی کرد و ئەویش سەری خۆی داخست و بە پەلە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە ، " موهتەدا " تێگەیشت لەوەی "حەوت" ساڵ شێتی سەر شەقامەکان بووە ، بۆیە بیری لەوە کردەوە دایکی هەڵبگرێ و ڕوو لە لادێیەکی زۆر دوور بکات و خۆی لەو شارە دوور بخاتەوە...

شەو لەگەڵ دایکی لە باخچەکە دانیشت بوون ، ڕووی لە دایکی کرد و وتی: ( دایە گیان من "حەوت" ساڵ شێتی سەر شەقامەکان بووم ، لە لای خەڵکی ئەم شارە بە شێت ناسراوم ، منداڵان بە شێت ناوم دەبەن و شوێنم دەکەون ، بۆیە یان دەبێت لە ماڵەوە دەرنەچم یان دەبێت ئەم شارە بەجێ بهێڵین ، نازانم تۆ چی دەڵێیت ؟)

دایکی: ( کوڕی خۆم ، دوورکەوتنەوەم لەم شارە و بەجێ هێڵانی ئەم ماڵە بە مەرگی خۆم دەزانم ، چونکە هەرچی یادگاری خۆشی من و بابتە لەم شارە و لەم ماڵەدایە ، بەڵام من دەستبەرداری ژیان و زیندەگی خۆم دەبم لە پێناوی ئاسوودە کردنی تۆدا ، بۆ کوێ دەچیت لێت جیا نابمەوە ، تەنها داوامە ئەم

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ماڵە نەفرۆشیت و با وەکو خۆی بمێنێتەوە ، پارە و دوکان و زێڕمان هەیە و پێویستمان بە فرۆشتنی ئەم خانووە نابێت )

دایکی بە "موهتەدا " ی وت ( لە ساڵی یەکەمی نەخۆشییەکەتەوە واتە " شەش " ساڵ لەمەوبەر نامەیەکت بۆ هاتووە و هەڵم گرتووە و نەم کردۆتەوە ، بچم بۆت بهێنم ؟)

موهتەدا ( بەڵێ ، دایە گیان )

"مەعسومە" ی دایکی هەستا و چووە ژوورەوە و دوای ماوەیەك گەڕایەوە و نامەکەی دایە دەستی " موهتەدا " ، ئەویش نامەکەی کردەوە و بزەیەکی شیرین هاتە سەر لێوەکانی و وتی ( دەزانی نامەی کێ یە ؟)

دایکی ( نامەی کێ یە ؟)

موهتەدا ( نامەی "سمکۆ " ی برای " مەریەم " ە)

پاشان مۆڵەتی لە دایکی خواست و چووە ژوورەوە و لەسەر جێگەکەی ڕاکشا و دەستی بە خوێندنەوەی نامەکەی " سمکۆ " کرد:

برای ئازیز و لە دڵا شیرینم " موهتەدا " نازانم لە چی یەوە دەست پێ بکەم و چۆن خۆشەویستی خۆمت بۆ دەربڕم ، تامەزرۆی هەموو ئەو ساتانەم شەوان گفتوگۆمان دەکرد ، تۆ بە ڕۆحی مەزنت و منیش بە بیری ئاڵۆزمەوە بیر و ڕامان ئاڵوگۆڕ دەکرد ، یەك بە یەکی وشەکانت لە گوێمدا دەزرنگێتەوە ، نازانم بۆ ئەو کاتانە قەدرزانی تۆم نەکرد و لە بوونی تۆدا بوونی خۆمم نەبینییەوە ؟

هەرچۆنێك بێت من ئێستا " سمکۆ " یەکی ترم و مرۆڤێکم بە قەدەر کیشوەری " ئاسیا " ناخ و بیرم فراوان بووە ، من جاران بە قەدەر گوندەکەی خۆمان بیرم دەکردەوە ، بەڵام ئێستا بە قەدەر زەوی بیر و ئەندێشەم بەرینە ، ژیان لە " ئەورووپا " پێی سەلماندم مرۆڤی بێ نیشمان ، بێ کلتوور ، بێ ئایین وەك پەڕی باڵندەیەکی گەڕیدەیە و لەگەڵ بەربوونەوە و جیابوونەوە لە باڵەکانی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئـەو مەلـە دەکەوێتـە بـەر بـەزەیی ڕەشـەبا و هـەر ڕۆژێـك پێـی لـە خاکێـك گـیر دەبێت...

ئێمەی ڕۆژهەلاتی پووشـی دەم بـاین و نیـشتمانێك لـە ئامێزمـان ناگرێـت ، " ئەوروپا " خەونی من بـوو ، بـەلاّم بـۆم دەرکـەوت ئێمـەی مـرۆڤ ئازارەکانمـان ، مەینەتییەکانمان بە کۆڵی خۆمانەوەیە و ڕوو لە هەر جێگەیەك بکەین لێمان جیـا نابێتەوە ، مرۆڤ لە زێد و نیشتمانی خۆیدا لە بەختەوەرییەوە نزیك ترە ، چونکە دەتوانێت زووتر کۆڵی مەینەتییەکان فڕێ بدات.. ئازیز و خۆشەویستم "موهتەدا " من ئێستا گەڕاومەتەوە بۆ ناو بەرائەتی منداڵی و سادەیی مرۆڤی لادێکـەمان ، من ئێستا ناوەوەی خۆم بۆ بەختـەوەری دەپـشکنم ، دەزانم بەختـەوەری لـەناو مرۆڤدایـە نـەك لـە تـەکنۆلۆژیا و شـوێنی جوغرافیـادا ، ئێـستا لەگـەڵ خـۆم ئاشتبوومەتەوە ، ڕقم لە خۆم نییە ، خۆم لا ناشیرین نییە ، ڕقم لـە نیـشتمان و نەتەوە و ئـاین و کولتـورم نابێتـەوە ، بـەڵکو هـەموو ئەوانـەم خـۆش دەوێـت ، چونکە بەشێکن لە بوونی من...

ئێستا تۆ لای من مرۆڤێکی مەزن و ڕەسەنی بە پێچەوانەی جارانـەوە کـە بـە مێـشك وشـك و دواکـەوتوو سـەرنجم دەدایـت ، مـن وام دەزانـی هەرکـەس بـیر و بۆچوونی منی نەبێت دژ و نەیارە بە پێشکەوتنخوازی ، بەلاّم ئێستا دەزانم یـەك ڕەهەندیی لە بیرکردنەوەدا مرۆڤ دەکوژێ و بیر و گۆڕان زیندە بە چاڵ دەکات...

لێرەوە وێنای تۆ و کارەکانی ئێـستات دەکـەم ، وا دەبیـنم زانایـەکی مـەزنت لێدەرچووە و خوێندنگەیەکی گەورەت هەیـە و دەیـان و سـەدان شـاگرد لەسـەر دەستی تۆ فێری زانست دەبن ، هیوادارم بە هەڵەدا نەچووبم..

خۆشەویستیم بۆ " مەریەم" گیانی خوشکم و دایك و باوکی بەڕێزت..

ئەگـەر تەمـەن ڕێگـەی دا و گەڕامـەوە یـەکتر دەبیـنین و لـە چـەندین شـەودا سنگی خۆمت بۆ والاّ دەکەم و سەربوردەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە...

برات سمکۆ

ستۆ کهۆ لم

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" موهتەدا " دەستی بە گریان کرد و وتی ("سمکۆ " نازانێت من ئێستا بە شێت ناوم زڕاوە و تەنانەت شاگردێکیش بە دەورمدا نییە و وەك مەلی باڵ شکاو و بەجێماو تەنها کەوتووم..)

دوای چەند ڕۆژێك موهتەدا " بیری لە جێگەیەك کردەوە تاکو خۆی و دایکی ڕووی تێ بکەن ، هاتەوە بەو شوێن و جێگە و خەڵکانەی هەموو جارێك بابی باسی لێوە دەکردن ، لە دواجاردا بیری ئەو پیاوەی کەوتەوە کە یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی بابی بوو ،ماڵیان لە گوندێکی سەر سنوور بوو ، ناوی " حاجی موحسین " بوو...

دوای خۆ ئامادەکردن بڕیاری دا بەر لە بردنی دایکی بۆخۆی سەرذانێکی ئەو گوندە دوورە بکات ، ڕێگەی دووری گرتەبەر و گوندەکەی دۆزییەوە و ڕۆیشتە ماڵی دۆستە دێرینەکەی بابی ، بەڵام دیار بوو ئەویش کۆچی دوایی کرد بوو ، چەند کوڕێکی جوامێر و خانەدانی لە شوێن بەجێما بوو ، ناو و پیاوەتی " مەنسووری عەتتار " یان لە بابیان بیست بوو ، زۆر بە گەرمی پێشوازییان لە " موهتەدا " کرد ، داوای لێکردن پارچە زەویەکی پێ بدەن و دوو ژووری تیادا بکاتەوە و لەگەڵ دایکی ڕوو لەو لادێیە بکەن ، ئەوان وایان دەزانی لە ئاسمانەوە " موهتەدا" بۆ لای ئەوان ڕەوانە کراوە ، بەڵێنیان پێدا گەر " موهتەدا " لادێکەی ئەوانی قبوڵ بێت بۆخۆیان خانووی بۆ بکەنەوە ، ئەویش دوایین بڕیاری خۆی بەوان گەیاند و پارەی زەوی و کەرەستەی کردنەوەی خانوویەکی پێدان و ئەوانیش بەڵێنیان پێدا لە ماوەی سێ مانگدا خانووەکەی بۆ بکەنەوە و پاشان خۆیان لە دووی بێن وماڵەکەی بگوێزنەوە..

دوای چەند مانگێك کوڕەکانی " حاجی موحسین " بە مەبەستی گواستنەوەی ماڵەکە لە دووی " موهتەدا " و دایکی هاتن و ماڵەکەیان بۆ لادێکە گواستەوە ، یەکەمین شتێك " موهتەدا" بیری لێ دەکردەوە گواستنەوەی کەلەپووری بەجێماوی بنەماڵەکەیان بوو ، ئۆتۆمبێلێکی تایبەتی بۆ گرت و خۆی و دایکی لەگەڵی سوار بوون ، شتە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كرد و دوو كوڕی " حاجی موحسین " ی لەگەڵ سوار بوو ، ئەو شتانەی لە ماڵەكەدا مابوونەوە بەجوانی داپۆشران و دەرگا و پەنجەرەی ماڵەكەیان بە مەحكەمی داخست ، شەو شتەكانیان بار كرد و بەیانی زوو بەرەو لادێكە بەڕێ كەوتن...

لادێیەكی جوانی دڵڕفێن خەڵكەكەی بە قەدەر جوانی سروشت ناخ و ڕەفتاریان ڕازاوە بوو....

بەیانیان " موهتەدا " ڕووی لە چیا بەرز و بڵندەكە دەكرد و دەمە و عەسر بۆ ناو گوندەكە دەگەڕایەوە ، هەندێك جار بە تایبەت بەهاران دایكی لەگەڵ خۆی دەبرد و گەشتی ئەو چیا و دەشت و دۆڵانەی پێ دەكرد ، " موهتەدا " و دایكی جێگەی ڕێز و خۆشەویستی هەموو گوندەكە بوون...

" دە " ساڵ ژیان لەو گوندەدا بە دە ڕۆژ تەمەن لە " موهتەدا " و دایكی تێپەڕی ، " مەعسومە" خاتوون لەسەر لەش ساغی شەوێك "موهتەدا " ی بانگ كرد و وەسێتنامەی خۆی بۆ خوێندەوە ، داوای لێكرد هەر لەو لادێیە بینێژێت ، چونكە ڕۆحی " مەنسوور " ی هاوسەری لەو دەوروبەرەدایە ، ئەو وتی:

" دە ساڵە لەم گوندەدا هەموو شەوێك تا بەیانی لەگەڵ بابتم..."

هەر ئەو شەوە " مەعسومە " خاتوون كۆچی دوایی كرد و "موهتەدا" و خانووە تەنهاكەی قەراغ گوندەكەی بەجێ هێلاً....

" موهتەدا " بۆ گوندنشینەكان سەرچاوەی عیلم و عیرفان بوو ، قەڵایەك بوو لە كاتی گرفت و نەخۆشی و هەژاری دا ڕوویان تێدە كرد ، مامۆستایەك — تەنها بە كردار و ڕۆحی مەزنی — مەردوومانی پەروەردە دەكرد ، شەوانی هەینی پیاوانی گوندە نزیكەكان لە مزگەوتەكەی "حاجی موحسین " دا كۆدەبوونەوە و گوێیان بۆ وتەكانی " موهتەدا " ڕادەگرت ، لەو كاتەوەی " موهتەدا " ڕووی لە ناوچەكەی ئەوان كرد بوو ئارامی و پیت و فەڕ سەرجەم خانەوادەكانی داگیر كرد بوو، سەردانی " موهتەدا " بۆ ماڵەكانیان ئاواتی هەموان بوو ، بەڵام ئەو زۆر كەم دەیتوانی لە ماڵاندا بمێنێتەوە ، ماڵە تەنهاكەی خۆی و ئەشكەوتی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خەڵوەتگاکەی بە هەموو دونیا نەدەگۆڕییەوە ، خەڵکی باوەڕیان وا بوو هەتا "موهتەدا" لە ناویاندا بێت خودا لە هەموو دەرد و بەڵایەك دەیانپارێزێت ، "موهتەدا" بۆ ئەوان هەموو شتێك بوو ، بەڵكو هەموو خێرێکیان لە نزا و داواکانی ئەودا دەخوێندەوە...

لە دوای مردنی " مەعسومە " زۆر شەوان " موهتەدا " لە چیا بەرزەکان دەمایەوە و بۆ ماڵەوە نەدەگەڕایەوە ، ئەو لە ئەشکەوتێکی چیاکەدا جێگەیەکی خۆش کرد بوو ، جێگە و بانی تێ برد بوو ، پێویستییەکانی ژیانی تیا ئامادە کرد بوو ، هەفتەی جارێك بۆ گوندەکە دەگەڕایەوە و هەندێك پێویستی لەگەڵ خۆی دەبرد و تا هەفتەیەك بەو کەمە پێویستییە ژیانی بەڕێ دەکرد ، ئەوە " پازدە ساڵ " بەسەر مردنی دایکیدا تێپەڕیوە و بەشێکی زۆری ژیانی " موهتەدا " – کە لە لای گوند نشینەکان بە " مەولانا " ناسراوە – لە سەر چیاکان و لە ناو ئەشکەوتەکەدایە...

ئێستا " موهتەدا " تەمەنی " شەست و یەك" ساڵە و زۆر بە کەمی بۆ گوندەکە دەگەڕێتەوە و دانیشتنی لەگەڵ گوندنشینەکان بووە بە مانگی یەك جار ، دۆستە زۆر نزیکەکانی ڕوو لە خەڵوەتگاکەی دەکەن و ساتێك لە لای دادەنیشن ، ناوە بە ناوێك خواردن و شتومەکی پێویستیشی بە کەسێکدا بۆ ڕەوانە دەکەن ، بەڵام ماوەیەکە ئەوانیشی ئاگادار کردۆتەوە کەم سەردانی بکەن و ئارامی خەڵوەتگاکەی نەشێوێنن...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ١ -

# ڕاز و مەولانا
## یەکەمین دیدار

گەنجێکی تەمەن حەڤدە ساڵان بوو ، زیرەك لە وانەکانی دا ، بەڵام تا ڕادەیەك نامۆ بە دەوروبەری ، نەیدەزانی کەی بابی کۆچی دوایی کردووە ، ئەو تەمەنی "هەشت" ساڵان بوو " تابان " ی دایکی یان دروستتر بڵێین دایەنی دونیای بەجێ هێلا...

داپیرەی کە ناوی " فاتیمە خان" بوو ، ئەو ئافرەتە مەزنە بوو ، ئەوی گرتە لای خۆی و ڕۆڵی باوك و دایکی بۆ بینی ، باپیری سێ ساڵ دوای مردنی " تابان " ی دایکی " ڕاز " کۆچی دوایی کرد...

" ڕاز " زۆرتر هۆگری داپیرەی بوو ، شەوانە چەندین چیرۆکی گوێئاگری بۆ دەگێڕایەوە و ئەویش لە گەڵی دا خەیاڵی فراوان دەبوو ، هەندێ جاریش خۆی لێ دەگۆڕا بە پاڵەوانانی ناو چیرۆکە ئەفسانە ئامێزەکانی داپیرە...

خانووەکەیان لە سەر کێڵگە بەرینەکە دروست کرا بوو ، باخێکی فراوان بە دەمیەوە بوو کە چەندین ساڵ باپیری ڕەنج وماندوبوونی لەگەڵ کێشا بوو ، بە هۆی فراوان بوونی شارەوە خانووی گەڕەکە نوێیەکان لە کێڵگەکەیان نزیك بوو بوونەوە ، کێڵگەکەیان دیوارێکی بەرز و قایمی بە دەوردا درابوو ، جگە لەوەش

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دارچنار و گوڵەباخ و تووتوڕکەکان بە دەوری دا بوو بوون بە پەرژینێکی چڕ و پڕ...

چەند هەفتە جارێك خاڵی " ڕاز "– کە مامۆستای دواناوەندی بوو – خۆی و هاوسەرەکەی و دوو منداڵەکەی سواری ئۆتۆمبێلە مۆدێل کۆنەکە دەبوون و سەردانێکی " ڕاز " و داپیرەیان دەکرد ، هەندێ جاریش لەسەر زۆر پێداگرتنی داپیرەی "ڕاز "شەو لە لایان دەمانەوە و تا درەنگانێك نەدەنووستن ، ماوەیەك لە ناو باخەکەدا پیاسەیان دەکرد و ماوەیەکیش لە ژێر کەپری دارمێوەکە دادەنیشتن ، خۆ گەر کەش و هەوا ڕووی لە سارد بوون بکردبایە دەچوونە ژوورەوە و لە هۆڵە بەرینەکەدا کۆ دەبوونەوە...

سەردانی خاڵی بۆ لای " ڕاز " و داپیرەی بە زۆری شەوانی هەینی بوو ، چونکە خەمی دەوامی قوتابخانەیان نەدەخوارد و بە تێروتەسەلی لەگەڵ یەکتر دادەنیشتن...

ئارامی و لەسەرخۆیی لە سیما و چاوەکانی" ڕاز " دا دەخوێنرایەوە ، زۆرتر بێدەنگی بە سەری دا زاڵ بوو ، ورد سەرنجی دەدایە دەوروبەر و جوان گوێ ی بۆ قسەی بەرانبەری ڕادەگرت ، پرسیاری دەکرد ، بەڵام پرسیارێکی قووڵی ماندار ، بۆیە"خاڵە ئەحمەد"ی هەموو جارێ دەیوت : " کوڕم ڕاستە من قسە دەکەم و تۆ گوێم بۆ دەگری ، بەڵام لە ئاکار و ڕەوشتی بەرزی تۆوە زۆر شت فێر دەبم.."

هەندێك لە مامۆستاکانی بە کەسێکی نامۆ و شەرمنیان دەزانی ، بەڵام مامۆستای زمانی کوردی بە چاوێکی تر " ڕاز " ی تەماشا دەکرد و دەیوت:

" ڕاز " قوتابییەکی زیرەکە ، قوتابی زیرەکیش لەم قوتابخانەی ئێمەدا زۆرە ، بەڵام لەپاڵ ئەو زیرەکییەدا من شتێکی تر لەم قوتابییەدا دەخوێنمەوە.."

کە لێیان دەپرسی: ( ئەو شتە چی یە تیایدا دەخوێنیتەوە ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە وەڵامیاندا دەیوت: ( نازانم ، ئەوەندە هەیە مرۆڤێکی مەزنی تیادا وێنا دەکەم ، هەندێ جار وەك مامۆستا شەرمی لێ دەکەم..)

" ڕاوێژ " یەکێك لە هاوەڵە نزیکەکانی " ڕاز " بوو ، پێکەوە بۆ قوتابخانە دەچوون و پێکەوەش دەگەڕانەوە ، هەندێ جاریش دوای عەسران سەردانی یەکتریان دەکرد و پیاسەیەکی دەشتە بەرینەکەی ئەو دیو گردۆڵکەکانیان دەکرد ، یاخود لە باخەکەی ماڵی " ڕاز " دا دەمانەوە و کاتێکی خۆشیان بە قسە و باسی خوێندن و هاوپۆلەکانیانەوە بەسەر دەبرد ، هەندێ جاریش ناوی چەند مامۆستایەك دەهێنرا و وتە و هەڵوێستەکانیان لێ دەدرایەوە...

بەهارێکی تەڕی پاراو بوو ، قوتابخانەکەیان بریاری سازدانی سەیرانێکی دا بۆ سەر چیا بەرزەکانی باکووری شار کە نزیکەی سی کیلۆمەترێك دووریەکەی بوو...

دەبوا بیست وپێنج کیلۆمەتر بە ئۆتۆمبێل بڕۆیشتبانایە و پاشان بە پێیان بەرەو سەر شاخە بەرزەکە بە ڕێ بکەوتنایە...

بەیانی زووی ڕۆژی هەینی لە خەو هەستان و بە هەموو پێویستییەکی سەیرانەوە ڕوویان لە قوتابخانە کرد ، کاتژمێر " نۆ " ی سەر لەبەیانی سواری پاسە گیراوەکان بوون و بەڕێ کەوتن ، بۆ کاتژمێر "دە"ی سەر لە بەیانی گەیشتنە سەر پانتایی چیا مەزنەکە ، ئەمەش دوای نزیکەی پێنج کیلۆمەترێك بەپێیان ڕێگا بڕین..

سەرکەوتن بۆ سەر چیاکە سەخت وماندوکەر بوو ، بەڵام کە گەیشتنە لوتکەکەی و ئەو شوێنە ڕازاوەیان بینی هەموو ماندو بوونەکەیان لەبیر چوویەوە ، بەسەر چیا بەرزەکەوە کانیاوێك هەڵدەقوڵا و هەموو سەر چیاکەی بە سەوزی وگوڵ خەملاند بوو ، کۆمەڵێك دار قەزوان لە پشتی کانیاوەکەوە سێبەر و دیمەنێکی دڵڕفێنیان بە دەور و بەری کانیاوەکە بەخشی بوو...

هەڵاڵە برمەی سوور و ئاڵ بە گەردنە بەرز و سەرکەشەکەیەوە لە پەنای بەرد و ناو دەوەنەکانەوە دەشەکایەوە ، بەزنێکی دڵرفێن بە کزەبایەکی ناسکەوە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەوەزی و هەواڵی جیهانێکی تری بەگوێی عاشقاندا دەدا ، پەڵە هەورێکی سپی بە خڕی لە ئاسمانێکی شینی بەرین دا بە تەنیا هات و چۆی دەکرد ، دیاربوو ئەویش لە دووی مەعشوقەکەی خۆی دەگەڕا ، چۆلەکەی جرە و زەردەوەلی ناو بە ناوێك بەرچاو دەکەوتن و بە جریوە و جیکە سەرنجی سروشتیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا ، باسی عیشقێکی نەمریان دەگێرایەوە و خەمی دڵێکی خەفەکراویان بە بادەدا...

دوای پشودان و خواردنی نانێکی پر لە تام و چێژ قوتابییەکان–یەك یەك و دوو دوو – بە سەر چیاکەدا بڵاو بوونەوە ، مامۆستاکان تکایان لێ دەکردن ئاگاداری خۆیان بن و لە لێواری چیاکە نزیك نەبنەوە ، قوتابییەکان کۆمەڵێك گەنج ولاوی سەرکەش بوون ، هەریەکەیان بە جۆرێك گەورەیی و ئازایەتی خۆی نمایش دەکرد و هەندێ جاریش ئامۆژگاری مامۆستاکانیان بە چەند قسەیەکی زیاد و دووبارە بوەوە دەزانی کە ڕۆژانە لە دایکان و باوکانیان دەبیست...

"ڕاز " بە درێژایی سەرەوەی چیاکەدا دەستی بە گەڕان کرد ، ئەو دەیویست ئەوەندە دوور بکەوێتەوە هەتا هاوار و دەنگی هاورێکانی خۆی نەبیستێ ، حەزی بە هەندێك ئارامی بوو ، ئارامییەك مرۆڤ لەگەڵ سروشت دا ئاشت بکاتەوە ، بێدەنگییەك مرۆڤ و شتەکانی دەوروبەری لەگەڵ یەکتر ئاوێزان بکات ، ئەوەندە دوور کەوتەوە تا دڵنیابوو لەوەی هیچ کام لە هاورێکانی ناگەنە نیوەی ئەو ڕێگایەی کە ئەو لە کانیاوەکەوە – بە درێژایی سەرەوەی چیاکەدا – بڕی بووی..

بۆ تاوێك پشوو لێ ی دانیشت ، کەوتە تێڕامان لە دەوروبەری ، شتە وردەکان بەر لە گەورەکان سەرنجی ڕادەکێشا ، لە خەیاڵیدا کەوتە گفتوگۆ: ( سەیری ئەو گیاندارە وردە کە بە ئەندازەی سەرە دەرزیەك دەبێت ، بە ساقی ئەو چڵە گیایەدا سەردەکەوێت ، سەرنج بدە ئەو پەڕە وردە ڕەنگا و ڕەنگانەی ئەم چڵە گیایە هەڵی گرتووە ، منیش سەردانی ئەم گوڵەم نەکردبایە ئەو هەر گوڵ بوو ، هەر خۆی دەڕازاندەوە و جوانییەکانی خۆی نمایش دەکرد ، کەوابوو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بە بێ منیش سروشت هەر سروشتە ، بە بێ منیش گوڵ هەر گوڵە ، کێ نالێ ئەو گوڵە لەگەڵ گیاندارە زۆر بچووکەکەدا عاشقی یەکتری نەبوون...؟!)

هەڵفڕینی لە ناکاوی باڵندەیەك بە ئاگای هێنایەوە و سەیری لای ڕاستی خۆی کرد و بینی کەلەبەرێکی زۆر تەسك لەسەر چیاکەوە بۆ لاپاڵی چیاکە شۆڕ دەبێتەوە ، هەستا و بەرەو ڕێگا تەنگ و باریکەکە ڕۆیشت ، زۆر بە زەحمەت مرۆڤ دەیتوانی لێیەوە دابەزێتە خوارەوە ، دوای ماوەیەك سەرنجدان بڕیاری دا بەو ڕێگا تەسکەدا دابەزێتە خوارەوە و گەشتێکی بن چیایەکە بکات ، هەر چۆنێك بوو لەسەر چیاکە دابەزی و بەرەو باشوور بە درێژایی چیاکەدا کەوتە گەڕان ، دارستانی بن شاخەکە لە سەرەوەی چڕ و پڕ تر بوو ، لە پشتی گابەردێکی زەبەلاحەوە دابەزی و ماوەیەك ڕێگای بڕی ، دیوی خۆرئاوای چیاکە دیوێکی نسرم وسێبەر بوو ، مرۆڤ هەستی بە سەرما دەکرد ، ڕێگایەکی باریك لە بەردەمی دا کرایەوە و کەوتە سەر ڕێگاکە و دوای چەند مەترێك توولە ڕێگاکە خۆی خزاندە ناو ئەشکەوتێکەوە ، ئەشکەوتێکی بەرین بە ئەندازەی دوو ژووری فراوان ، ئاگرێکی بە دار تیادا کرابوویەوە و قۆریەکی ڕەش لە قەراغی ئاگرەکە دانرا بوو ، چەند پشکۆیەك هێنرا بووە لاوە و قۆریەکەی لەسەر نرا بوو ، لەتە فەرشێك کە بەتانییەك لەسەری ڕاخرا بوو لە نزیك ئاگرەکەوە داخرا بوو ، چرایەکی فانۆس لە سوچێکی لای سەرەوەی ئەشکەوتەکەوە لەسەر بەردێك کز لێی نیشت بوو ، گۆچانێك — کە پێ دەچوو لە داری گوێز چەمێنرا بێ — لە نزیك دەرگای ئەشکەوتەکەوە بە لەتە بەردێکی تیژی ناو ئەشکەوتەکەدا هەڵواسرا بوو ، دیار بوو کەسێك لەو شوێنەدا دەژیا، بەڵام خاوەن ئەشکەوت لە کوێ بێت..؟

ئەو بە سەرسامییەوە بە ناو ئەشکەوتەکەدا دەگەڕا ، لە ناکاو گوێی لە تەپەی پێی کەسێك بوو ، بە پەلە لە ئەشکەوتەکە هاتە دەرەوە و لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا بە پیرەمێردێکدا ڕووی هەڵشاخا ، پیاوێکی تا ڕادەیەك بۆ پێشەوە چەماوە ، بەڕیشێکی [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پەستەکێکی بێ قۆڵی لە بەردا بوو ، کراسێك و شەرواڵێکی کوردی پۆشی بوو ، کە چاوی کەوت بە " ڕاز " وتی: (ئاهـ... ئەوە تۆی... سەلام....))

ڕاز: ( سەلام... ببوورە بێ پرسی تۆ هاتمە ژوورەوە...)

پیرەمێردەکە: ( ئەشکەوت ماڵی هەموانە ، بفەرموو بچینە ژوورەوە...)

" ڕاز " بە هەندێك ترسەوە بە دوای پیرەمێردەکەدا بۆ ناو ئەشکەوتەکە گەڕایەوە و ئەویش فەرموی لێ کرد و لەسەر لەتە فەرشەکە دانیشت وپیرەمێردەکەش پیاڵەیەکی هێنا و لە قۆری پاڵ ئاگرەکە چایەکی بۆ"ڕاز" تێکرد و دایە دەستی و وتی: ( چای دەشت و شاخ لە چای ماڵەوە خۆشترە ! )

" ڕاز "چایەکەی لێ گرت ولەگەڵ یەکەم قوم لێدانی وتی: ( باپیرە تۆ لەم ئەشکەوتەدا ژیان بەسەر دەبەی؟ ! )

پیرە مێردەکە: ( بەشێك لە کاتەکانم..)

ڕاز: ( ئەی ماڵتان لە کوێ یە ؟)

+: ( لەو گوندەی لاپاڵی چیای ئەو سەر )

-: ( لێرە چی دەکەی ؟)

+: (بە دوای گەنجێتی خۆم دا دەگەڕێم ، لە دووی مەعشوقەکەم وێڵم...)

-: ( جا تازە لاوێتی بۆ تۆ چۆن دەدۆزرێتەوە ؟)

+: ( لەوانەیە بتوانم )

" ڕاز " زۆر سەری لەم پیرەمێردە سوڕ دەما و لە بیری خۆیدا دەیوت: ( بڵێ ی کەسێکی ساغ و ئاسایی بێت ، بڵێ ی مەبەستی تری لە ناخی خۆی دا حەشار نەدابێ ؟! گەنجێتی چۆن بۆ ئەم پیرەمێردە دەبینرێتەوە؟! )

پیرەمێردەکە پرسیارەکانی ناوەوەی بە ئەو بڕی ، دەتوت گوێی لە قسە پەنهانەکانی ناوەوەی ئەو بووە ، وتی: ( بۆچی نە؟ لەوانەیە... پێم بڵێ تۆ لە کوێوە هاتووی؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

-: ( لە شارەوە )

" ڕاز " سەری لەوە سوڕما چۆن ئەم پیرە مێردە پرسیارەکانی دەروونی وەڵام دەداتەوە لە کاتێکدا ئەو بە زمان هیچی گۆ نەکرد...

دواتر پیرەمێردەکە وتی +: ( شار..! شار خۆشە ؟)

-: (هەموو کاتێ نە...)

+: ( ئەشکەوتیش هەموو کاتێ خۆش نی یە )

-: ( بەلام من زۆر خۆشم دێ لەم ئەشکەوتە )

+: ( لەوانەیە منیش زۆر حەزم لە شار بێت ، چی لە شارا ناخۆشە ؟)

-: ( قەرەباڵغی و زەڵە و دەنگی زۆر و بێ ویژدانی خەڵکەکەی ، ئەدی ئەشکەوت کوێ ی ناخۆشە ؟)

+: (تەنهایی...)

-: ( من زۆر حەزم لە تەنهایی یە )

+: ( بۆ ؟! )

-: ( کە تەنها دەبم زۆر ئارامم )

+: ( دایك و باوکت ماون ؟)

-: ( مردوون )

+: ( لە قوتابخانەدای؟)

-: ( بەڵێ ، لە قۆناغی "پێنجەم" ی ئامادەییم بۆ قۆناغی "شەش"ەم دەردەچم )

+: ( لە خوێندن چ شتێکی زۆر گرنگ فێربووی؟)

-: ( نازانم ، ئەی تۆ خوێندەواریت هەیە؟)

+: ( دەزانم بخوێنمەوە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

-: ( بەلاّم بە قسەکانت دا وادیارە تۆ کەسێکی خوێندەواری)

+: ( بە زۆر قسە باوەڕ مەکە...)

-: ( گەر نزیك بوومایە زوو زوو بۆ ئەم ئەشکەوتە دەهاتم )

+: ( بۆچی دەهاتی؟! )

-: ( نازانم ، لەوانەیە حەزم بە سەردانی تۆ بێت)

+: (حەزت لە نان و خورما نی یە ؟)

-: ( نا ، زۆر سوپاس ، نانم خواردووە....)

+: ( نەمزانی ناوت چی یە ؟)

-: ( "ڕاز" ، ئەی تۆ ناوت چی یە؟)

+: ( "ڕاز ".... ناوێکی خۆشە ، منیش ناوم "موهتەدا " یە ، خەڵکی بە " مەولانا " بانگم دەکەن )

-: ( بۆ پێت دەڵێن " مەولانا ")

+: ( مرۆڤ هەمیشە حەز دەکات کەسێك هەبێت خۆی بداتە پاڵی ، بۆیە زۆرجار لە بێکەسیدا ناکەسیان لێ دەبێت بە کەس ، ئەوان وەك پەنایەك بۆ خۆیان سەیری من دەکەن ، بەلاّم من تەنانەت خۆشم پێ پەنا نادرێت )

-: ( باپیرە من دەتوانم تۆ ببینمەوە؟)

+: ( ئەگەر بتەوێت...)

-: ( هەر لەم ئەشکەوتە دەمێنیتەوە؟)

+: ( یان لێرەم ، یان لە گوندەکەی خۆمانم ، بەلاّم نەمزانی بۆ دەتەوێ سەرم لێ بدەی؟)

-: (بڵێم چی ؟ یانی... حەزدەکەم... باپیرە ئەم ئەشکەوتە و تۆ زۆر لای من شیرینن )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

+: ( حەزت لە گوێگرتنی چیرۆك و داستان هەیە؟)

-: ( زۆر...)

+: ( ئەمجارە کە گەڕایتەوە داستانەکە دەست پێ دەکەین...)

-: ( بەڵام لە خەونم دا تۆ بەشێك لەو داستانەت بۆ دەگێڕامەوە...)

+: ( بەشەکەی تریشی لە ئاگاهی دا تەواو دەکەین )

-: ( من دەبێ بڕۆم ، هاوڕێکانم بەجێم دەهێڵن...)

+: ( هەندێك ئاو لەو کوپەیە بخۆرەوە و پاشان بڕۆ...)

لە جامێکدا هەندێ ئاوی لە کوپەکە داکرد و نای بە سەریەوە و هەمووی خواردەوە ، ئەوجا خواحافیزی کرد ، لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا " ڕاز " وتی-: ( من لە مێژە تۆ دەناسم!)

+: ( منیش لە مێژە چاوەڕوانی تۆم!)

"ڕاز " بە ڕێگەکەی خۆی دا بۆ سەر چیاکە سەرکەوتەوە و بەرەو لای هاوڕێکانی گەڕایەوە ، هاوڕێکانی بە دڵخۆشییەوە بەرەو ڕووی هاتن و پرسیاریان لێ کرد: ( لە بەیانییەوە بۆ کوێ چووبووی؟)

" ڕاز " سەری سوڕ دەما بۆچی بۆ ئەو گەڕاون و هەموو چیاکەیان پشکنیوە ، هاتە وەڵام و وتی: ( من ئەوپەری یەك کاتژمێر دەبێ ئێوەم بەجێ هێڵاوە!)

هاوڕێکانی: ( لە پێش نیوەڕۆوە تۆ ئێمەت بەجێ هێڵاوە و ئێستا تەنها کاتژمێرێك ڕۆژی ماوە ، نزیکەی حەوت کاتژمێرە تۆ ون بووی ، ئێستا گەڕاویتەوە و دەڵێیت: تەنها یەك کاتژمێرە ئێوەم بەجێ هێڵاوە!)

"ڕاز" سەیرێکی خۆری کرد ، ڕۆژ زۆر درەنگ بوو ، بەڵام ئەو هەموو کاتە چۆن بەسەر چووە؟! ئەو تەنها ساتێکی کەم لای پیرەمێردەکە دانیشت و هەر زوو بە زوو گەڕایەوە ، ئەو ڕووداوە مەتەڵێك بوو خۆیشی لێ ی حاڵی نەدەبوو...

یەکێك لە مامۆستاکان وتی: ( کوڕم تۆ بورانەوەت لەگەڵ نی یە ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( نەخێر ، مامۆستا )

مامۆستا: ( ئەی ئەو هەموو ماوەیە لە کوێ بووی؟)

ڕاز: ( لە ڕاستی دا من لای خۆمەوە وا دەزانم تەنها کاتژمێرێکە ئێوەم بەجێ هێڵاوە ، پێم سەیرە ئەو هەموو کاتە تێپەڕیوە ! )

مامۆستایەکی تر: ( هاوڕێیان لێیگەڕێن ، وەرە کوڕم بچین چایەك پێکەوە بخۆینەوە)

دەستی خستە سەر شانی" ڕاز " و لە هاوڕێکانی دووری خستەوە و ڕۆیشت کوپێك چای بۆ هێنا و لە کاتی چا خواردنەوە دا بۆ ئاسان کردنی ڕووداوەکە لەسەر دەروونی "ڕاز" وتی: ( کوڕم ئەو حاڵەتە ئاساییە و بەسەر هەندێ کەسدا دێت ، ئەو وادەزانێ کاتێکی کەم لە جێگەیەك ماوەتەوە ، بەلاّم لە ڕاستی دا ماوەی زۆری بەسەردا تێپەڕیووە ، گرنگ ئەوەیە ئاسایی وەری بگریت و بیری لێ نەکەیتەوە...)

"ڕاز " سەری داخست بوو ، بیری لە ڕووداوەکە دەکردەوە و جار جارێکیش سەرنجێکی خەیالاّویی لە کوپە چاکە دەدا...

ئێوارە پاسەکان لە دوورەوە دەرکەوتن و ئەوانیش خۆیان کۆکردەوە و نزیکەی شێوان هەریەك بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە ، ئەو شەوە تا درەنگانێك" ڕاز " بیری لەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرە دەکردەوە: ( باشە لە کانیاوەکەوە بۆ ئەشکەوتی پیرەمێردەکە بە پێیان ئەوپەڕی چارەکە سەعاتێك ڕێگەیە ، چارەکێکیش گەڕانەوە ئەمە نیو کاتژمێر ، گریمان چارەکێکیش لەسەر بەردەکە دانیشتبم دەکاتە سێ چارەکە سەعات ، خۆ ئەوپەری چارەکێك لای پیرەمێردەکە دانیشتم ، هەمووی دەکاتە یەك کاتژمێر ، تۆ بڵێ کاتژمێر و نیوێك... ئەی ئەو "حەوت" کاتژمێرە چۆن بەسەرمدا تێپەڕیوە؟! نهێنی ئەو زوو تێپەڕبوونەی کات لە چیدایە؟!)

سەر شاخەکە ؟ ڕێگاکە ؟ دانیشتنی سەر بەردەکە؟ یاخود پیرەمێرد و ئەشکەوتەکە؟

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"سەر شاخەکە": خۆ هاوڕێکانیشم لەوێ بوون ئەدی بۆچی وەکو منیان بەسەر نەهات؟!

" ڕێگەکە " : لە کاتی گەڕانەوەمدا ئاگام لە کات بوو ، زۆر بە زوویی بۆ لای هاوڕێکانم گەڕامەوە...گومانم لە دانیشتنی "سەر بەردەکە" هەیە ، لەو شوێنە بیرم لە چی دەکردەوە ؟ گیاندارە بچووکەکە؟ ئەو چڵە گیایەی پیای دا سەردەکەوت ؟ هەڵفڕینی باڵندەکە؟ لەوانەیە ماوەیەکی زۆر فیکر و خەیاڵم بەلای ئەو شتانەدا ڕۆیشتبێت...

ئەی بۆچی لەسەر ئەو بەردە هەستم بە سڕبوون و ماندوبوون نەکرد؟! تۆ بڵێ ی ئەو "ئەشکەوتە" ئەشکەوتێکی سیحراوی بێت ، بڵێ ی پیرەمێردەکە سیحرباز بێت؟ سیحرباز ؟ بۆ نە؟ لەوانەیە... بەلام سیحرباز پێویستی بە خەڵکە و لە ناو خەڵکدا ئەو هونەرانەی خۆی نمایش دەکات ، سیحرباز چۆن ئاوەدانی بەجێ دەهێڵێ و ئەشکەوتێك دەکات بە ماوای خۆی؟! هەرچییەك بێت دەبێ لەم نهێنییە تێبگەم...کە گەیشتە ئەم سەرئەنجامە چاوەکانی چوونە خەو و بەیانی بە دەنگی کەڵەشێرە سپی یە کلك کورتەکەی داپیرە و جریوە جریوی پاساری سەر دارتووەکان بە ئاگا هات...

لە کاتی دەم وچاو شۆرین دا خەونێکی ئەو شەوەی بەبیر هاتەوە: لە خەونی دا سواری کەشتی یەك بووە و لە ناوەڕاستی دەریایەکدا هات وچۆ دەکات و شەپۆلەکان خۆیان دەکێشن بە کەشتیەکەدا و خەریکن ژێرە و ژووری دەکەن ، لەو دونیا پڕ لە ترس و سەرسامییەدا ، پیرەمێردێك – کە زۆر لە پیرەمێردی ئەشکەوتەکە دەچوو – هات و کەشتی یەکەی گەیاندە قەراغ دەریاکە و ئەوی لە خنکان قوتار کرد ، چەند خەونێکی سامناك بوو! ئەو پیرەمێردەی ڕزگاری کردم زۆر بە پیرەمێردی ناو ئەشکەوتەکە دەچوو ، ها... زۆر بە پیرەمێردی ناو ئەشکەوتەکە دەچوو ، ئا... بەو دەچوو...)

" ڕاز " لە وێنەی ناو ئاوێنەی پشتی دەستشۆرەکە ڕاما بوو: ( بڵێی ئەو وێنەیە من بم ؟ کەی من ڕوخسارم بەو جۆرە بوو... بڵێ ی گەورە بووبم؟ قۆناغی منداڵیم بەجێ هێلابێ و بەوە بە بیاوە؟! ئەی بۆ لەگەڵ قسەکردنمدا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لێوەكانم نابزوێن ؟ ئەگەر ئەو وێنەیە منم دەبێ قسان بكات و لێوەكانی ببزوێت..)

بە بانگی داپیرە بە ئاگا هاتەوە و هێشتا هەر لە بیری وێنەی ناو ئاوێنەكەدا بوو ، بەلام دواتر بۆی دەركەوت هەموو ئەو قسانە لە خەیاڵدا كردوونی و لێوەكانی نەبزواندووە تاكو وێنەی ناو ئاوێنەكە ببزوێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

– ٢ –

# وەرگرتنی مانا
# و
# لەخۆ ڕامان

داپیرە پەنیر و هێلکەی لەگەڵ کوپێ چا بۆ "ڕاز" ئامادە کرد بوو ، بەڵام ئەو بەیانی یە داوای لێبوردنی لە داپیرە کرد و هیچی پێ نەخورا، لە قوتابخانە چاوی بە " ڕاوێژ " ی برادەری کەوت و باسی سەیرانەکەی دوێنێیان لێدایەوە...

ڕاوێژ وتی: ( سەیرانێکی خۆش بوو ئەگەر خەمی ون بوونی تۆمان نەخواردبایە )

ڕاز: ( نازانم چۆن بوو لە ئێوە دوور کەوتمەوە ! )

ڕاوێژ: ( هەتیو تۆ دەڵێ ی " تەیرولحوببی " چاوت بە گوڵ و گوڵزار بکەوێ عاشق دەبیت )

ڕاز – بە بزەیەکەوە –: ( ئەم عەسرە سەردانێکی سەر گردۆڵکەکان بکەین ؟)

ڕاوێژ: ( بۆچی نە؟ ئەگەر دیسان ون نەبیتەوە..)

کە گەڕایەوە لە قوتابخانە داپیرە خواردنی باشی بۆ ئامادە کرد بوو، چونکە دەیزانی برسییەتی و بەیانی هیچ نەخواردووە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( سەلام ، داپیرە )

داپیرە: ( سەلام ، ڕۆحی داپیرە ، کتێبەکانت لە ژوورەکەت دابنیٚ و دەست و دەم و چاوت بشۆ و وەرە خواردنی بەتامی دەستی داپیرە بخۆ )

ڕاز: ( داپیرە ، زۆر سەیرە ، دوێنیٚ نیوەڕۆ نانم خواردووە ، لەگەڵ ئەوەش دا تاکو ئێستا زۆر تێرم و هەست بە برسێتی ناکەم... )

داپیرە: ( دوێنیٚ زۆر ماندو بووی ، کوڕم خۆ نەخۆش نیت ؟ )

ڕاز: ( لە گوێزی ساغ ساغترم.. )

داپیرە: ( بڕۆ دەم و چاوت بشۆ و وەرە ، ئەو شتەی بۆم دروست کردوی تێر بیبینیٚ برسی دەبێت... )

" ڕاز " پاش کەمێك گەڕایەوە لای داپیرە و بینی بە فڕن مریشکی بۆ برژاندووە و سەوزە و خەیار و تەماتەی بە قاشکراوی بۆ ئامادە کردووە...

ڕاز: ( بەلاّم ناخۆم گەر لەگەڵم نەخۆی )

داپیرە: ( کوڕم بەر لە هاتنەوەی تۆ من نانی خۆمم خواردوە... )

ڕاز: ( یەك پارو بە دەستی "ڕاز" هەڵبەت لەبەر خاتری داپیرە بە دەستی ڕاست... )

" ڕاز " پارویێکی بۆ کرد و لە دەمی داپیرەی نزیك کردەوە...

داپیرە: ( بەم زیادە خۆریانە تۆ من نەخۆش دەخەی ، دوایی کەس نابێت خزمەتت بکات... )

ڕاز: ( داپیرە گیان خۆم خزمەتت دەکەم ، کوڕی تەمبەڵی بیٚ کارەی خۆت لە خزمەتتدایە... )

داپیرە: ( تۆ ئازا بە ژنێك بهێنە خزمەتمان بکات... )

ڕاز: ( ژنێکیشت بۆ دەهێنم ، بەلاّم بۆ خۆم نە ، بۆ... تۆ.. )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

داپیرە نەرمە پێکەنینێکی بۆ کرد و بە دەم ئیشکردنەوە چێشتخانەکەی بەجێ هێلا...

عەسرەکەی " ڕاوێژ " سەردانی " ڕاز " ی کرد و پێکەوە بەرەو گردۆلکەکانی ئەوسەری دەشتە بەرینەکە بە پیاسە بەڕێکەوتن... هەردوو کتێبی " زیندەوەرزانی "یان بۆ خوێندن لەگەلّ خۆیان هێنا بوو....

ڕاوێژ: ( ئەورۆ مامۆستای زمانی عەرەبی خراپ داباری بە سەرمانا)

ڕاز: ( بەراستی پۆلەکەی ئێمەش ناخۆشیان کردووە ، ئەو دوو سێ قوتابییەی ناوەڕاست هەموو شتێك بە فشقیات دەگرن ، وانەیەك نی یە ئەوان هەلّنەدەنێ و گۆبەند دروست نەکەن...)

ڕاوێژ: ( بەلاّم مامۆستا حەق نی یە بە هۆی دوو–سێ کەسەوە هەموومان تەرزەکوت بکات...)

ڕاز: ( مامۆستا کە ئەو قسانە دەکات مەبەستی قوتابی نەزان و بەزمچی یە...)

ڕاوێژ: ( حەقە هەموو پۆلەکە بەو سێ قوتابی یە بلێین: لێرە بەدواوە مافی ئێمە پێشێل نەکەن و پۆلەکەمان لە قوتابخانەکەدا بەدناو نەکەن...)

ڕاز: ( سبەینێ قسەی لێ دەکەین...)

ڕاوێژ: ( ئێستا زۆر لە یەکتر دوور ناکەوینەوە و هەریەکەمان بە تەنها کاتژمێرێك "زیندەوەرزانی " دەخوێنێت..)

" ڕاز " بە نیو کاتژمێرێك وانەکەی بە باشی بۆ سبەینێ ئامادە کرد و لە ناو کۆما گیایەکدا لێ ی دانیشت ، پیرەمێردەکە کەوتەوە بەر خەیالّی ، حەزی بە سەردانێکی تری ئەو بوو...

– لەخەیالّیدا – : ( ئەگەر بۆ شەممە تاقیکردنەوەمان بۆ دانەنرا ئەوا ڕۆژی هەینی سەرێکی لێ دەدەم... هەر خۆم بە تەنیا بڕۆم یان کەسێك لەگەلّ خۆم دا بەرم؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاشان هاتە سەر ئەوەی بە تەنیا سەردانی بکات... دوای کەمێك تێڕامـان لـە گیا و گوڵەکانی دەوروبەری " ڕاوێژ " کێشای بـە پـشتیدا و لـە تەنیـشتی یـەوە دانیشت...

- : ( لەبەرت کرد ؟)

ڕاز: ( بەباشی )

- : (باشە ، پرسیارت لێ دەکەم )

+: ( دەی فەرموو...)

- : ( "یۆگلینا" بە هۆی چی یەوە دەجووڵێ؟)

+: ( قامچی )

- : (ئەوەت زانی... بۆچی جووڵەی قامچی شەپۆلی یە؟)

+: ( چونکە... چونکە گرژبوونی لە بنکەوە دەست پێ دەکات و بـە درێـژایی تەوەرەی قامچییەکە بۆ سەرە بەرەلاکەی دەگوێزرێتەوە... ئـەوجا نـۆرەی منـە پرسیار لە تۆ بکەم...)

- : ( پرسیار بکە )

+: (جووڵەی " پڕبوونە پەستان " لە چ جۆرە ڕووەکێکدایە؟)

- : ( لە ڕووەکە مێروگرەکاندا )

+: (" پەرامیسیۆم " بە هۆی چی یەوە دەجووڵێ؟)

- : ( بە هۆی...... قا... بە هۆی کوڵکەوە...)

+: ( گود ، ڤێری گود...)

ئەو ڕۆژە بۆ ماڵـەوە گەڕانـەوە و بـەیانی لـە قوتابخانـە هـەردووکیان کەوتنـە گفتوگـۆ و وتوویـێـژ لــە مــەڕ گرفتــی پۆلەکــەیان و ئــەو چــەند خوێنــدکارە گێرەشێوێنە... بڕیاریاندا لەگەڵ مامۆستای وانەی " فیزیا" دا باسی بکەن ، ئەو مامۆسـتایەکی ڕۆشـنبیریی فـراوان و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خۆشەویستە ، هەوڵبدەن قسە و گفتوگۆ دەربارەی کێشەکانیان بکەن و چارەسەرێکیش بۆ ئەو چەند خوێندکارە بدۆزنەوە...

کە زەنگی پشوو لێدرا هەردووکیان شوێنی مامۆستای وانەی "فیزیا" کەوتن و داوایان لێ کرد هەندێ لە کاتی خۆی بەوان ببەخشێت..

مامۆستای فیزیا: ( بفەرموون ، بە خۆشحاڵییەوە...)

باسەکەیان لا کردەوە و ئەویش بەڵێنی دا وانەی داهاتوو بۆ ئەو گرفتە تەرخان بکات و هەوڵی چارەسەری کێشەی پۆلەکەیان بدات...

ئەو ڕۆژە بە خۆشحاڵییەوە بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە ، چونکە هەستیان دەکرد ئەوان کەسێکی گەورە و خەمخۆرن و گوێیان بۆ دەگیرێت ، بە دەمەوە هاتنی داواکەیان لە لایەن مامۆستای بەڕێزەوە ئەوانی هەڵدەنا بۆ کاری چاکە و خزمەتکردن بە کۆمەڵ...

دوانیوەڕۆکەی تاوێك نوست و پاشان هەستا و چوو بۆ ناو باخچەی حەوشەکە ، لە سەر جۆلانەی ژێر دارتووە قەشەنگەکە دانیشت و گورێکی بە خۆی دا و جۆلانەکە کەوتە هات و چۆ ، ئەویش سەری بۆ پشتەوە و هەردوو باڵەکانی بە سەر جۆلانەکەدا بلاو کردبوەوە و بە هەناسەیەکی قووڵ پڕ بە سییەکانی هەوای هەڵدەمژی...

لەگەڵ ڕۆشتن و هاتنی جۆلانەکەدا کەوتە بیرکردنەوە لە یاسای جووڵە: ( مامۆستای "فیزیا " دەیوت : جووڵە گۆڕانی یەکبینەی شوێنی تەنێکە لە چاو شوێنی تەنێکی تردا کە بە نەگۆڕ دابنرێت ، بەپێ ی ئەم پێناسەیە من لە یەك کاتدا وەستاوم و لە جووڵەشدام ، من بە نیسبەت زەوییەوە لە جووڵە دام ، بەلاّم بە نیسبەت جۆلانەکەوە وەستاوم ، چونکە لە ناو جۆلانەکەدام... سەیرە! کۆبوونەوەی دوو مانای دژ بە یەکتر لە یەك شتدا و لە هەمان کاتدا! من وەستاوم ، من لە جووڵەدام! کێ ناڵێ من ئێستا کە بە ئاگام بەراورد بە هەندێ شتی تر نەنووستووم! هەروەها من زیندووم ، بەلاّم پێدەچێ مردووبم ، من ڕاستەقینەم و لە هەمان کاتدا خەیاڵی، ڕۆماننووسێکی دەست بەتاڵم... لەوانەیە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕۆماننوسەكە جۆلانەكە ببزوێنێ نەوەك "ڕاز" ، ئەم باخە بەم هەموو جوانی و ڕازاوەیی یەوە ئەو ڕۆماننووسە وێنەی دارەكانی دەكێشێ و بە فلْچە و بۆیاخی نیگارەكانی سەوزیان دەكات... كێ نالێ داپیرە داهێنراوی ئەندێشەی ڕۆماننووسێك نییە؟!)

لەو كاتەدا داپیرە بە سۆندەیەكەوە خەریكی ئاودانی باخچەی گوڵەكان بوو "ڕاز" بانگی لێ كرد: ( هۆ داپیرە ، تۆ خەیالێت یان داپیرەی ڕاستەقینەیت؟! ئەو گوڵانە تۆ ناشتوونت یان ڕۆماننووسەكە؟! ئەو ئاوە ئاوی ڕاستەقینەی بیرەكەیە یان لە نووكی قەڵەمی نووسەری ڕۆمانەكەوە دادەچۆڕێ ؟!)

داپیرە سەرنجێكی قووڵی دایە "ڕاز" و وتی: ( كوڕم ، وڕێنە دەكەی؟ خۆ نەنوستووی ؟!)

ڕاز: ( نەنوستووم ، بەلام لەوانەیە نووستبم ، وڕێنە ناكەم ، بەلام لەوانەیە وڕێنەم پێ بكەن ، یاخود ڕاستییەكان لەسەر زمانی من بدركێنێ...)

داپیرە: ( كێ یە ڕاستییەكان لەسەر زمانی تۆ دەدركێنێ ؟!)

ڕاز: ( ڕۆماننووس...)

داپیرە: ( دەڵێم ئەوەندە كتێب مەخوێنەرەوە ، دوو دینارت پێ دەدەم تۆش بە كتێبی دەدەی و دێنیتیەوە بۆ گیانم ، شەڵلا كتێبەكانیش كتێب بوونایە ، كۆمەڵێك نووسەری شێت كە تەنانەت خۆشیان لە خۆیان تێناگەن...)

ماوەیەكی تر لە جۆلانەكەدا مایەوە و پاشان چوو بۆ لای داپیرە و سۆندەكەی لێگرت و دەستی بە ئاودانی گوڵەكان كرد ، داپیرە لەسەر كورسی یە دارەكەی ناو چیمەنەكە لێ ی دانیشت و سەیری " ڕاز " ی دەكرد: ( تۆقە گوڵی لای دارمێوەكەت لە بیر چوو ئەوانیش ئاو بدە)

ڕاز: ( ئاه... ڕاست دەكەیت ، دەگەڕێمەوە بۆ لایان )

داپیرە: ( دەترسم ڕۆماننووسەكە نەهێڵێ ئاویان بدەیت..!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( بە پێکەنینەوە.... ئەو نووسەرە شێتە خۆشی بێ و ترشی بێ هەر ئاویان دەدەم...)

داپیرە هەستا و وتی: ( "ڕازە" گیان کە تەواو بوویت پلاکی موزەخەکەت لەبیر نەچێت ، بیکوژێنەوە...)

ڕاز: ( ئەگەر ڕۆماننووسەکە لە بیری نەچوو ، باشە بە سەر چاو...)

شەو هەندێك بە دیار تەلەفزیۆنەوە دانیشت و لە یەکێك لە کەناڵەکانەوە هەواڵەکانی جیهانی گوێ لێگرت: ( بوومەلەرزەیەکی بەهێز بە گوژمی " شەش " پلەی ڕێختەر گەورەترین شار لە " ژاپۆن " دەهەژێنێ... سەندیکای کرێکاران لە " فەرەنسا " بڕیاری مانگرتن دەدەن... زانایانی " بۆماوە " ی بەریتانیا بیر لە کۆپی کردنی بەرخێك دەکەنەوە... فیلێك لە شانۆیەکی نمایشی سێرکدا یاخی دەبێت و خاوەنەکەی خۆی دەکوژێت...پاشان " ڕاز " هەستا و هۆڵی دانیشتنەکەی بە تەلەفزیۆنەکەوە بەجێ هێلاً و هاواری کرد: ( داپیرە من دەچم بۆ ژوورەکەی خۆم...)

داپیرە لە چێشتخانەکەوە: ( کوڕم ، کاکاوێکم بۆ ئامادە کردووی)

" ڕاز " گەڕایەوە و کوپەکەی لێگرت و وتی: ( دەچم لە ژوورەکەی خۆم دەیخۆمەوە ، خوێندنم هەیە...)

لە ژوورەکەی خۆیدا بە دەم خواردنەوەی کوپە کاکاوەکەوە ، لە بیری خۆی دا : ( ئەگەر قوربانیانی کارەساتی بوومەلەرزەکە بە دەستی ڕۆماننووس بوو بێت ، دەبێ ئەو ڕۆماننووسە بدرێ بە دادگا... جا لای کێ شکات لە ڕۆماننووس دەکرێت؟! چ دەسەلاًتێك هەیە ڕۆماننووس پابەندی بەها ئەخلاقیەکان بکات؟ هیچ هێزێك ناتوانێ ڕۆماننووس ناچار بکات ) پاش ماوەیەك لە وەستان: ( با ، ویژدانی خۆی... ئەی ئەگەر ویژدانی نەبوو؟ بلێ ی کەسی بێ ویژدان ببێ بە ڕۆماننووس؟ پێم وانی یە... بۆ پێت وانی یە؟)

پرسیارەکانی بێ وەلاًم بەجێ هێلاً و کەوتە ئامادەکردنی چاپتەری "هەشت" ی کتێبی ئەدەبی ئینگلیزی: ( ئۆل ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستای زمانی ئینگلیزی چیرۆکەکەی لای قوتابییەکانی شیرین کرد بوو ، ئەوان بۆ سەرئەنجامی " ئۆلیڤەر " بە پەرۆش بوون... مامۆستاش هەر وانە و بەشێکی بۆ باس دەکردن ، وانەی داهاتوویان خاڵی: (A) و: (B) لە چاپتەری " هەشت " ئەرکی ماڵەوەیان بوو..

دوای لەبەرکردنی ئەو دوو بەشەی بە سەریاندا درا بوو لەسەر پشت بە سەر جێگەی نوستنی دا ڕاکشا و کەوتە خەیاڵی " ئۆلیڤەر ": (چەند منداڵێکی کەم بەخت و بێ چارەیە ! دایك و باوکی خۆت نەبینی و لە کۆمەڵگایەکی بێ بەزەیی وەك ئەو سەردەمەدا ژیان بەسەر بەریت ! هەموو ئازارەکانی ئەم منداڵە تاوانی چیرۆکنووسەکەیە ، "چارلس دیکنز" دەیتوانی " ئۆلیڤەر " بکات بە منداڵی خانەوادەیەکی دەوڵەمەند و خۆش گوزەران .. بەلام بۆ نایکات؟ بۆ ئەوەی ئێمە هەست بە ئازارەکانی یەکتری بکەین... چیرۆکنووس " ئۆلیڤەر " ی کردە قۆچی قوربانی هەموو ئەو منداڵانەی ئەورۆ لە "ئەوروپا " دا خۆشترین زیندەگی بەسەر دەبەن .. بەلام ئەی " ئۆلیڤەر " گوناهی چی بوو؟ بۆ دەبێ لە پێناوی ئەوانی تردا بکرێتە قوربانی؟ کێ پاداشتی " ئۆلیڤەر" بداتەوە و قەرەبووی زیانەکانی بۆ بکاتەوە؟ من لە " بەریتانیا " بوومایە لە دادگا داوایەکم لەسەر " چارلس دیکنز " تۆمار دەکرد و داوای گێڕانەوەی مافەکانی "ئۆلیڤەر"م دەکرد...

لەوانەیە ئەو هەموو بەرگریەی من لە " ئۆلیڤەر " ی دەکەم "ئۆلیڤەر " وەکو من بیر نەکاتەوە ، کێ ناڵێ ئەویش داوایەك لەسەر من تۆمار ناکات و تیای دا بەوە تۆمەتبارم ناکات کە ڕۆڵم لێ تێك داوە ، ئەو ویستوویەتی منداڵێکی هەژاری بێ دەرەتان بێ و "ڕاز" یش دەیەوێ بە ڕۆڵەی خانەوادەیەکی دەوڵەمەندی بکات؟)

بۆ سبەینێ لە قوتابخانە " ڕاز و ڕاوێژ " بە دەم تێپەڕبوونی مامۆستای " فیزیا " وە بە هۆڵەکەدا بەڵێنەکەی دوێنێیان بە بیر هێنایەوە ، مامۆستاش وتی: لە بیرمە... وانەی سێ یەم وانەی "فیزیا" بوو ، مامۆستا دوای ڕۆژباش وتی: ( ئەورۆ دەمەوێ وانەی "فیزیا" باس نەکەم و گفتوگۆیەك لە گەڵ یەکتردا بکەین...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

قوتابیان: ( زۆرمان پێ خۆشە ، سوپاس مامۆستا...)

مامۆستا: ( دەمەوێ گفتوگۆیەكەمان بە پرسیارێك دەست پێ بكەم: ئایا پێویستە بە ئەخلاق بین ؟)

پرسیارەكەی بە تەباشیرێكی سوور لەسەر تەختەڕەشەكە نوسی و وتی: ( بۆیە بە سوور پرسیارەكە دەنووسم ، چونكە پرسیارێكی تابۆ و قاچاخە)

چەند قوتابییەك لە شوێنی خۆیانەوە دەستیان بەرز كردەوە و مامۆستا سەرەتا "جوتیار" ی هەستاند و پێ ی وت : وەرە سەر تەختەڕەشەكە و من لە جێگەی تۆ دادەنیشم...

" جوتیار " هاتە سەر تەختەكە و وتی: ( بە ڕای من ئەخلاق كۆمەڵێ كۆت و بەند و باوە و هیچ پێویست ناكات ئێمە پابەندی شتێك ببین نە بەرهەمی دەستی خۆمانە و نە پێشمان خۆشە بەو شتانەوە ببەسترێینەوە...)

مامۆستا ڕووی كردە قوتابییەكان و وتی: ( كێ پرسیاری هەیە لە "جوتیار " با بیكات...)

زۆر قوتابی دەستی هەڵبڕی و مامۆستا ئاماژەی بۆ یەكێكیان كرد ، قوتابییەكە لە جێگەی خۆی هەستایە سەر پێ و وتی: ( كاك "جوتیار" بەدیلی بە ئەخلاق بوون چی یە ، ئێمە گەر نامانەوێت بە ئەخلاق بین دەبێ چیتر ببین؟!)

جوتیار: ( هەرچییەك بێت لەم كۆت و زنجیرە كۆمەڵایەتییانە باشترە)

قوتابیەكی تر: ( هەر كەسێك ئەم جۆرە لە ئەخلاقی قبوڵ نی یە دەبێ لە خۆیەوە دەست پێ بكات ، ئایا كاك " جوتیار " ئامادەیە لەو شتانەی ئەورۆی كۆمەڵگە یاخی ببێت؟)

جوتیار: ( ئەگەر تۆم لە گەڵدا بێت ، بەڵێ )

مامۆستا: ( سوپاس كاك "جوتیار"، فەرموو دانیشە ، كێیتر دەیەوێ وەڵامی پرسیارەكە بداتەوە؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" یوسوف " دەستی بەرز کردەوە و مامۆستاش فەرمووی لێ کرد بۆ سەر تەختەکە و وتی: ( بە ڕای من دەبێ پێناسەی ئەخلاق بکەین ، ئەوجا بڕیارمان پێ دەدرێت ئایا بە ئەخلاق بین یان بێ ئەخلاق؟)

مامۆستا: ( قسەیەکی زۆر باشە ، خۆت دەتوانی پێناسەیەکمان بۆ بکەی؟ یاخود هەر قوتابییەکی تر بتوانێت پێناسەیەکی ئەخلاقمان بۆ بکات ؟)

یوسوف: ( لای من ئەخلاق ئەوەیە: کۆمەڵگا باوەڕی پێ هێناوە و بە ڕاستی دەزانێت ، واتە خەیاڵگەی گشتی کۆمەڵ بە ڕەوای بزانێت )

مامۆستا: ( پێناسەیەکی تر؟)

قوتابیەك: ( هەموو ئەو شتانەی ئایین بە پەسەندی دەزانێت لای من پەسەندە و پابەندبوون پێیانەوە ئەخلاقە...)

قوتابییەکی تر لە ڕیزی لای پەنجەرەکەوە: ( من ئەوەی ئایین دەیڵێ قبولم نی یە و خۆشم بە بێ ئەخلاق تەماشا ناکەم )

مامۆستا: ( کەسی تر هەیە بیەوێ هەستێتە سەر تەختەکە؟)

" شاروخ " دەستی بەرز کردەوە و مامۆستاش فەرمووی لێ کرد: (ئەخلاق پێوەرێکی ڕێژەیی هەیە و هەندێ شت لای ئێمە و لەم کۆمەڵگای ئێمەدا بە ئەخلاق سەرژمێر دەکرێ و لە گۆمەڵگەیەکی وەکو " سوید " دا سەرژمێری بێ ئەخلاقی بۆ دەکرێت یان بە پێچەوانەوە ، بۆیە هەر کۆمەڵگەیەك بە پێ ی فەرهەنگ و کولتوری تایبەت بە خۆی ئەخلاقی تایبەت بە خۆی هەیە...)

مامۆستا وتی: ( کەس پرسیاری لە کاك " شاروخ " هەیە ؟)

ڕاز: ( بەڵێ ، کاك " شاروخ " پێت وانی یە لە نێوان هەموو فەرهەنگ و کولتوورە جیاجیاکاندا پانتاییەکی هاوبەش بۆ ئەخلاق بوونی هەبێت؟ بۆ نموونە کوشتنی منداڵێکی شیرەخۆرە لە تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا بە تاوان سەرژمێر دەکرێت ، هەر بەو جۆرە: درۆکردن و ڕاستگۆیی ، دزی و داگیرکردنی سامانی هەردوومان ، دەستگرۆیی و یارمەتی دانی هەژاران و بێنەوایان ، داگیرکردنی ئافرەت و بە زۆر کاری سێکس لەگەڵ کردنی ، بەکارهێنانی منداڵ بۆ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کاری دزی و لەش فرۆشی....ئەمانە و دەیان و سەدان لەم نموونانە بەڵگەی بوونی کۆ ناوەندێك نی یە کە ناکەوێتە ژێر پێوەری ڕێژەیی بوونەوە؟)

بەر لەوەی " شاروخ " وەڵام بداتەوە ، مامۆستا هەستا و بۆ دانیشتنەوە فەرمووی لە "شاروخ " کرد و " شاروخ" یش لە شوێنی خۆی دانیشتەوە ، مامۆستا چاوێکی گێڕا بە سەر هەموو قوتابییەکاندا و وتی: ( لە کۆی قسەکانی ئێوەوە دەگەینە چەند دەرئەنجامێك کە بە خاڵ دەتوانین لەسەر تەختەڕەشەکە بینووسین:

* کۆمەڵێك بەندوباوی کۆمەلایەتی هەیە ئێمەی مرۆڤ دروستمان کردووە و لە پرۆسەیەکی گۆڕانی بەردەوامدا دەتوانرێ بە پێ ی "ئاکتیڤ " بوون و " پاسیڤ " بوونی ئەو ئەخلاقانە گۆڕانیان تیا بکەین و دەستبەرداری هەندێکیشیان ببین ، تا چەند ساڵ لەمەوبەر بووك ئافرەتێکیان لە ماڵی باوانەوە تەك دەخست بە ناوی "پێخەسوو"، بەڵام ئێستا ئەو خووە ناپەسەندە لە گۆڕ نراوە و نەماوە...

* بە دیلی بە ئەخلاقبوون بریتییە لە " بە ئەخلاقبوون " نەك " بێ ئەخلاقبوون "، چونکە ئەخلاقێکی دزێو لە ئەمڕۆدا و پەسەند لە دوێنێی دووردا لا دەبەین و ئەخلاقێکی پەسەند لە جێگەی دادەنێین ، یان پەسەندێ لادەبەین پەسەنترێك دێتە ئاراوە...

* گۆڕان هەوڵی تاکە کەسێك نی یە و لە چەند ڕۆژێکدا گۆڕان بەرهەم نایەت ، بۆ ئەوەی دیاردەیەکی کۆمەلایەتی نارەسەن – لە ئەمڕۆدا – بە دیاردەیەکی چالاك و پەسەند بگۆڕین دەبێ بەشێکی زۆری کۆمەڵگە یان هیچ نەبێ دەستەبژێری ڕۆشنبیر و دەسەلات بەشدار بن لەو گۆڕانەدا...

* بۆ پێناسەی ئەخلاق چەندین پێوەر بوونی هەیە: ئایین ، ڕۆشنبیری ، پەیوەندی یە ئابوریەکان ، یاسا ، عورفی کۆمەڵ ، هەموو ئەمانە کۆ دەبنەوە و مۆری ئەخلاق بە دیاردەیەك ، پەیوەندیەك ، یاخود نەریتێکدا دەنێن....

* ئەخلاق لە دوو ئاست دایە ، ئاستێکی گۆڕا و کە ڕێژەیی بوون لە گۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر و لە فەرهەنگێکەوە بۆ فەرهەنگێکی تر وەردەگرێت ، گۆڕان لەم بەشەدا کارێکی سروشتی یە ، ئاستی دووەم ئاستێکی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نەگۆڕە و ئەو پانتاییە نەگۆڕەیە کە " ڕاز " ئاماژەی پێکرد ، ئێمە ناتوانین لە ڕۆژهەڵات دا ڕاستگۆ بین و لە ڕۆژئاوادا درۆزن ، ڕاستگۆیی لەسەرو زەمەنەوەیە و بەهایەکی قبوڵکراوی سەرجەم مرۆڤایەتی یە..

لەم " پێنج" خاڵەوە کە بریتی یە لە "پێنج" بنەما بۆ سەیرکردنی "ئەخلاق " دەگەمە سەرئەنجامێك ئەویش ئەوەیە: مادام بڕیارمانداوە لە گۆمەڵگەدا بژین دەبێ بەشێك لە حەزەکانی خۆمان بپەرچێنین ، یاخود بچەپێنین بۆ ئەوەی کۆمەڵگە فرێمان نەداتە دەرەوەی ڕەحم و هەناوی خۆیەوە ، ئەگەر دەشڵێ ی من ئەو بەند و باوانەم قبوڵ نی یە ئەوە کەس زۆری لێ نەکردووی و دەتوانی کۆمەڵگە بەجێ بهێڵی و ڕوو لە ئەشکەوتێك بکەیت ، هەر لێرەوە پێم باشە بڵێم: ئەم پۆلەی ئێوە نموونەی کۆمەڵگەیەکی بچووك کراوەیە ، هەر یەکێك لە ئێوە بەشێك لە حەز و خواستەکانی خۆی لەم پۆلەدا ون دەکات ، چونکە ئامانجێکی دەستە جەمعی ئێوەی لەم پۆلەدا کۆ کردۆتەوە ، هەر کارێك لەم پۆلەدا پێچەوانەی ئەو ئامانجە بێت کە خوێندن و فێربوونە پۆلەکە مۆری ناشەرعییەتی پیا دەنێ و پێی قبوڵ ناکرێت ، من دەزانم لەوانەیە کەسانێك هەبن لە کاتی ئەم وتووێژەی خۆماندا حەزیان بە سیاچەمانە، یاخود هەڵپەڕکێ بوو بێت ، بەڵام دەبێ بیر لەوە بکەنەوە ئەم پۆلە نە ناو باخە گوێزەکانی هەورامانە ، نە تیپی هەڵپەڕکێ ی کوردستانە ، ئێرە پۆلە و ئامانجێك لە کۆبوونەوەماندا هەیە و دەبێ بە ڕاسترین و ئاسانترین ڕێگە ئامانجەکانی خۆمان دەستەبەر بکەین ، بۆیە تکامە حورمەتی پۆلەکەتان بگرن و مافی گشتی پێشێل مەکەن...)

لەگەڵ وتنی ئەو ڕستەیەدا زەنگی پشوو لێ ی دا و مامۆستا پۆلەکەی بەجێ هێڵا...

لە کاتی گەڕانەوەیاندا باسی نێوان " ڕاز " و " ڕاوێژ " بابەتەکەی ئەوڕۆی مامۆستای "فیزیا" بوو ، " ڕاوێژ "پرسیاری کرد: ( باشە بۆ مامۆستایانی تر وەك مامۆستای "فیزیا " ناوبەناو گفتوگۆیەك لەگەڵ قوتابیان ساز ناکەن؟!)

ڕاز: ( لەگەڵ ڕێزم بۆ سەرجەم مامۆستایان ، هەندێ مامۆستا پێ ی وایە گەر خۆی دابەزێنێت بۆ ئاستی قوتابییەکانی ئەوا کەسایەتی لەکەدار دەبێت و بە چاوێکی نزم تەماشا دەکرێت)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاوێژ: ( بەڵام هەموو قوتابییەکیش شایستەی ئەوە نی یە مامۆستا لەگەڵی وەك دوو برادەر هەڵس و کەوت بکات)

ڕاز: ( بۆ ؟!)

ڕاوێژ: ( چونکە هەندێك قوتابی هەلپەرست و نارۆشنبیرن و ئەو پەیوەندییەی نێوان مامۆستا و قوتابی بە ئاقارێکی تردا دەبەن )

ڕاز: ( بەڵام بە هۆی چەند قوتابییەکەوە نابێ ئەو یاسا دروستەی پەیوەندی نێوان مامۆستا و قوتابی واز لێ بهێنرێت کە ئەویش گفتوگۆ و گوێگرتنە لە یەکتری )

کاتێك " ڕاز " خواحافیزی لە ڕاوێژ کرد ، کەوتە بیرکردنەوە لەو قسەی مامۆستا کە دەیوت: " ئەگەر بەهاو داواکانی کۆمەڵگەت لا قبوڵ نی یە دەتوانی کۆمەڵ بەجێ بهێڵی و ڕوو لە ئەشکەوتێك بکەیت " ، لە خەیاڵی خۆیدا: ( بڵێ ی پیرەمێردی ئەشکەوتەکە لە کۆمەڵ یاخی بووبێت و نەیەوێ بچێتە ژێر نیر و هەوجاری جووتی کۆمەڵگەوە ؟! بۆ نە ؟ لەوانەیە..)

شەو دوای خوێندی وانەکانی هەموو گفتوگۆیەکەی ئەو ڕۆژەی نێوان مامۆستا و قوتابیانی هێنایەوە بەر زەین و لە ڕاستی و ناراستی قسەی هەریەکێکیان دەکۆڵیەوە: ( مامۆستای "فیزیا " ش بۆخۆی ڕۆماننووسێکە ، ئەو بەڵگە و بورهانی ئەقڵی لە ئاستێکدایە دەتوانێت بەردت لێ بکات بە وشتر و بۆ بەرانبەرەکەشی بسەلمێنێ...بڵێی ئەم ڕۆڵە باش و کاریگەرەی ئەقڵ دیسان کاری دەستی ڕۆماننووسەکە بێت؟! کاری ئەو بێت و بیەوێ لە کەسێکی وەك مامۆستای " فیزیا " دا گەورەیی و دەسەڵاتی ژیری مرۆڤ نمایش بکات ؟! من تا ئەو ڕۆماننووسە نەبینم ڕاستی و ناڕاستی شتەکانم بۆ یەکلا نابێتەوە....جا چۆن کارەکتەری ناو ڕۆمان – کە منم – دەتوانێ ڕۆماننووس ببینێ؟! هەریەك لە ئێمە بەشێکە لە زەینی ڕۆماننووس ، واتە ئێمە ئەوین ، بەڵکو بەشێکی دانەبڕاوین لە ئەو ، کەسێك میهری بەسەردا ڕژاوە و کەسێکی تر قار ، کەسێك دەوڵەمەندی و یەکێکی تر هەژاری...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كەوابوو ئەو قسەیە دروستە كە دەڵێت: " هەركەسێك خۆی بناسێ ئەو دەناسێت "، چونكە ئەو كەسە بەشێكی دانەبڕاوە لەوێنەكانی زەینی ئەو.... ئەم تێڕوانینە بۆ بوون شتەكانمان لا دەكات بە سێبەر ، ئەو كتێبخانەیە ، ئەو پەردەیە ، ئەو منداڵە گەدایەی تابلۆی سەردیوارەكە ، هەر هەموو سێبەرن...تابلۆی سەر دیوارەكە سێبەری سێبەرە ، نیگاركێشەكە بۆ خۆی سێبەرە ، چونكە وێنەی سەری ڕۆماننووسەكەیە كەچی هاتووە و سێبەرێكی لە زەینیدا خولقاندووە ئەویش تابلۆی منداڵە گەداكەیە..گوناهی ئەم منداڵە چییە لە زەینی نیگاركێشدا ڕۆڵی گەدایی پێدراوە؟ بۆچی وەك منداڵەكانی تری ناو پۆلەكە — وەك لە تابلۆكەدا هاتووە — دڵخۆش و خۆشنوود نەبێت؟ بۆ بەشی ئەم منداڵە لە زەینی وێنەكێشەكەدا كەشكۆڵێك و پۆشاكێكی كۆن و وێڵبوون بێت بەدوای پارووییەك نان دا ، بەلام منداڵەكانی ژوورەوە — وەك لە وێنەكەدا دەردەكەوێ— خۆشبەختن و منداڵی دەوڵەمەندن و خەریكی خوێندنن؟! ئێمە گەر لە نیگاركێشەكە بپرسین بۆچی لە كێشانی تابلۆكەتدا قورت بەسەر ئەو منداڵە گەدایەدا كرد و ئەوانی ترت لە میهر و بەزەیی خۆتدا نوقم كردووە؟ دەبێ نیگاركێشەكە وەلامی چی بێت؟!

لەوانەیە بڵێت: من واقیعێكم باس كردووە ، ژیان پڕە لە منداڵی گەدا و منداڵی كامەران ، دەمەوێ سەرنجی تۆ بۆلای حەقیقەتی ژیان ڕابكێشم... بەلام منیش پێی دەڵێم: ئەو منداڵەی ناو تابلۆكە چ گوناهێكی كردووە كە تۆ كردت بە هێمای گەدایی و دەربڕی ئەو واقیعەی باسی لێوە دەكەیت؟

لەوانەیە ئەویش بڵێ: ئەو وێنەیە حەقیقەتی نییە ، ئەو وێنەیە هێمای ئازارەكانی منە ، ئەوە منداڵە گەداكە نییە ئازاری مەینەتییەكانی ژیان دەچێژێ ، بەڵكو منم بە گەدایی منداڵەكە هەڵدەقرچێم ، منم بە شادومانی منداڵەكانی تری ناو تابلۆیەكە شادمان دەبم....

كەوابوو تابلۆیەكە لە ناو نیگاركێشەكەدایە ، ململانێی نێوان هێزەكانی ناوەوەی نیگاركێشەكە خولقاندوویەتی... نیگاركێشی تاوان نییە ، تاوانە؟! نیگاركێشەكەش بێگوناهە ، چونكە لە زەینی ڕۆماننووسەكەدا ڕۆڵی نیگاركێشی بۆ دیاری كرا بوو..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەیانی زوو لە خەو هەستا و بۆ هەڵمژین و چێژ وەرگرتن لە نەسیمی بەرەبەیان چوو بۆ ناو باخەکە.. دەنگی کوختییەکان و جریوە جریوەی پاسارییەکان و گمە گمی کۆترە ماڵییەکان لە گەڵ شنەبای ئەو بەرەبەیانەدا سەمفۆنیایەکی پڕ لە سیحری ئاوازی خولقاند بوو.. دوگمەی سینەی گوڵەباخەکان ترازا بوو ، بانگیان لە هەنگ و پەپوولە دەکرد بۆ ئەوەی بێن و تێر تێر بۆنی ئەو سینە ناسك و بۆندارە بکەن... لقی درەختەکان بۆ شنەبای بەیانی سەمایان دەکرد ، قومریە عاشقەکە دڵی ڕەنجا و لەسەر لقەکە هەڵفڕی ، پێ ی ناخۆش بوو لقی داری مەعشوقی ئەو خۆشەویستی خۆی بدات بە شنەبا و سەمای بۆ بکات... لەو بەرەبەیانەدا هەموو شتێك هەناسەی دەدا... جوانترین ڕەنگ ڕەنگی ئەو بەرەبەیانە بوو ، ڕەنگەکان کە تێکەڵ دەکرێن هونەری لێوە پەیدا دەبێت ، ڕەنگی سەوزی درەختەکان و ڕەنگی شنەبا و ڕەنگی خوێندنی باڵندەکان ، تێکەڵ بە یەکتر کرابوون و بۆیەیەکی ئەفسووناویی پێك هێنا بوو کە بەسەر لێوی گوڵ و سینەی گەڵا و بەژنی باوە دەبریسکایەوە.... هەموو بەرەبەیانێك حەشرێکە... هەنگی هەستی شاعیر بەو بەرەبەیانە لەم گوڵەوە بۆ ئەو گوڵ ئیلهامی شیلەی شیعری دەمژی و دەیبرد شانەی شیعری هەنگوینی لێ دروست دەکرد...

جوانی سروشت هۆنراوەی شاعیری هێنایەوە بەر یاد کە دەڵێت:

سەرم کێشایە ناو  
باخی ئەو دێ یە  
ماچی دەمی گوڵی هەنار  
بۆ کێ یە ؟!

لە پەنایەك گوڵەباخ  
لە ژووانە  
لەگەڵ هەنگ دا  
دەستییان لە ملانە ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شورەییە

ماچ کراوە لە ناو باخ !

بە چی دیارە ؟

لێوی تەڕە گوڵەباخ...

سەیری پەپوولە

چەندە بێ ئابڕووە

ئاوێزانی سینەی

شەستپەڕە بووە....

ئەو گەڵایە

بوو بە سوخمەی شەمامە

دای دەپۆشێ

ئەو میوە پڕ لە تامە..

" ڕاز " لە هەموو ئەمانە ڕاما بوو ، هەموو شتێك سەرنج ڕاكێش بوو: بەرەبەیان تابلۆیەكی زیندووی نیگاركێشە.. لە ناو ئەم تابلۆیەدا هەركەسە و سەرقاڵی ئەرك و كاری خۆیەتی... كەسەكانی ناو ئەم تابلۆیە ناڕازی نین بەو ڕۆڵەی پێیان بەخشراوە...

كەی پەپوولە ڕۆژێك سكاڵانامەیەكی بۆ كورتی تەمەنی بەرز كردەوە؟ لە كوێ پاسارییەكان بۆ كەمی خۆراك ڕۆژێ مانیان گرت؟ لە كەم بارانیدا كەی گیا بڕیاری خۆكوشتن دەدات؟ بۆچی نەسیمی بەرەبەیان لە زوو كەوتنە ڕێ ڕۆژێ ناوچاوانی گرژ نەكرد؟ قالاوێكم نەبینی عەرزەوحاڵێك بۆ سپی كردنەوەی ناوچاوانی بەرز بكاتەوە؟ لە زەڕافەیەك نەبیستڕا گلەیی لە گەردنی بەرزی خۆی بكات؟ كەروێشكێك، ئاسكێك نەهات و بڵێ من مەزلومم؟

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەڵام ئایا بێ دەنگی ئەوان نیشانەی بێ خەمی و ڕازیبوونیانە؟!)

داپیرە بانگی "ڕاز" ی کرد و "ڕاز" یش باخچەکەی بەجێ هێڵا و هاتەوە بۆ لای ئەو، داپیرە ژەمی بەیانی بۆ ئامادە کرد بوو، سەماوەرە زەردەکەی پێ کرد بوو، قۆریە شووشە جوانەکەی لەسەر دانا بوو، داپیرە بە قۆریەکەی دەوت کچە بچکۆلەکەم.. کاتی خۆی "وەستا مەحمود" ی هاوسەری خۆشەویستی لە "سنە" وە بە دیاری بۆی هێنا بوو، ئەویش زەنگیانەی هۆنی بووەوە و کرد بوویە مل و گۆپکەی سەری قۆریەکە و بە زەنگیانەی تر سەری قۆریەکەی بە دەسکەکەیەوە بەستبووەوە، داپیرە قۆریەکەی زۆر خۆش دەویست، بۆیە لە بۆنە و جەژنەکاندا نەبوایە چای تیادا لێ نەدەنا، جار جارێکیش لە سەر داوای "وەستا مەحمود" دەری دەهێنا و عەسرە چایەکی تیا دەرخواردی هاوسەرە خۆشەویستەکەی دەدا.... سفرە بچووکە دوو کەسییەکەی ڕاخست بوو، کەرێی کوردی و پەنیر و قاپێك هەنگوینی پاڵفتەی لەسەر دانا بوو...

ڕاز وتی: (داپیرە گیان، چۆن بوو ئەم بەیانی یە قۆریە شووشەکەت دەرهێنا ؟!)

داپیرە: (ئەم شەو لە دانیشتنێکی وەکو ئەم دانیشتنەی خۆماندا باپیرتم بینی، لە قۆریە شووشەکەدا چام بۆ لێنا بوو، زۆر ڕووگەش و بە شەوق بوو، وتی: ئافرەت جارجار لەو قۆریە شووشەدا چا بۆ "ڕازە" گیان لێ بنێ، ئەوا منیش چام لە کچە بچکۆلەکەم دا بۆ لێناوی...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٣ -

# تیپی شانۆی ئاژەڵان

ئەو ڕۆژە لەوانەی " ئایین" دا گفتوگۆیەکی تێر و تەسەل لە نێوان مامۆستا و قوتابییەکاندا ئەنجام درا ، وانەکەیان بریتی بوو لە حیکمەتەکانی پەرستش و بەندایەتی بۆ خودا .

مامۆستا دەیوت: هەر جۆرێك لە پەرستش حیکمەتێکی لە پاڵدایە ، کۆی هەموو حیکمەتەکانیش بریتییە لە "پاك بوونەوە".

ڕاوێژ پرسی: ( مامۆستا ، بۆ دەبێ خودا ئێمە بە پیس دروست بکات و پاشان داوای پاکبوونەوەمان لێ بکات؟! )

مامۆستا: ( ئێمەین ناخ و دەرەوەی خۆمان پیس دەکەین ، نەك خودا بە پیسی خولقاندبین ، بۆیە دەبێ خۆشمان بە کاری خۆپاککردنەوە هەڵبسین... )

قوتابیەکی تر: ( خودا نەیدەتوانی ئێمە بە پاك بخولقێنێ و ئەو غەریزە و حەزە شەیتانیانەمان تیادا نەڕوێنێ؟! )

مامۆستا: ( بەڵێ دەیتوانی ، ئەوە نی یە فریشتەکانی بەو جۆرە خولقاندووە ، ئێمەشی بە پاك خولقاندووە ، لە لای خودا هیچ دروستکراوێکی لە بنچینەدا پیس و ناپاك نییە ، تەنانەت شەیتان بنچینەکەی پاك و بێگەردە و ویست و بڕیاری شەیتان خۆیەتی ئەوی گۆڕیوە بە هێمای شەڕ و ناپاکی؟)

هەمان قوتابی پێشو: ( با ئێمەشی بە فریشتە دروست بکردبایە ، بۆ دەبێ من مرۆڤێکی شەڕەنگێز بم ؟! بۆ پرسێکی پێ نەکردم؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا: ( بۆچی تۆی نەکرد بە فریشتە و بە مرۆڤی دروستکردی؟ ئەوەیان نازانم ، بەڵام دەزانم دەبێ خودا پرسیاری لەو چەشنەی لێ نەکرێت ، ئەو بۆیە خودایە کە دەسەڵاتی هەبێت ، ئەگەر دەسەڵاتی لێ وەربگیرێتەوە پێ ی ناوترێت خودا... من پێم وایە ئەگەر هەندێکمان خودا بە فریشتە خەڵقی بکردبااین پرسیارمان لە خودا دەکرد و دەمانوت: خودایە بۆ دەبێ مرۆڤ ئەو هەموو ڕێزەی لێ بنرێ و ئێمەی فریشتەش بە هەمیشەیی سوژدەت بۆ ببەین ، ئەی بۆ بە مرۆڤت نەخولقاندین؟! بەو پرسیارەش لە فریشتەیی دەکەوتین و دەبووین بە هاوەڵی شەیتان...)

هەمان قوتابی ( بەڵام ئەگەر فریشتەباینایە ئەو پرسیارەمان لە خودا نەدەکرد ، مرۆڤبوونە ئەم گشت پرسیارەی بۆ ئێمە و لای ئێمە خولقاندووە ! )

مامۆستا ( شەیتان لە خانەی فریشتەکاندا بوو ، بەهۆی ڕەخنەوە ئەو سەرئەنجامەی بۆ دروست بوو ، ئەو قسە دروست نابینم گەر پێمان وابێت فریشتە پرسیاری نییە ، ئەوان پرسیار لە خودا دەکەن ، کاتێك خودا پێیان دەڵێت: دەمەوێت زەوی ئاوەدان بکەمەوە و جێنشینێك بۆخۆم دیاری بکەم ، فریشتەکان بە یەك دەنگ لە پرسیارێکدا دەڵێن: پەروەردگارا ، کەسانێك لە زەویدا دادەنێیت خوێن برێژن و شەڕ و خراپە بەرپا بکەن؟!

بۆ ئەو بەشەی پرسیارەکەشت کە دەڵێیت: بۆ دەبێ مرۆڤێکی شەڕەنگێز بین؟! من پرسیارەکە دەکەمەوە بە پرسیار: کێ زۆری لێ کردووی مرۆڤێکی شەڕەنگێز بیت؟)

قوتابیەکی تر: ( غەریزە شەڕەنگێزەکانم زۆرم لێ دەکەن بۆ ئەوەی شەڕەنگێز بم )

مامۆستا: ( ئایا ئەو غەریزە تەنها لە تۆدا ڕوواوە یان لە هەموو مرۆڤێك دا بوونی هەیە؟)

هەمان قوتابی: ( لە هەموو مرۆڤێك دا بوونی هەیە ، بەڵام بە ڕێژەی جۆراوجۆر ، چونکە من پێم وایە مرۆڤ کائینێکی شەڕەنگێزە..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا: ( بۆ كەسانی تر كاری شەڕەنگێزییان لێ ناوەشێتەوە و زۆر مرۆڤدۆستانە هەڵس و كەوت دەكەن ، ئایا ئەوانە فریشتەن؟ ئایا تۆ ناتوانی وەكو ئەوان وابیت ؟)

هەمان قوتابی: ( نەخێر ناتوانم ، چونكە لە مندا بڕێكی زۆرتر لە شەڕەنگێزی ڕوواوە...)

مامۆستا: ( تۆ پێت وایە ئەوان غەریزەی شەڕەنگێزییان بێ هێزە ، بۆیە مرۆڤدۆستن ؟!)

هەمان قوتابی: ( وەڵامێكم پێ نی یە )

قوتابییەكی تر: ( گریمان بەڵێ )

مامۆستا: ( بەڵگەت چی یە ئەوان هێزی شەڕەنگێزییان دوو بەرانبەری غەریزەی مرۆڤە شەڕەنگێزەكە نی یە ؟)

جوتیار: ( بەڵگەم تاوان نەكردنیانە )

مامۆستا: ( تاوان نەكردن بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیر بوون دەگەڕێتەوە... ئێمە هەموومان — بە غەریزە — حەز دەكەین زۆرترین ماڵ و خۆشترین ژیان و جوانترین هاوسەر بەدەست بهێنین ، بەڵام ئەگەر ئەم حەزە تێر نەكرا دەبێ چی بكەین ؟ دەست بدەینە كوشتن و داگیركردن و تاڵان ، یان بە ڕێگەی دروست بكەوینە هەوڵی بەدەست هێنانی؟ ئەو هێزە چی یە وا لە ئێمە دەكات بە ڕێگەی دروست شوێنی حەزەكانمان بكەوین ؟ وەڵامەكەی دیارە ، بریتی یە لە پەروەردە و ڕۆشنبیربوون... هەموو كۆمەڵگەیەك خاوەنی پەروەردەیەكی تایبەت بە خۆیەتی ، ئەو دەیەوێ ڕۆڵەكانی بەو جۆرە بار بهێنێ كە خۆی دەیەوێت...)

یوسوف: ( ئەگەر كەسێك نەیویست ئەو جۆرە لە پەروەردە و ئەو مۆدێلە لە ڕۆشنبیری قبوڵ بكات ، دەبێ چی بكات؟)

مامۆستا: ( دەبێ یەكێك لەم ڕێگانە بگرێتە بەر: یان كۆمەڵگە بگۆڕێ تاكو ئەو جۆرە لە پەروەردە كە ئەو لە لای پەسەندە لەو كۆمەڵگەدا وەربگیرێت ، یان ڕوو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بکاتە کۆمەڵگەیەکی تر کە باوەڕی بە جۆری پەروەردەکەی هەیە ، یاخود کۆمەڵ بەجێ بهێڵێ و ڕووبکاتە دەشت و سارا...)

شاروخ: ( ئەگەر هیچ یەکێك لەوانە نەکەم و پەروەردەی کۆمەڵیشم قبوڵ نەبێت ، چی دەبێت؟)

مامۆستا: ( کۆمەڵ نەفرەتی خۆیت لێ دەکات ، سزاکانی دەسەپێنێ بە سەرتدا و فڕێت دەداتە دەرەوەی هەناوی خۆیەوە ، یان لە سووچی بەندیخانەدا ونت دەکات...)

ڕاز: ( لەم کێشمە کێشەی نێوان مرۆڤ و غەریزەکانی و مرۆڤ و کۆمەڵگەدا هەڵوێستی ئایین کامەیە و چیمان پێ دەڵێ؟)

لەگەڵ پرسیارەکەی " ڕاز " دا زەنگی پشوو لێدرا و مامۆستا وتی: ( سوپاس بۆ گوێگرتنتان ، پرسیارەکەی " ڕاز " بۆ وانەی داهاتوومان هەڵدەگرین...)

عەسرەکەی " یوسوف و ڕاوێژو جوتیار و شاروخ " سەردانی " ڕاز" یان کرد و لە چیمەنی خوارەوەی باخەکەدا لەسەر کورسی لێی دانیشتن..

" ڕاز " پێنج شەربەتی لیمۆی هێنا و لە بەردەم هاوەڵەکانی داینا و دووبارە زۆر بەخێرهاتنی لێکردنەوە...)

" ڕاوێژ " بە شۆخییەوە و بۆ خۆشکردنی دانیشتنەکەیان ڕووی کردە " ڕاز " و وتی: ( ئەم باخ و چیمەنە دلڕفێنە باشە ڕۆژێ ناتکات بە بولبول!)

ڕاز: ( من ببم بە بولبول تۆش دەبیت بە پاساری )

یوسوف: ( منیش " کەروێشك ")

شاروخ: (لەبەر خاتری ئێوە، برای خۆتان: " کەڵەباب")

جوتیار: ( بۆ ڕێزنان لە جووت و جوتیار دۆستی دێرینتان "گاجووت")

هەر هەموو دایانە قاقای پێکەنین و " ڕاوێژ " وتی: ( وەرن با هەر یەکێکمان ڕۆڵی ئەو گیاندارە ببینێ و گفتوگۆیەك لەسەر جیهانی ئاژەڵان ڕێك بخەین...)

هەر هەموو: ( با... با... با...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گـاجووت " جوتیـار ": ( ئـەورۆ ئـەو مرۆڤـە بـێ ویژدانـە زۆر مانـدوی کـردم ، هاوجووتەکەم گوێدرێژێ بوو لە جووت کردندا فێڵی لێ دەکـردم ، شـانی خـۆی نـزم دەکردەوە و کێشی هـەموو گاسـن و هەوجارەکـە دەکەوتـە سـەر شـانی مـن و نـەم دەتوانی رایبکێشم ، جوتیارەکەش لە جێگەی " کەر "ە فێڵبازەکە لە منی دەدا )

کەروێشك " یوسوف " (ئەھ... ئەھ... ئەھ.. گوێدرێژ گاجووتی خەڵەتاند؟)

گـاجووت: ( مرۆڤـە کـەرەکان نـاوی کـەریان لێنـاوە ، ئـەگینا بەقـەدەر "دە " مرۆڤی فەیلەسوف دەزانێ ، شەیتانێکە بۆ خۆی و لە پێـستی کـەردا خـۆی نمـایش دەکات...)

کەڵەباب " شاروخ " – دووجار لەسەر کورسییەکە باڵی دابەیەکدا و قووقەیـەکی ناسازی بۆ کرد – داپیرە لە هەیوانەکەدا سەیری دەکردن و لەبەر خۆیەوە دەیـوت: ( ئەیرۆ ، ئەو گەنجە جوانانە تێك نەچووبن! ئەوەیان ئەو قووقە قوقەی لە چـی یـە ؟! )

پاشان کەڵەباب هاتە زمان و وتی: ( ئەورۆ ژنی جوتیارەکە دانی بۆ دانـەکردین ، نازانم لە بیری چوو بوو یان سزامان دەدات ؟)

گاجووت: ( مردووت مرێ ، تۆ چـی بـۆ ئـەو ماڵـە جوتیـارە دەکـەی؟ تـەنها دوو قووقەت لەسـەرە و بـەیانی زوو جوتیارەکـە بـۆ گیـانی مـن و گوێدرێژەکـە بـە ئاگـا دێنیت! )

کەڵـەباب: ( مامـە گـاجووت ئـەو دوو قووقەیـە نەکـەم دڵـم دەتـەقێ ، ئـەو دوو قوقەیە مانای زۆرە) .

پاسـاری " ڕاوێـژ ": ( جیـك جیـك ، جیـك جیـك ، منـداڵی جوتیارەکـە دارلاستیکێکی کڕیوە و ژیانی لێ هەراسان کردووین...)

کەروێشك " یوسوف ": ( ئەو هەتیوە خوروزەك لێدراوە ، جەرگی بەخوێن بـێ ، لە پێڕێـوە بـەردێکی داوە بـەلای ڕاسـتمدا ، برِسـکی بڕیـووم، خـەتای دایکـە بـێ سەلیقەکەیەتی ، ڕۆژ تا ئێوارە بە قوربانی دەبێ و ئێوارەش دار و لاستیکەکەی بـۆ دەشارێتەوە ، تاکو بابی پێ ی نەزانێت...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گاجووت: ( گەر پێتان باش بێت سبەی گەڕامەوە لە جووت شۆقێکی لێ دەدەم ، چیش لەو تێ هەڵدان و کلکە خاکەناز شکاندنە لە سەرو گوێم دا ، بەڵکو جوتیارەکە دەستێکم بشکێنێ و چەند ڕۆژێ پشوو بدەم و ڕزگارم بێت لە جووت و وێڵداشە کەرەکەم...)

بولبول " ڕاز ": ( گای بلح ، قۆچ مەوەشێنە ، منداڵە ، بۆخۆی چاك دەبێت)

پاساری: ( ئەو بەچکە شەیتانە چۆن چاك دەبێ؟! )

گاجووت: ( گەورەش بێت هەر وەك باوکە ستەمکارەکەی ئێمە دەخاتە ژێر نیر و هەوجارەوە )

کەڵەباب: ( ئەو چاو بۆقە ، فریشتەی بەیانیان چاویان پێ ی دەکەوێ زەندەقیان دەچێت ) .

کەروێشك: ( داخی ئەوە کوشتوومی دەچێتە بندەستی دایکی و دەڵێ : بە بابە بڵێ حەزم لە گۆشتی کەروێشکە) .

کەڵەباب: ( بە قوزەڵقورتی بێت ، بە بیانوو گرتن جووچکە و مریشك و کەڵەشێری لەم ماڵە بریوە...)

پاساری: ( بەوەش تێر ناخوات ، پاساری دەکوژێت...)

گاجووت: ( ئەوەی ئێوە باسی لێوە دەکەن ڕۆژێك منیش لە پێناوی ورگیدا بە سەربرین دەدات )

کەڵەباب: ( چاو بۆق... چاو بۆق ، قەستمە بە دەندووك چاوی دەربهێنم..) .

بولبول: ( ئەی هاوار! ئەم منداڵەتان کرد بە چی؟! )

پاساری: ( گۆشتت ناخورێ ، ئەگینا تۆشی هەڵدەلووشی)

کەڵەباب: ( چاو بۆق...)

کەروێشك: ( بۆ لە دەستی ئەم منداڵە بیر لە هەڵهاتن نەکەینەوە ؟)

گاجووت: ( جا بۆ کوێ بچین ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کەڵەباب: ( بۆ دارستان... )

پاساری: ( لە دارستان هەموومان تیا دەچین ، یاسای جەنگەڵ لـە بەرژەوەنـدی لاوازەکان نی یە... )

بولبـول: ( ئـاه.. ئـاه... مـن لـەم قەفەسـەدا نـاتوانم بێمـە دەرەوە و لەگـەڵتان گەشتی دارستان بکەم.. )

کەڵەباب: ( برای خۆت ، کەڵەشێر بە دەندووك بۆت دەکاتەوە )

گاجووت: ( لە گورگ زۆر دەترسم )

کەڵەباب: ( داوەشێیت ، لەشی تۆم پێوەبوایە سڵم لە فیل نەدەکردەوە )

کەروێشك: ( جەنگەڵ ڕێوی و چەقەڵی لێ یە؟ )

بولبول: ( نا ، گێزەری لێ یە... )

کەروێشك: ( ئای کە خۆشە ، کێ لەوێ ڕواندوویەتی؟ )

پاساری: ( مام ڕێوی ، دۆستی گیانی بە گیانیت )

کەڵەباب – بە کەروێشك –: ( ترسی ناوێ ، ترسی ناوێ ، برا لـە پـشت بـرا بـێ مەگەر قەزا لە لای خودا بێ )

گاجووت: ( خۆزگە منیش وەك ئێوە لەشم بچووك دەبوو ، ئێوە دەتوانن خۆتان بشارنەوە ، من ناتوانم )

کەڵەباب – بە گاجووت –: ( خەمت نەبێ ، هەر کە بۆت هاتن لەسەر دارەکـەوە قووقەیەك دەکەم و تۆش بەو قاچ و سمە زەبەلاحەتەوە خۆت ڕزگار بکە )

کەڵەباب قووقەیەکی تـری کـرد ، داپـیرە لـەو کاتـەدا گـەلامێوی لـە دارمێوەکـە دەکردەوە ، لایەکی بە لای ئەواندا کردەوە و وتـی:( قووقـەی یەکـەمیان نیوەشـەو بوو ، بەم دانەیان ڕۆژ بوویەوە )

قـسەکانی داپـیرە بـە ئاگـای هێنانـەوە و لـە جیهـانی ئاژەڵانـەوە هاتنـەوە نـاو دۆخەکەی جارانیان ، هەموو دایانە قاقای پێکەنین و پاش کەمێکی تر لـە دانیـشتن ، خوا حافیزیان لە " ڕاز " و داپیرە کردە ڕۆیشتن.

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سبەینێ لە قوتابخانە " ڕاز " و برادەرەكانی بە یەكتر گەیشتن و "جوتیار " دواهەمینیان بوو ، هات و وتی: ( سەلام لە برادەرانی تیپی شانۆی ئاژەڵان )

برادەران: ( سەلام )

" ڕاوێژ " ڕووی كردە " جوتیار " و وتی: ( ئەم شەو لە خەونا خۆت لێ نەبوو بە گاجووت ؟)

جوتیار — لەشێوەی شیعردا —: ( گەر جوتیار ببێت بە گاجووت ، بۆ دەنووك دەگۆڕێت سەری لووت ، چونكە تۆش پاساریت ) ، جوتیار بۆ وتنی ئەو چەند وشەیە دانی پیادا دەنا و زۆر بە خاویی گۆی دەكردن...

هەموودەستیان بە پێكەنین كرد...

یوسوف: ( كوڕینە ، من لە دانیشتنەكەی دوێنێمانەوە بیرۆكەیەكم لەلا گەڵاڵە بووە)

ڕاز: ( خوایە خێر بێ )

یوسوف: ( دەڵێن چی ، كورتە شانۆیەك لەسەر زمانی گیانداران بنووسین و وەك چالاكییەكی قوتابخانەكەمان نمایشی بكەین؟)

هەموان: ( زۆرمان پێ باشە )

شاروخ: ( بەڵام كێ بینووسێت؟)

یوسوف: ( من دەینوسم و پاشان ئێوەش چاوی پیادا بخشێننەوە....)

جوتیار: ( هەر ئەو "پێنج" كەسە بین یان كەسی تری بۆ زیاد بكەین؟)

ڕاوێژ: ( بە پێ ی كەسەكانی ناو كورتە شانۆكە )

ڕاز: ( هەر ئەو "پێنج" گیاندارە ڕۆڵ ببینن ؟)

یوسوف: ( ئەویش دیسان بە پێ ی بۆهاتنی كورتە شانۆكەیە )

شاروخ: ( هەرچییەك بێت بیرێكی باشە و خۆشمان لەگەڵ دونیای شانۆدا تاقی دەكەینەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

زەنگی چوونە ژوورەوە لێدرا و هەموو چوونە ناو پۆلەکە و مامۆستای " کیمیا " خۆی کرد بە ژووردا ، ئەو ڕۆژە خشتەی تاقیکردنەوەکانی مانگی دووەمی دوای نیوەی سالّیان پێدرا و لەگەڵ برادەران بڕیاری خوێندن و خۆ ئامادەکردنیان دا.

** ** ** ** ** **

" ڕاز و یوسف و راوێژ " لەناو چیمەنی حەوشەکەی مالّی " ڕاز " دا دانیشتوون و " راوێژ " هەوالّپرسی ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەممەی لە "ڕاز " کرد و وتی: ( تەلەفونم بۆ کردی ، داپیرەت وەلاّمی دایەوە و وتی: ڕۆیشتووە بۆ سەردانی برادەرێکی زۆر خۆشەویستی ، وام دەزانی سەردانی من یان برادەران دەکەیت ، بەلاّم نە دەنگت هەبوو نە ڕەنگ!)

" ڕاز " حەزی گۆشەنشینی لا دروست بوو بوو ، هەندێك جار خۆی لە برادەرەکانی دەدزییەوە و بە تەنها ڕووی لە دەشتە پان و بەرینەکە دەکرد ، ئەو بۆ خۆ قوتارکردن لە هەلّوێستەکە هاتە وەلاّم و وتی: (هەندێ جار بۆ چوونە دەرەوە شتێك بە داپیرە دەلّێم بۆ ئەوەی دلّی لەلام نەبێت ، ئەگینا تەنها چوونە دەرەوەیە و بەس...)

یوسف: ( یان کەسێکی لە ئێمە نازدارترت بینیوەتەوە ، کاکی بولبول؟!)

ڕاز: ( دلّنیابن ئێوە تەنها دەستە هاوڕێیەکن بۆ من و لە ژیانی مندا..)

ڕاوێژ: ( ئەترسم...... !)

ڕاز: ( من ئەو جۆرە کارانە لە ئێوە ناشارمەوە...)

یوسف: ( ئەی ئەو جۆرە کارانە چین پێویستی بە شاردنەوەیە؟)

ڕاز: ( هەر مرۆڤێك بەشێك لە سێبەر لە ژیانیدا هەیە و حەزناکات هیچ کەس پێی ئاگادار بێت.. ئێوەش هەروەکو من وان...)

راوێژ: ( بەلاّم ئێمە بڕیارمان دابوو لەگەڵ یەکتر ڕوون و ئاشکرا و شەفاف بین!)

ڕاز: ( ئێستا کاکە ئەمە دادگایە یان شوێنی کۆبوونەوەی برادەرانە؟!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" یوسوف و ڕاوێژ " کە زانیان " ڕاز " بە چوونە ناو ئەو باس و خواسانە خۆش حاڵ نییە بابەتەکەیان گۆڕی و هاتنە سەرباس کردنی کورتە شانۆکە....

یوسوف ڕووی کردە " ڕاز " و وتی: ( کورتە شانۆیەکی زۆر نایابم ئامادە کردووە ، پێم خۆشە ئەم شەو بیخوێنیتەوە و تێبینی خۆتی لەسەر بنوسی و سبەینێ لەگەڵ خۆت بیهێنیتەوە بۆ قوتابخانە...)

ڕاز: ( زۆر دەستت خۆش بێت ، هەر ئەوڕۆ تەواوی دەکەم و سبەینێ لەگەڵ خۆم دەیهێنمەوە...)

داپیرە بانگی لە " ڕاز " کرد و سێ شەربەتی پرتەقاڵی بە سەر سینییەکەوە بۆ ناردن ، بەدەم شەربەت خواردنەوەوە " ڕاوێژ " وتی: ( سبەینێ داوا لە مامۆستای ئایین دەکەین باسەکەمان بۆ تەواو بکات..)

یوسوف: ( باسەکە چی بوو؟)

ڕاوێژ: ( وەڵامی پرسیارێکی " ڕاز "ە کە لە سەر ئایین و غەریزە شەڕەنگێزەکانی مرۆڤ قسە دەکات...)

ڕاز: ( زۆر چاکە ، بۆخۆم بیری دەخەمەوە)

پاش کەمێکی تر لە دانیشتن " ڕاوێژ و یوسوف " ماڵی " ڕاز " یان بەجێهێڵا و خواحافیزییان لێکرد..." ڕاز " گەڕایەوە ناو جۆلانەکە و بە پەرۆشەوە دەفتەری کورتە شانۆکەی هەڵگرت و دەستی بە خوێندنەوەی کرد...

ناوی کورتە شانۆکە " یاسای جەنگەڵ "

لە لاپەرەی یەکەمیدا شانۆکەی پێشکەش بە: ( تیپی شانۆی ئاژەڵان ) کرد بوو..

لاپەڕەی دوو سپی بوو ، لەلاپەرەی سێ یەم دا پەردەی یەکەم بەم جۆرە دەستی پێکرد بوو:

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

# پەردەی یەكەم

گاجووت پادشای گیانداران لەسەر تەختی پادشایی لێی دانیشتووە و دەستەیەك لە ڕاوێژكارانی دیوان لە خزمەتی خاوەن شكۆدا بە پێوە وەستاون ، ڕاوێژكاران ئەمانەن:

كەروێشك: ڕاوێژكاری ئاسایش ،

كەڵەشێر: ڕاوێژكاری ڕاگەیاندن ،

بولبول: ڕاوێژكاری یاسایی ،

پاساری: ڕاوێژكاری كاروباری دیوانی مەلەكی ،

پادشا " گاجووت " ڕوو دەكاتە ڕاوێژكاری ئاسایش "كەروێشك" و دەڵێ: ( دەربارەی پادشای جەنگەڵستانی باكوور چی دەزانیت؟ هیچ زانیارییەكت بە دەست گەیشتووە؟)

كەروێشك: ( دەڵێن پادشایەكی بەهێزە و كەس ناوێرێ لە فەرمانی دەربچێت..)

گاجووت: ( ئەم هەواڵەت لە كێوە و لە كوێوە بۆ هاتووە؟)

كەروێشك: ( قوربان ، لە " داڵ " ی ڕەعیەتتەوە)

گاجووت: ( ئەو لە كێ ی بیست بوو ؟)

كەروێشك: ( گەورەم ئەو دەتوانێ بە هۆی باڵەكانییەوە بە سەر ڕووبارەكەی نێوان مەملەكەتی ئێمە و ئەوان دا بفڕێ و هەواڵەكانی ئەولامان بۆ بهێنێتەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گـاجووت: ( دەترسـم جاسوسـی " بەینەلمیلـەل " بێـت ! پـێ ی بڵـێ بـە بەردەوامی چاودێری سوپای ئەو پادشایە بکات و نـاوە بـە نـاوە هـەواڵمان پێـڕا بگەیەنێت)

کەروێشك: ( فەرمانت بەجێیە ، قوربان)

گاجووت ڕووی وەرچەرخان بۆلای ڕاوێـژکاری ڕاگەیانـدن و وتـی: (کەڵـەباب ، تاکو ئێستا چیت کردووە و چشتێکت بە ڕەعیەتەکانم ڕاگەیاندووە ؟)

کەڵەشێر: ( پادشام بەرقەرار بێت ، هەموو ڕەعیەتەکانم لە گاجووتی پادشای گەورەمان تێگەیاندووە ، پێم وتوون : بەرلەوەی ببێت بە پادشای ئەم جەنگەڵـە زیـاتر لـە "دە " سـاڵ لەگـەڵ مرۆڤـدا ژیـاوە و لێیانـەوە پەنـد و ئامۆژگـاری و سیاسەتی بەڕێوەبردن فێر بووە...)

گاجووت: ( باسی دەنگ و بۆڕەی منت بۆ کردوون ؟)

کەڵەشێر: ( پادشام پایەدار بێت ، پێم ڕاگەیانـدوون کـاتێ پادشـا دەقـۆڕێنێ لەو سەری مەملەکەتەکەیەوە دەنگی دەبیسترێ..)

گاجووت: ( باسی شاخەکانم ، سەرو کەللەم ، کلك و ناوشانم بۆ ڕەعیەتەکانم بکە)

کەڵەشێر: ( خاوەن شکۆ ، ئێوە لەسەر و مەدح و پیاهەڵدانی ئێمەوەن ؛ مـن زمانێکم نییە گەورەیی ئێوەی پێ مەدح بکەم..)

گاجووت سەیرێکی ڕاوێژکاری یاسایی "بولبول" کرد و پێی وت: (یاسایەك بۆ قەدەغەکردنی زوڵم و ستەم دەربکە ، ڕێوی لە فرت و فێڵ ئاگادار بکەرەوە ، بـە گورگ بڵێ سنوورێك بۆ چاوچنۆکی و ملشکاندنی ئاژەڵان دابنێت ، ئـەو هـەتیوە لار و لـەوێرە مەبەسـتم " کـەمتیارە " ئاسـکی لـەم جەنگەڵـەدا قڕکـردووە ، لەکردەوە نایاساییەکانی ئاگاداری بکەرەوە ، بە بزن بڵـێ لـەوەڕ و گـەلای داری لەم ناوە بڕیوە ، بەهۆی بەڕێوەبردنی ئوموری ڕەعیەتەوە ناتوانم بۆ لەوەڕ دوور بکەومەوە ، پێویستە ئەم دەور و بەرە بکرێت بە پاوەن و لەوەڕگای من..)

بولبول: ( بەڵێ قوربان بەسەر چ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاشان "پادشا " داوای لە کەروێشك و کەڵـەباب و بولبـول کـرد بـچن بـەدەم هەڵسووڕاندنی کارەکانیانەوە و دیوانی پادشایی بەجێ بهێڵن..

هەرسێ بەپەلە چوونە دەرەوە و پادشـا "گـاجووت" و ڕاوێـژکاری کاروبـاری دیوانی مەلەکی بەڕێز " پاساری " دوو بە دوو مانەوە..

" پادشا " داوای لە پاسـاری کـرد لێـی نزیـك ببێتـەوە و گـوێی بـۆ بگرێـت ، ئەویش لە گاجووت نزیـك بوویـەوە ، گـاجووت بـە دەنگێکـی نـزم وتـی: ( بـەڕێز پاساری ، بلێی بتوانین دەست بەسەر ئەم جەنگەڵستانەدا بگرین؟!)

پاساری: ( قوربـان بـۆ ئـەوەی یاسـا بـچەسپێ دەبـێ زەبـر و زەنـگ نیـشان بدەیت)

گاجووت: ( مەبەستت چییە؟!)

پاساری: ( دەبێ ڕەعیەتەکانت لێت بترسن )

گاجووت: ( چی بکەم بۆ ئەوەی لێم بترسن؟)

پاساری ( هەرچییەکمان کردووە دەبـێ قـاتێ جلـی ئـەو " پادشـا " زاڵمـەی جەنگەڵی باکوور پەیدا بکەین )

گاجووت: ( ئەی جل و بەرگی خۆمان چ عەیبێکی هەیە؟!)

پاسـاری: ( ئـەو پادشـایە جـل و بەرگەکـەی زۆر ترسـناکە ، هـەر گیانـدارێك دەیبینێت لەبەردەمی دا چۆك دادەدات)

گاجووت: ( ئەو پادشایە ناوی چی یە؟)

پاساری: ( نـاوی " شـێرە " ، سـەدان ساڵە بـاب و باپیری بـە زۆر و ستەم حوکمی جەنگەڵستان دەکەن )

گاجووت: ( ناوی مەهێنە موچڕکە بـە گیانمـدا دێـت... جـا چـۆن قـاتێ جلـی ئەومان بەردەست بکەوێت؟)

پاساری: ( ئەو ئەرکە بە من بسپێرە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گاجووت: ( ئەوا ئەو كارەم بە تۆ سپارد)

پاساری: ( بە سپاردنی ئەو ئەركە شەرەفێكی گەورەت بە من بەخشیوە)

پاش ماوەیەك بێدەنگی گاجووت هەڵیدایە:( پاساری خۆشەویستم ، داوایەكی بچكۆلەم هەیە)

پاساری: ( ئەمر بفەرموو قوربان )

گاجووت: ( ئەم تەخت و تاجی پادشاییە شاژنێكی پێویستە ، بزانە " نێون مانگایەك"م بۆ پەیدا ناكەیت...)

پاساری: ( قوربان ، جوانترین مانگا لە لەوەڕگاكەی خوارەوە هەیە، دانەیەكت بۆ دەهێنم )

گاجووت: ( ئەگەر " نێون مانگا " بێت پێم باشترە لە مانگا... مانگا فرت و فێڵی زۆرە ، بەڵام نێونەكە هێشتا مێردی نەكردووە و فێری مەكر و حیلە نەبووە)

پاساری: ( قوربان دڵ لە دڵ نەدەی نێونێكی شیكت بۆ دەهێنم )

گاجووت: ( چۆلەكەیەكی مێیەش بۆ تۆ لەسەر خۆم... ئێستا بڕۆ و بزانە گوێدرێژ گیای باشی هێناوە یان نا ؟)

پاساری: ( بەڵێ قوربان هێناویەتی ، سفرەم لە ئاخوڕەكاندا ڕازاندۆتەوە ، بۆ سەر جۆ و كا وئالف با پادشای گەورەمان بفەرموێت..)

گاجووت بۆڕەیەكی بۆ كرد و دیوانی پادشایی بە جێهێلا و بەرەو گەوڕ و ئاخوڕی لەوەڕ بەڕێكەوت..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

# پەردەی دووەم

پاساری گاجووتی بە پادشایەکی لاواز و نەزان تەماشا دەکرد ، دەیزانی رۆژێك پادشای جەنگەڵی باکوور بە خۆی و سوپاکەیەوە دەدات بەسەر مەملەکەتی گاجووتدا و تەخت و تاجی لە بێخ دەردەهێنێت ، بیری کردەوە لەوەی پەیوەندییەکی نهێنی لەگەڵ پادشای جەنگەڵی باکووردا ببەستێ و خۆی لە مەرگ و کوشتنی داهاتوو قوتار بکات ، بۆیە "پاساری"بە نهێنی "قالاو"ی بانگ کرد و پێی وت: ( نامەیەکی سەرزارەکیم هەیە ، بە دەستی پادشای جەنگەڵی باکووری بگەیەنە )

قالاو: ( جەنابی پاساری هەرچی تۆ فەرمان بدەی جێبەجێ دەکرێت)

پاساری: ( بەو پادشایە بڵێ: پاساری راوێژکاری دیوانی مەلەکی یە و دەیەوێ دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ پادشای پادشاکان رابگەیەنێت... پیلانێکم دژ بە گاجووتی – بە ناو پادشا – دارشتووە، تەنها بەرێزتان قاتێك جل و بەرگی خۆتانم بۆ بنێرن و لە ماوەیەکی کەمدا لەسەر تەختی پادشایی لای دەدەم و خۆی و مەملەکەتەکەی پێشکەشی بەرێزتان دەکەم ، ئەم قسانەشمان دەبێ زۆر نهێنی بێت و تەنها لە نێوان من و تۆدا بێت...)

" قالاو" دای لە شەقەی باڵ و فری ، پاساری چوو بۆ لای پادشا و دوای سەر نەوی کردن بۆ گاجووتی زەبەلاح ، رۆیشتە نزیکییەوە و پێی وت: ( بۆ هێنانی قاتێ لە جل و بەرگی پادشای سامناك قالاوم ناردووە)

گاجووت: ( ئەی بۆ هێنانی شاژن مەبەستم " گاژنە " هیچت کردووە؟)

پاساری: ( ئەویش بەرێوەیە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گاجووت: ( خۆزگە بەر لە هاتنی " گاژن " قاتە جلە سامناکەکەم بەدەست دەگەیشت)

پاساری: ( قوربان ، تۆ ئێستاش سامناکی و کەس ناوێرێ سەیری دەم و چاوت بکات )

گاجووت: ( هەڵبژاردنی تۆ بە ڕاوێژکاری دیوانی مەلەکی ئەقڵ و کەماڵی من نیشان دەدات)

پاساری: ( بەڵێ قوربان ، بەڵی ، هەمیشە لە سێبەری پادشای مەزندا دەبێت کەسی گەورە بوونی هەبێت)

لەو قسانەدا بوون " قالاو" تەقەی لە دەرگا دا و پاساری ڕۆیشت بە دەمیەوە و قاتەکەی لێوەرگرت و هێنای بۆ گاجووت ، گاجووت بەرگی شێرەکەی بە بەر خۆی دا کرد و ڕووی کردە پاساری و وتی: ( ئێستا شان و شکۆم چۆن دەکەوێتە پێش چاوت ؟)

پاساری: ( قوربان ، چەندە بە هەیبەت بووی دە ئەوەندەت بۆ زیاد بووە)

لەو قسانەدا بوون ، کەروێشك و کەڵەشێر و بولبول خۆیان کرد بە ژووردا و بۆ پادشای مەزن سەری خۆیان نەوی کرد و پیرۆزبایی ئەو پۆشاکە تازەیان لێ کرد...

" پاساری " مۆڵەتی لە پادشا وەرگرت و ڕۆیشتە دەرەوە و "قالاو"ی بانگ کرد و پێ ی وت: بڕۆ بە ئاژەلان بڵێ ، لە بنەماڵەی "گا" دا پادشا هەڵنەکەوتووە ، بۆیە گاجووت بەرگی شێری لەبەر خۆی کردووە ، ئەو دەزانێ تەنها لە بنەماڵەی شێران دا پادشا پەیدا دەبێت، ئەگەر پادشا "گاجووت" هاتە ناوتان داوای لێ بکەن پێستی شێرەکە فڕێبدا و وەکو گاجووت هەڵس و کەوت بکات..) پاشان وتی: ( دەبێ بڕۆی بە پادشای جەنگەڵی باکوور بڵێ ی بە خۆی و سوپاکەیەوە ئامادە بێت و بەرەو باشوور بۆ داگیر کردنی مەملەکەتی " گا " بکەونە ڕێ...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاساری هاتەوە بۆ لای پادشا و پێی وت: ( قوربان ، ڕەعیەتەکانت خراپیان بەسەرهاتووە)

گاجووت: ( چی قەوماوە؟)

پاساری: ( گیانداران دەڵێن : گومانمان لە پادشایی گاجووت هەیە ، سبەینێ لە کۆنگرەی ساڵانەماندا ئەگەر داوایان کرد ئەو جلە سامناکە لەبەر داکەنیت بە گوێیان نەکەیت ، چونکە مەبەست لە داواکەی ئەوان دابەزینی تۆیە لە تەختی پادشایی )

گاجووت کەوتە بۆڕە و سمکۆڵان ، ڕاوێژکاران تکایان لێ کرد ئارام بێ و ئەوەندە سەرنەکوتێ بە دیوارەکەدا ، گاجووت وتی: (سبەینێ دەزانم چی بەسەر ئەو تاوانبارانەدا دەهێنم ، بە دژی من پیلان دەگێڕن؟! دان نانێن بە دەسەڵاتی پادشایی مندا؟ لەگەڵ پادشای باکوور ڕێکەتوون و خیانەت بە تەخت و تاجی پادشایی من دەکەن؟ من دەزانم هەموو گیانداران خۆشەویستی و ملکەچی بۆ من نیشان دەدەن ، ئەوانە تەنها تاقمێکی سەرلێشێواون و خۆیان خزاندۆتە ناو ڕیزی گیاندارانەوە، ئەو کارە دەستی ڕێوی تێدا هەیە و سبەینێ بە تۆمەتی خیانەت لە سێدارەی دەدەم ) پاشان کەوتە بۆڕە و سمکۆڵان و سەر کێشان بە دیواردا...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

# پەردەی سێیەم

هەموو گیانداران کۆبوونەتەوە و گاجووت وتاریان بۆ دەدات: ( من و باب و باپیرم خزمەتکاری مرۆڤ بووین و لەوانەوە هەموو ئەقڵ و زیرەکییەك فێر بووین ، ئێمە شایستەی تەختی پادشایین و هیچ کەس لە ئێوە نابێت گومانتان لە لێوەشاوەیی ئێمە هەبێت ، من بۆخۆم "دە" ساڵ مرۆڤ جووتی پێکردووم ، خەباتم هەیە و تێکۆشاوم )

جەماوەری گیانداران: ( ئەگەر خۆتان بە شایستە دەزانن و گاجووت پادشای ڕاستەقینە و خاوەن دادە بۆچی پۆشاکی زاڵمانی لەبەر کردووە؟! ئەو جل و بەرگە فڕێ بدە و وەك گاجووتی ئاسایی فەرمانڕەوامان بە)

گاجووت نەڕاندی و کەوتە بۆڕە و هاوار ، پاساری ڕووی کردە جەماوەر و وتی: ( ئەگەر ئێوە گومانتان لە پادشای مەزنمان هەیە دەتوانن داوای لێ بکەن لەگەڵ پادشای جەنگەڵی باکوور دا زۆرانێك بگرێ ، تاکو بزانین کامیان ئازایە و شایستەی ئەوەیە پێ ی بوترێت پادشا...)

جەماوەر "ئاژەڵان": ( با بجەنگێ ، با بجەنگێ...)

لە پڕ " قالاو" هات و وتی: ( پادشای جەنگەڵی باکوور بە سوپایەکی گەورەوە بەڕێوەیە و هەڕەشە لە پادشای مەزنمان دەکات )

کە گیانداران ئەو قسەیان بیست هەموو هەڵهاتن و دەوری گاجووتیان چۆڵ کرد... گاجووت گەڕایەوە بۆ سەر تەختی پادشایی و بە ڕاوێژکارانی وت: ( چی بکەین؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

كەروێشك: ( من دەڵێم بەر لە هاتنی ئەو پادشا زاڵمە لێرە هەڵبێین و خۆمان بشارینەوە )

كەڵەشێر: ( هەڵهاتن ترسنۆكی یە ، با لە پێناوی ولاتی خۆماندا بجەنگیین...)

بولبول: ( لە ڕاستی دا بە پێ ی دەستوری جەنگەڵ گاجووت و پادشایەتیان نەوتبوو ، هەڵەیەك بوو هەموومان تێیكەوتین...)

پاساری: ( من دەڵێم: پادشای مەزنمان بڕوات بۆ لای ئەو پادشا زاڵمە و داوای لێبوردنی لێ بكات ، جا یان دەی بەخشێ یان دەیخنكێنێ...)

گاجووت: ( هەمووی خەتای ئێوە بوو ، بە " پادشا ، پادشا " شوێنم كەوتن ، من و باب و باپیرم بە درێژایی تەمەنمان گاجووت بووین، جگە لە ئێرەق و هەوجاڕ شتێكی ترمان بەچاو نەبینی بوو ، كەچی بە قسەی لووس منتان فریو دا و خۆمم لێ گۆڕا...)

پاساری: ( ئێستاش هیچ نەبووە ، جلی پادشایی دابكەنە و لە پەنایەكەوە خۆت بخەرەوە ناو گاگەلی گوندەكە ، ئەوپەڕی بۆ ئەو چەند ڕۆژەی ون بوونت جوتیارەكە چەند دارێك لە سەرو گوێتدا دەكێشێ)

كەڵەشێر: ( ئەی من چی بكەم ؟)

پاساری: ( تۆش هەتا مام ڕێوی نەیزانیوە بە دوو سێ فڕە خۆت بكەرەوە بە گوندەكەدا )

لە ناكاو " قالاو" خۆی كرد بە ژووردا و وتی: ( پادشای ڕاستەقینە بە خۆی و سوپاكەیەوە گەیشتە بەرەوە)

گاجووت و ڕاوێژكارانی هەریەك بە لایەكدا هەڵهات و خۆیان شاردەوە...

پاساری چوو بۆ پێشوازی شێر و سوپاكەی ، شێر وتی: كەسی ناپاكم خۆش ناوێت ، پاساری ببەن و لە گەردنی بدەن...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" مام ڕێوی " داوای لە پادشا کرد شەرەفی لە سێدارەدانی پاساری بەو بسپێرن ، " شێر " یش بە ڕێوی وت: چلێسی ساختەچی ئەگەر پاساری گۆشتی نەدەخورا بە دوای شەرەف و شکۆمەندیدا نەدەگەڕایت، برۆ لە پەنایەکەوە بیکە بە قەپێ و مەرگەمووشی بکە...

پەردە دادرایەوە و شانۆکە کۆتایی هات...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٤ -

# سەردانی خاڵی بۆ لای " ڕاز "

ئێوارەی شەوی هەینی خاڵی " ڕاز " و هاوسەرەکەی و هەردوو منداڵەکەی سەردانی " ڕاز " یان کرد ، هاوسەرەکەی مامۆستا "ئەحمەد " واتە " سێبەر خان " فەرمانبەری دائیرەی تاپۆ بوو ، دوو منداڵەکەشیان " لاڤە " پۆلی چوارەمی ناوەندی بوو ، لە خوێندن و وانەکانیدا تا ڕادەیەك باش بوو...

" لاڤە " لە زمانی " عەرەبی و ئینگلیزی " دا پێویستی بە خۆ بە هێزکردن هەبوو ، بۆ زمانی ئینگلیزی " ڕاز " یارمەتی دەدا و باوکیشی هەفتەی چەند شەوێك زمانی عەرەبی پێ دەخوێند...

" لاڤە " سیمای ئارامی و بێ دەنگی پێوە دیار بوو ، کچێکی تا ڕادەیەك شەرمن بوو ، بەلاّم کە پرسیاری لێ دەکرا زۆر بوێرانە وەلاّمی دەدایەوە و هەمیشە وەلاّمەکانیشی بە ئەندازەی پرسیارەکە بوو..

برا بچووکەکەی ناوی " ئالان "بوو ، پۆلی سێیەمی سەرەتایی بوو ، لە وانەکانی دا زۆر زیرەك بوو ، هەموو جارێ خاڵی "ڕاز" ( مامۆستا ئەحمەد) لەگەڵ "سێبەر خان" ی هاوسەری دەکەوتە شۆخی کردن و دەیوت: "ئالان" لە من دەچێ و " لاڤە " ش لە دایکی ، ئەو دەیویست بە دایکی "لاڤە" بڵێ : من لە تۆ زیرەکترم...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سێبەرخانیش دەیوت: ( "لاڤە" گیان بەژن و بالاّ و شەرم و جوانییەکەی لە دایکی دەچێت) .

لە چوارشەممەوە داپیرە بە "ڕاز" ی وت بوو : تەلەفون بۆ خاڵت بکە ئێوارەی شەوی هەینی با میوانی ئێمە بن...

داپیرە جوانترین خوانی ئامادە کرد بوو: بوریانی بە سینگی مریشك و گۆشتی برژاوی بەرخ بە فڕنە کارەبایی یەکە و شلەی لۆبیای سەوز و تەپسی و سوپی خەست و زەلاّتەیەکی مزر کە بە دەستی "ڕاز" ئامادە کرا بوو ، لیمۆ و خەیار بە قاشکراوی و سەوزە و پیازی تەڕ و زەیتوونی زەرد و ترشیات بە ئاوی میوە کە "پوورە فاتم" بۆ خۆی دروستی دەکرد...

"پوورە فاتم" خواردنەکانی ئامادە کرد و"سێبەرخان و لاڤە" ش سفرەکەیان پێ ڕازاندەوە...

سفرەی "پوورە فاتم" سفرەیەکی سادە و ئاسایی نەبوو ، ئەو هەموو شتەکانی نایاب و دەگمەن بوون ، بۆ خۆی داپیرە ئافرەتێکی فرە دەگمەن بوو ، تەمەنی لە شەست ساڵان تێپەڕی کرد بوو ، بەلاّم لەو تەمەنەشدا جوانی و پێکەوتوی و زیندوویێتی پێست و دەم و چاوی پاراست بوو ، زمانێکی کوردی پاراو ، جل و بەرگی کوردی بە قوماشی تایبەت و گران بەها...

ئەو هەمیشە حەزی لە نوێبوونەوە بوو ، ساڵێ جارێك یان دووجار پیاداچوونەوەی بە هەموو شتەکانی ناو ماڵدا – بە تایبەت چێشتخانەکە– دەکرد و شتە کۆنەکانی بە باخەوانەکە دەبردە مەخزەنەکەی پشتەوە و بە باشترین شێوە قوماشی تێ دەگرتن و دەیپاراستن ، ئەو مەخزەنە نەختینەیەکی گەورە بوو کە شتومەك و کەل و پەلە جوان و خۆشەویستەکانی داپیرەی تیادا پارێزراو بوو...

مامۆستا "ئەحمەد" بە سروشتی خۆی هەموو جارێ لەسەر سفرە دەکەوتە قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە ، ڕووی کردە "سێبەر خان" و وتی: ( ڕۆژێ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خۆت و دەستە خوشکەکانت وەرن بۆ لای پوورە فاتم بۆ ئەوەی خولێکی فێر بوونی چێشتلێنانتان بۆ بکاتەوە...

سێبەر خان: ( پوورە فاتم لە جێگەی دایکم دامناوە ، نەك تەنها چێشت لێنان ، بەڵکو زۆر شتی جوانی لێوە فێر دەبم )

پوورە فاتم: ( مامۆستا ئەحمەد ، سێبەر خان کچی خۆمە و ئافرەتێکی ژیر و بە سەلیقەیە...)

ڕاز: ( داپیرەم هەموو جارێ مەدحی خاڵۆژنم دەکات ، ئەگەر توانای ڕێکخستنی شتێکی نەبێت دەڵێ : "سێبەر" گیانی بۆ بانگ دەکەم...)

مامۆستا ئەحمەد: ( کاکە من تەسلیم ، ئێوە زۆر و ئەمن تەنها)

سێبەرخان: ( تەنها ئاڵای سپی هەڵکردن بەس نی یە ، بەڵکو دەبێ بدرێیت بە دادگا و قەرەبووی زیانەکانت پێ بکەمەوە...)

مامۆستا ئەحمەد: ( "لاڤە و ئالان" پشتیوانی لە بابیان دەکەن )

لاڤە: ( من پشتیوانی کەسێکم لەسەر حەق بێت...)

مامۆستا ئەحمەد: ( ئەویش کچی دایکییەتی ) ڕووی کردە "ئالان" و وتی ( ئالان گیان ، کوڕم خۆ دەبینی چۆن بە تەنها لە مەیدانەکەدا ماومەتەوە ، یارمەتییەکی بابت بدە...)

ئالان: ( من هەردووکتانم خۆش دەوێ )

مامۆستا ئەحمەد: ( لە پێنج کەس تەنها نیو نەفەرم بەدەستەوە ماوە...)

ئالان: ( بابە ، نیو نەفەر یانی دوو کەباب؟!)

قسە خۆشەکەی " ئالان " هەموویانی هێنا پێکەنین و پوورە فاتم وتی: ( ئاخر زەمانە ! منداڵی ئێستا زیاتر لە گەورەکان لە قسان دەگەن و وردی دەکەنەوە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاشان پووره فاتم پارچەیە گۆشتی ناسکی برژاوی خستە بەردەم سێبەر خان و وتی: ( بۆ ئەوەی ئاشتببنەوە تۆش ئەو پارچەیەی خۆت بکە بە پارووپەك و بیدە دەستی مامۆستا ئەحمەد )

سێبەر خان: ( ناتوانم لە داوای دایکم دەربچم ، ئەم پاروە لە دەستم بگرە..)

مامۆستا ئەحمەد: ( بەقوربانت بم "پووره فاتم"، ڕزگارت کردم ، لە ئێستاوە خەمی مەحکەمەکە داگیری کرد بووم...)

"ڕاز" قاپە زەلاتەکەی - کە بە دەستی خۆی دروستی کرد بوو - لە " لاقە " نزیك کردەوە و بوتڵە ساردییەکەشی هەڵگرت و هەموو پەرداخەکانی پڕ کرد....

"پووره فاتم " هەستایە سەرپێ و دوو پارچە گۆشتی برژاوی تری لە فڕنەکە دەرهێنا و پارچەیەکی دا بە " لاقە " و پارچەیەکیش بە "ڕاز " و وتی: ( ئەم دوو پارچەیە گەرمە)

مامۆستا "ئەحمەد" یش لە بەلەمی بریانییەکە هەندێ پلی سنگە مریشکی کۆ کردەوە و خستی یە سەر قاپە بریانییەکەی بەردەم "ئالان".

"ئالان" لە هەموو گۆشتەکاندا ماسی و سنگی مریشکی دەخوارد ، زۆرتر لە منداڵێکی ڕووەکی دەچوو ، هەموو خواردنێکی پێ نەدەخورا...

مامۆستا ئەحمەد: ( یاخوا "پووره فاتم " دەست و چاوت خۆش بێ و هەتا ئێمە دەمێنین ئەتۆش بۆمان بمێنی ، بە ڕاستی خواردنێکی تا بڵێی بە تام و بەلەزەت بوو...)

پووره فاتم: ( مامۆستا " ئەحمەد " زۆر کەمت خوارد ، ئەو کاتە بەعومر دەزانم تۆ و "سێبەر خان " و منداڵەکان لێرە بن ، خۆزگە ماڵتان نزیکمان بوایە و هەموو ئێوارەیەك ئاوا بەخۆشی پێکەوە دابنیشتینایە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سێبەر خان: ( دایە " فاتم" تۆ خەریکی " چا " یەکە بە و من و "لاڤە " ش سفرە و قاپەکان کۆ دەکەینەوە و دەیانشۆین...)

راز: ( من سفرە و قاپەکان کۆ دەکەمەوە و شۆرینی لە سەر ئێوە ، خالّم و "ئالان"یش دەچن بۆ هۆڵەکە و تەلەفزیۆنەکە پێ دەکەن و چاوەڕێی ئێمە دەبن...)

"پوورە فاتم " سەماوەر و پیالّە و قۆریە شوشەکەی برد بۆ هۆڵەکە و لە شوێنە تایبەتەکەیدا کە بەردەم کوورەی دیوارەکە بوو ڕێکی کرد و پاش کەمێك هەموو لە هۆڵەکە بۆ " چا " خواردنەوە و سەیرکردنی تەلەفزیۆن کۆ بوونەوە...

چالێنان لای "پوورە فاتم " مەراسیمێکی تایبەتی هەبوو ، سەرەتا سەماوەرەکەی لە ئاوی بیرە ئیرتیوازییەکە پڕ دەکرد ، ئەو ئاوی تەنکییەکانی سەربانی بۆ چالێنان بەکار نەدەهێنا ، پاشان لێ دەگەڕا تا ئاوی سەماوەرەکە بە جوانی دەکولا ، ئەوجا باشترین چای پاکەتی دەهێنا — کە لە تێکەڵکردنی چەند چایەك پێکی هێنا بوو — دەی کردە ناو قۆریەکە و دەنکێك هێل و پارچەیە دارچینی هەڵدەدایە ناوی و لە ئاوی کولاوی سەماوەرەکە قۆریەکەی پڕ دەکرد ، هەندێك گڕی سەماوەرەکەی کز دەکرد ئەوجا قۆریەکەی لەسەر دادەنا ، یەك دوو جارێ سەری قۆریەکەی لا دەدا و سەیرێکی چاکەی دەکرد ، ئەو نەی دەهێلا " چا " بێتە کولان و چەپۆکان ، هەر ئەوەندە چاکە دەکەوتە مێرولەکردن و سەر ئاوەکە دەکەوت دای دەگرت و هەندێ ئاوی گەرمی سەماوەرەکەی بە سەریدا دەکرد و کەمێك دای دەنا ، تا جارێکی تر تلّپی چایەکە ژێر ئاو بکەوێتەوە ، ئەوجا بە دەستە سپی یە جوانەکانی کە هەمیشە لە مەچەکی دا بە فەقیانەی جلە کوردییەکانی بەست بووی چاکەی دەچۆڕاندە پیالە زەڕلی و ژێرپیالّە شین و چاو پانەکان کە تەمەنی هەندێك لەو پیالّە و ژێرپیالانە بۆ " دە سالّ و پازدە سالّ " دەچوو ، نیوەی پیالەکە چای تێ دەکرد و نیوەکەی تری ئاوی گەرمی سەماوەرەکەی بەسەردا بەردەدایەوە...

چای "پوورە فاتم " لە دوورەوە بۆنی خۆشی هەست پێ دەکرا و هەندە بە جوانی و شیرینی و خان و مان لە ساڵ سەماوەرەکەدا دادەنیشت ئەگەر

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نیگارکێشێك بیتوانیبایە مانا قووڵەکانی ئەو فەزایەی بکێشابایە تابلۆیەکی گرانبەهای جیهانی لێ دەردەچوو ، بە داخەوە مانا قووڵ و مەزنەکانی ناخ و ژیانی مرۆڤ لەم ولاتەی ئێمەدا پەی پێ نابرێ و نیگارکێشێك نی یە جوانییەکانمان بۆ بە نیگار بکات ، شاعیرێك نییە هەستە قووڵەکان لە ناو وشەدا جێ بکاتەوە ، رۆماننووسێك نەهات دەستمان بگرێت و بە سەرچاوەی مانای بەرز و بڵند ئاشنامان بکات...

"پوورە فاتم" ریزێك چای تێ کرد و تەنها چاکەی خۆی و مامۆستا "ئەحمەد " چای دیشلەمە بوو...ئەو شەکردانی داری بۆ شەکر شکاندن بەکار دەهێنا ، پەرۆیەکی سپی و پانی لە بەردەمی خۆی دادەخست و شەکردانە دارەکەی لەسەر دادەنا و بە شەکرشکێنە دەم تیژەکە دەکەوتە شکاندنی پارچە گەورەکانی کەللە شەکرە ئێرانییەکان ، پاشان دوو- سێ سوراحی شووشەی لێ پڕ دەکرد و بۆ کاتی پێویست ئامادەی دەکرد...

مامۆستا " ئەحمەد " هەموو جارێ دەیوت: "پوورە فاتم " گیان لەپاڵ سەماوەرەکەدا دابنیشە و قۆریەکە بخە سەر سەماوەرەکە و دەست بکە بە شەکر شکاندن بۆ ئەوەی چەندین وێنەی فۆتۆگرافیت بگرم..."

ئەو چەندین وێنەی فۆتۆگرافی پوورە " فاتم " ی لەپاڵ سەماوەرەکەدا گرت بوو، یەکێك لەو وێنانەی گەورە کرد و لە ماڵی خۆیان هەڵیواسی...

"پوورە فاتم " خۆشی لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن دەهات ، مامۆستا "ئەحمەد و ڕاز" پاش "چا" خواردنەوە و گرتنی چەند هەواڵێکی جیهانی بۆ پیاسەکردن بە ناو باخەکە و دانیشتن لە چیمەنەکەدا چوونە دەرەوە ، "پوورە فاتم و سێبەر خان و لاڤە و ئالان " یان لە هۆڵەکەدا بەجێ هێلا...

باسی ئەم جارەی مامۆستا " ئەحمەد " لەگەڵ " ڕاز " دەربارەی هاوڕێیەتی و برادەرگرتن بوو ، مامۆستا ئەحمەد پێ ی وابوو مرۆڤ ناتوانێ بێ دۆست و برادەر ژیان بەسەر ببات ، بەلام گرتنی برادەریش کارێکی ئاسان نی یە ، ئەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پرسیاری لە " ڕاز " کرد: ( لە قوتابخانە دۆست و برادەری نزیکت هەیە یان نا ؟)

ڕاز: ( چەند برادەرێکی کەم )

مامۆستا ئەحمەد: ( برادەر جۆرا و جۆرە ، هەیانە لەسەر فیکرەیەك دەبنە برادەر ، هەیانە لەسەر یاری و هیوایەت کۆ دەبنەوە ، هەشیانە گروپ و کۆمەڵە کۆیان دەکاتەوە ، بەم جۆرە دەیان شێوەی برادەرایەتی هەیە ، نازانم برادەرانی تۆ کام لەم جۆرانەیە ؟)

ڕاز: ( لە ڕاستی دا هاوپۆلی و خوێندنی قوتابخانە ئێمەی بە یەکتر ناساندووە )

مامۆستا ئەحمەد: ( بەلاّم بۆ لەو گشت قوتابی یە هاوپۆلانە تەنها چەند دانەیەکیان دیاری دەکەیت و دەبنە برادەرت ؟ بۆ تەنها ئەوانە؟ بۆ کەسانیتر نە ؟)

ڕاز: ( هەندێ جار مرۆڤ سەرنجی کەسێك دەدات - بەبێ ئەوەی ناویشی بزانێت - خۆشی دەوێت ، هەشە یەکەمین جارە دەیبینی ، بەلاّم وا هەست دەکەیت کەسێکە لە تۆوە نزیك نی یە و بە تۆ ناخوات کە لەوانەیە واش نەبێت ، ئەو چەند کەسەم بەم جۆرە هەڵبژاردووە ، هەستم کردووە کەسانێکن دەتوانین قسە بە یەکەوە بکەین و لە یەکتر بگەین ، ئەو لە من و منیش لە ئەو نزیك بووینەتەوە ، بەبێ ئەوەی بیر لە فیکرە و خانەوادە و حەز و هیوایەتی یەکتری بکەینەوە...)

مامۆستا ئەحمەد: ( خۆشت دەوێن ؟)

ڕاز: ( هەریەکەیان لە لای من چێژ و تامێکی هەیە ، خواردنی سێو میوەی پرتەقاڵ لە مرۆڤ هەڵ ناخات ، هەریەکەیان سوودێك دەبەخشێت ، لای من برادەر بە نەست و ڕۆح دیاری دەکرێ و دەبێتە دۆستی گیانی بە گیانی ، دۆستایەتی لەسەر بنچینەی فیکر و شتی تری لەو جۆرە زۆر باوەڕم پێ ی نی یە ، چونکە هەر کاتێك بیر و بۆچوون گۆڕا ئەوکات دۆستایەتی بۆ دوژمنایەتی دەگۆڕێ...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا ئەحمەد: ( خۆشحاڵم كە دەبینم بەو جۆرە بیر دەكەیتەوە و بەو شێوازە برادەر هەڵدەبژێریت ، بەڵام دیسان دەبێ مرۆڤ برادەرەكانی خۆی بناسێ و تاقیان بكاتەوە...)

ڕاز: ( خاڵە گیان ، هەر مرۆڤێك كۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی هەیە ، من نابێ داوا لە برادەرەكانم بكەم وەكو من وابن ، ئەوەندە بەسە بە بینینی یەكتر خۆشحاڵین و ناشمانەوێ درۆ لەگەڵ یەكتردا بكەین...)

مامۆستا ئەحمەد: ( بە چیدا دڵنیایی لەوەی ئەوان نایانەوێت تۆ بەكار بهێنن و زیانێكت پێ بگەیەنن ؟)

ڕاز: ( لە چیدا بەكارم بهێنن ؟)

مامۆستا ئەحمەد: ( چوزانم ، لەو هەموو بەزم و گۆبەندانەی لە ئەوڕۆدا ژیانیان لە خەڵك هەراسان كردووە..)

ڕاز: ( تاكو ئەوڕۆ نیوەڕۆ كە لە یەكتر جیابووینەوە قسەیەكم لە یەكێكیان نەبیستووە زەرەر و زیانم پێ بگەیەنێت ، ئێ مرۆڤیش ئەقڵی هەیە ، دەتوانێ خۆی لە هەر شتێك لابدا كە خۆش بەختی نەكات... باشە خاڵە ، بڵێ ی ئەوانیش خاڵ و كاك و مامیان لە دۆستایەتی من ئاگاداریان بكەنەوە و پێیان بڵێن: وریابن برادەرەكانتان فریوتان نەدەن؟! بە ڕاستی گەر وابێت دونیایەكی ئاڵۆز و پڕ لە گومانە !)

مامۆستا ئەحمەد: ( من داوا لە تۆ ناكەم بەرانبەر برادەرەكانت بێ متمانە بیت ، بەڵكو دەڵێم بە متمانەوە برادەر دیاری بكە ، ئەوان چەندە دڵنیان لە تۆ تۆش ئەوەندە دڵنیا بیت ، تۆ چۆن بە بینینیان خۆش حاڵیت گەرەكە ئەوانیش وەكو تۆ وابن...)

ڕاز: ( من لە خۆم دڵنیام و خۆشحاڵم ، ئەگەر برادەرەكەم وانی یە گرفتی خۆیەتی ، ئەو دەتوانێ یان خۆی وەكو من لێ بكات و بەختەوەر بێت یان برادەریم نەكات ، ئێمە بە زۆر نەكراوین بە برادەری یەكتری ، بەڵكو بە حەز و ویستی خۆمان بووە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا ئەحمەد: ( مادام تۆ ئەم هەموو وەڵامە دروست و وردەت لە لایە ، هیچ خەمێکم نییە و لە من باشتر دەتوانی دۆست و برادەر بۆ خۆت هەڵبژێریت...)

ڕاز: ( خاڵە گیان لە بەڕێزت و مامۆستا دڵسۆزەکانی ترەوە فێری بیرکردنەوەی دروست و ڕەفتاری شیاو بووم ، ئێوە مامۆستا و گەورەی ئێمەن و ئازایی نی یە ئەگەر ئێمە شتێکی باشتر لەوەی ئێوە بە ئێمەی دەڵێن پەی پێ ببەین ، چونکە تەجروبەی ئێوەمان لە بەردەمدایە و هەوڵی خۆشمان دەخەینە گەڕ...)

مامۆستا ئەحمەد: ( ئەم قسەشت لەوانەی وترا جوانتر و بەپێز تر بوو...)

ڕاز: ( سوپاسی گەورەییت دەکەم...)

مامۆستا ئەحمەد: ( با بچینەوە بۆ لای پوورە " فاتم " و منداڵەکان...)

هەردووکیان چوونە ژوورەوە...

پوورە فاتم وتی: ( دوو چای گەرمتان بۆ تێ دەکەم )

سێبەر خان وتی: ( "ڕازە " گیان هەندێ وانەی ئینگلیزی بە "لاڤە" بلێرەوە)

تۆزێك دوور لە ئەوان " ڕاز و لاڤە " دوو کورسی و مێزێکیان دانا و کەوتنە خوێندنی زمانی ئینگلیزی...

مامۆستا ئەحمەد ڕووی کردە پوورە فاتم و وتی: ( شوکر بۆ خودا کاکە " ڕاز " ئەقڵ و تەجروبەی پیاوێکی تەمەن چل ساڵەی لەلایە و زۆر دڵخۆشم کە گوێ لە قسە و بۆچوونەکانی دەگرم..)

پوورە فاتم: (مامۆستا "ئەحمەد" گیان ، زۆرم پێ خۆشە هەموو جارێ قسەی بۆ دەکەیت و لەگەڵی دادەنیشیت...)

سێبەر خان: ( "ڕاز " نموونەی گەنجێکی ڕۆشنبیر و بەڕەوشتە ، خۆزگە " ئالان "یش وەکو " ڕاز " دەردەچ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو شەوە یەکێك بوو لە شەوە خۆشەکانی تەمەنی ڕاز ، هەموو شتێك لەو شەوەدا سپی بوو ، ڕووخساری داپیرە ، قسە خۆش و بەتامەکانی خاڵە ئەحمەد ، پێکەنینە ناسك و لەسەرخۆکانی سێبەر خان ، شەرم و سەرنجی " لاڤە "، بەرائەت و ڕۆح سووکی ئالان هەر هەموو تارایەکی سپی بەسەردا درا بوو...

ڕەنگی سپی لای " ڕاز " سروور و ئاسودەیی دەگەیاند ، ئەو هەر کاتێك خەم و پەژارە دەرگای دڵی بگرتبایە ، ڕەنگی ڕەش وەکو قەتران بەسەر هەموو شتەکانی دەوروبەریدا دادەچۆڕا ، لەگەڵ ڕەوینەوەی تەم و مژ و لێڵی حوزن و خەفەت خۆری سپی لە ئاسۆی شتەکان هەڵ دەهات و دونیا ڕووناك دەبوویەوە...

سپێتی لای ئەو مانایەکی قووڵتر لە سادەیی دەگرتە ئامێز ، سپێتی ئاوێزان بوونی سێ ڕەنگی سەرەکی یە لەگەڵ یەکتردا ، نوغرۆ بوونی هەموو ڕەنگەکانە لە یەك ڕەنگ دا..

سپی ڕەنگی فەیلەسوفەکانە، چونکە ئەوان قووڵتر و گشتگیرتر لە هەموان سەرنجی "ژیان و بوون" دەدەن ، ڕەنگی سپی مانای دەست لە ملان بوونی عاشقانە ، شکاندنی تامەزرۆیی و تینوێتی ڕۆحی یە ، باڵە تەپێ ی گیانە لە دەریای سروردا ، چەند دڵۆپە فرمێسکێکی شادومانییە لە دوای زەمەنێك چاوەڕوانی ، ڕەنگی سپی لێوان لێو بوونی ناوەوەی مرۆڤە بە ئارامی و دڵنیایی ، ڕەوینەوەی وەحشەت و غوربەتە ، ڕەنگی سپی هێمای بەرائەتی ژیانە ، چونکە ژیان لەناو ڕەنگی سپیدا هەموو شتە شاراوەکانی خۆیمان بۆ دەخاتە ڕوو ، جووڵە و بزوان ، هەوڵ و تێکۆشان ، شکاندنی قاوغی سڕ بوون و مت بوون ، هەموو لە ژێر دەسەڵاتی ڕەنگی سپیدایە....

لاپەڕەی ئەو شەوە ، وەکو زەمەن پێچرایەوە ، بەڵام یادگاری یە جوانەکانی ، لێشاوی خۆشییەکانی لە خەیاڵ و زەینی هەمواندا نەقش بوو بوو ، ئەو شەوە ڕووبارێکی زیندوو بوو لە سەرچاوەوە تا دەریالووش درێژ دەبوویەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

— ٥ —

## داستانی " ئادۆ "

بەیانی ڕۆژی هەینی مامۆستا " ئەحمەد " و منداڵەکانی خواحافیزیان کرد و بۆ ماڵی خۆیان گەڕانەوە... پوورە " فاتم " خاڵە مەولودی باخەوانی بانگ کرد و داوای لێ کرد ، چەند مەترێك زەوی بۆ ئامادە بکا و هەندێك تۆوی کەرەوس و پیازی پیا بوەشێنێت....

" ڕاز " بڕیاری دا سەردانێکی "کێوی نەمران" ( ئەو چیایەی سەیرانەکەیان لەسەر کرد) بکات و چاوێکی بە پیرەمێردەکە بکەوێتەوە....

"کێوی نەمران" مەزارگەی چەندین مرۆڤی قارەمان بوو – کە لە شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکاندا – لە سەر ئەو چیایە لەگەڵ دوژمنان دەستە و یەخە بوو بوون و گیانی خۆیان بۆ سەروەری خاك و خەڵك فیدا کرد بوو ، بۆیە خەڵکی ناوچەکە بە " کێوی نەمران" ناویان دەبرد..

" ڕاز " نەیدەوێرا بە داپیرە بڵێ دەیەوێ سەردانی ئەو جێگەیە بکات ، مۆڵەتی چوونە دەرەوەی لێ خواست و پێ ی وت: " ئەگەر نیوەڕۆ نەهاتمەوە لای برادەرێکی زۆر خۆشەویستم... "

داپیرە داوای لێ کرد ئاگای لە خۆی بێت و لە گەڕانەوە درەنگ نەکەوێت...

" ڕاز " چوو بۆ گەراجی پاسی گوندە دوورەکان و بەرەو باکووری شار بە ڕێکەوت ، کە لە چیایەکە نزیك بووەوە داوای دابەزینی کرد و شۆفێرەکە پرسی:

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

( برادەر ، بۆ کوێ دەچی وا لێرە دادەبەزی ، غەریب دەکەویتە پێش چاوان ؟! )

ڕاز: ( دەچم بۆ سەر ئەم چیایە... )

شۆفێرەکە: ( خێرە؟! کارت چی یە؟! )

ڕاز: ( هەفتەی ڕابردوو سەیرانێکی سەر ئەم چیایەمان کرد و لەوێ شتێکم ون کردووە ، دەمەوێ هەوڵی دۆزینەوەی بدەم )

شۆفێرەکە: ( باشە خوات لەگەڵ ، وتم نەبادا شارەزا نەبیت و ڕێگەت بزر کردبێت... )

ڕاز: ( نا ، سوپاس تا ڕادەیەك شارەزام.. خواحافیز.. )

شۆفێرەکە: ( خواحافیز... )

بە دەشتە پڕ گردۆڵکەکاندا بەرەو چیاکە بەسەر کەوت ، لە ئاوی دۆڵە گەورەکە دەم و چاوی شۆرد و خۆی فێنك کردەوە و چەند لاگوێلێکیش ئاوی خواردەوە و دوبەیەکی یەك لیتری نایلۆنی لە ئاوەکە پڕ کرد و دیسان بەرەو چیاکە بەگەڕ کەوتەوە...

سەرکەوتنی چیاکە ماندوکەر بوو ، بەڵام هەرکە مرۆڤ پێ ی دەنایە سەری و بە پانتاییەکەی شاد دەبوو ، هەموو ماندوبوونێکی لە بیر دەکرد...

سەرکەوتن بەسەر چیادا کۆسپ و هەڵدێرەکانی ژیانی بە بیری مرۆڤ دەهێنایەوە ، ئەو کەسانەی زۆر بە چیادا سەر دەکەون زۆرتر بەرگەی مەینەتی و ئازارەکان دەگرن ، بەڵام زیاتر ئاڵۆز دەبن...

بە ئارەقە کردن و هەناسە برکێوە خۆی گەیاندە سەر چیاکە و ڕووی لە کانیاوەکەی نزیك دارقەزوانەکان کرد ، دوای پشوویەکی کەم کانیاوەکەی بەجێ هێلا و بۆ سەرەوە بەگەڕ کەوت ، بە کەلەبەرە تەسکەکەدا هاتە خوارەوە و تولە ڕێگەکەی جاری پێشووی گرتەوە بەر و بەرەو ئەشکەوتەکە ڕۆیشت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

زۆری نەخایاند لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا خۆی بینی یەوە ، پارچەیەك کاغەزی سپی بە دەرگای ئەشکەوتەکەدا داکوترا بوو ، لە سەری نوسرا بوو: ( رێبواری ماندو ، دەبێ تا کاتی گەڕانەوەم لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا چاوەڕوان بیت...)

" راز " کەوتە بیرکردنەوە لەو چەند وشە هەڵواسراوە: ( بلێ ی مەبەستی بە رێبواری ماندو من بێت؟! ئەگەر مەبەستی منە ، چۆنی زانیوە من بەڕێوەم و دەمەوێ سەردانی بکەم؟! )

لە دەرەوە سەرنجێکی ناو ئەشکەوتەکەی دا کەسی لێ نەبوو ، بەڵام ئەوەی جێگەی دڵخۆشی ئەو بوو ئاگری ناو ئەشکەوتەکە بوو ، ئاگر و قۆریەکەی پاڵ ئاگرەکە بەڵگەی ئەوە بوون پیرەمێردەکە دوورنەکەوتۆتەوە و بە زوویی دەگەڕێتەوە ، لە بیری خۆی دا دەیوت : ( ئەگەر پیرەمێردەکە پرسیارم لێ بکات بۆچی بۆ لای ئەو گەڕاومەتەوە ، چی بلێم ؟)

پاشان لە بیری خۆیدا دەیوت: ( ئەگەر مەبەستی بەو رێبوارە ماندوە من بێت کەوابوو دەزانێ بۆچی هاتووم ، بەڵام بەڕاست من بۆچی هاتووم؟! خۆشم نازانم! هەر ئەوەندە دەزانم هۆگری ئەم ئەشکەوت و پیرەمێردە بووم... بەڵام بۆ؟ دیسان نازانم..!)

ئەو لەو باس و رازەی ناوەوەی خۆی دا بوو تەپەی پێ ی کەسێك رای چڵەکاند و بە ئاگا هاتەوە ، بەڵام سەیری دەور وپشتی کرد و هیچی نەبینی ، دووبارە لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە گفتوگۆ: ( دەبێ زۆر نەمێنمەوە ، نەبادا وەکو جاری پێشووم بەسەر بێت... داپیرە چاوەڕوانم دەبێت... بلێ ی لەم شوێنە دوورانەوە ماشێن بۆ شار هەبێت ؟)

لە پڕ دەنگێکی بەهێز کەوتە بەر گوێ ی ، سەری بەرز کردەوە داڵێکی مەزن بوو لە لوتکەی چیاکەوە بەرەو دامێنی چیاکە و بەسەر سەری ئەودا فڕی ، کەوتە بیرکردنەوە لە داڵ ( داڵیش گیانلەبەرێکی تەنیایە ، غوربەت لە سیمایدا دەخوێنرێتەوە شاعیر دەڵێ:

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" بۆچی دەڵێن ئەسپ حەیوانێکی نەجیبە ، کۆتر جوانە ؟

بۆ کەس لە قەفەسی خۆی دا داڵ ڕاناگرێت؟ ! "

بۆ دەبێ لە باڵداراندا تەنها بولبول لای مرۆڤ جوان و ڕۆح سووک بێت؟ !

دەنگێک لە دوورەوە بیسترا ، گوێ ی هەڵخست و کەوتە سەیرکردنی دەوروبەری ، دەنگەکە کۆکەی کەسێک بوو کە چەند جارێک دەکەوتە بەر گوێ ی ، دیار بوو وردە وردە کەسەکە نزیک دەبوویەوە... بە تەپەی پێیەکانیدا دیار بوو کەسەکە بەرەو لای ئەو دێت ، زۆری نەبرد پیرەمێردەکە بە باوەشێک دارەوە دەرکەوت و لە دوورەوە وتی: ( باش بوو پارچە کاغەزەکەم بۆ هەڵواسیت)

کە نزیک بوویەوە " ڕاز " هەستایە سەر پێ و سەلامی لێ کرد و ئەویش بۆ ناو ئەشکەوتەکە فەرمووی لێ کرد...

پیرەمێردەکە ئاگرەکەی خۆش کرد و یەک دوو پارچە داری تری خستە سەری ، هەندێک پشکۆی دارە سووتاوەکانی ڕاکێشایە لاوە و تۆزێک چای وشکی ڕژاندە ناو قۆریەکە و لەسەر پشکۆیەکان داینا ، لە توورەکەیەکدا هەندێ قارچکی دەرهێنا و پاش ورد کردنی نایە ناو مەنجەڵێکی بچووک و لەگەڵ هەندێ ئاودا لە نزیک ئاگرەکەوە داینا...

پیرەمێردەکە ڕووی لە " ڕاز " کرد و وتی: ( دەزانی بۆچی بۆ ئێرە هاتووی؟ ! )

ڕاز: ( ئەگەر بڵێم نازانم باوەڕم پێ بکە...)

پیرەمێردەکە: ( ڕاست دەکەیت ، چونکە مرۆڤ بە هەندێک کار هەڵدەستێ و لە نهێنییەکانی ناگات ، تۆ دەبێ گوێبیستی داستانی ئادۆ ببیت..)

ڕاز: ( داستانی " ئادۆ " چییە و " ئادۆ " کێ یە؟ ! )

پیرەمێردەکە: ( داستانی " ئادۆ " داستانی من و تۆیە ، "ئادۆ" ش من و تۆین )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

-: ( کێ ئێمەی بە داستان کردووە ، مەبەستمە بڵێم کێ ئێمەی نووسیوە ؟)

+: ( ئێمە و بوونی ئێمە لەم ژیانەدا داستانێکە)

-: ( هیچ لە قسەکانت تێناگەم ! )

+: ( گەر لەگەڵ یەکتر بژین لە یەکتر دەگەین )

پیرەمێردەکە چایەکەی لەسەر پشکۆکان کێشایە لاوە و دوو پیاڵە چای بۆ خۆی و " ڕاز " تێ کرد...

" ڕاز " چایەکەی لە دەستی وەرگرت و قومێکی لێدا و وتی : (پەیوەندی من بە تۆوە چییە ؟ ! )

+: ( داستانەکە پەیوەندییەکان ڕۆشن دەکاتەوە)

-: ( کەی دەست دەکەین بە خوێندنەوەی داستانەکە ؟)

+: ( لە ئەوڕۆوە تۆ دەبێ هەموو ڕۆژێکی هەینی سەردانی ئێرە بکەیت تا بە تەواوی داستانەکە گوێ بیست دەبیت )

-: ( بەڵام... )

+: ( لەم ئەرکەدا "بەڵام" نییە ، تۆ دەبێ لێبڕاو بیت ، ئەگەر نا ژیانت لێ دەبێت بە دۆزەخ )

-: ( ئامادەم بۆ گوێ گرتن ، زۆریش بە پەرۆشم ، بەڵام دەبێ ڕێگەی پرسیار کردنم لێ نەگریت )

+: ( ئەوەی پەیوەندی بەداستانەکەوە هەبێت دەتوانی پرسیاری لەبارەوە بکەیت )

-: ( داپیرەم تەنهایە و دەبێ زوو بگەڕێمەوە بۆ لای و خەمی بۆ دروست نەکەم )

+: ( کارێك دەکەین زوو بگەیتەوە ماڵەوە )

-: ( ئامادەم بۆ بیستنی داست

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

+: (منیش لەم ساتەوە دەچمە سەر باسی داستانەکە و هەوڵ دەدەم گەشتێکی ئەو جیهانەت پێ بکەم )

-: ( کێ ئەم داستانەی داڕشتووە ؟!)

+: ( ئاهو )

-: (" ئاهو " کێ یە ؟!)

+: ( "ئاهو" ڕۆماننووسە )

-: ( ئاهو؟! کەی بەو ناوەوە ڕۆماننووس بوونی هەیە ؟!)

+: (" ئاهو " خاوەندی داستان و داستاننووسەکانە)

-: (" ئاهو " خاوەندی داستان! کەی و لە کوێوە داستانەکەی بە دەستی تۆ گەیاندووە ؟)

+: ( من و تۆ بەشێکین لە داستانەکەی ئەو)

-: ( سەیرە! خەریکە تۆم لا دەبێت بە بوونەوەرێکی خەیاڵی ، چاکتروایە دەست بەگێڕانەوەی داستانەکە بکەیت ، چونکە تا پرسیار بکەم زیاتر بیرم ئاڵۆز دەبێت )

پیرەمێردەکە مەنجەڵە قارچکەکەی لەسەر ئاگرەکە داگرت و ئاوەکەی ڕژاندە دەرەوەی ئەشکەوتەکە و هەندێك خوێ و ڕۆنی کردە ناو قارچکەکە و ئەوجا چەند چڵێك پیچکی سەوزی کوێستانەکانی تێجنی و دیسان نزیکی کردەوە لە ئاگرەکە ، پاشان دەستێکی بەڕیشە سپییەکەیدا هێناو ڕووی کردە " راز " و دەستی بە گێڕانەوەی داستانەکە کرد:

( سەرەتای ئەو کاتە نەدەزانرا کە فیکرەی داستانەکەی لە لا گەلاڵە بوو بوو ، ئایا داستانەکە سەرەتایەکی هەبوو؟ کەس وەلامێکی یەکلاکەرەوەی لە لا نەبوو ، زەمەنێکی دوورو درێژ " ئاهوی مەزن " بەو فیکرەوە — فیکرەی داستانەکە — ژیانی بەسەر برد بوو ، بەر لە نووسینەوەی داستانەکە تەواوی وردەکارییەکانی بۆ تۆمار کرد بوو ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خەیاڵی داستاننووسدا بوونی پەیدا کرد بوو ، بەڵکو درێژی تەمەنی داستانەکە — وەك بیر و ئامادەیی لە ناخی داستاننووسدا — بە قەدەر تەمەنی داستاننووس بوو...

بۆچی ئەو ماوە دوور و درێژە بە فیکری داستانەکەوە ژیا و لە قاڵبی نووسیندا دای نەدەڕێژا ؟! بۆچی تا ئەو کاتە داستانەکە لە بیری داستاننووسدا مایەوە و نەدەخرایە نێو قاڵبی پیت و وشە؟! چ پێویستییەکی بە نووسینی ئەو داستانە هەبوو؟! کەس وەڵامێکی تێر و تەسەلی بۆ ئەو پرسیارانە لە لا نەبوو...

یەکێك دەیوت: بە نووسینی ئەو داستانە ویستی خۆی بناسێنێ... خۆی بە کێ بناسێنێت ؟ بە کاراکتەرەکانی ناو داستانەکەی ، بیر بکەرەوە ڕۆماننووسێك خۆی بە کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکەی دەناسێنێت! چ ڕۆمانێك؟! ئەو ڕۆمانەی زادەی بیر و خەیاڵی ڕۆماننووس خۆیەتی...

ئەو کەسێك بوو سەردەمانێك لە پەنهانی و بێ ناویدا ژیانی بەسەر دەبرد... کەسێکی زیندووی مردوو بوو ، زیندوو لە خۆیدا و لە ناو خۆیدا ، بەڵام مردوو لە ناو بیر و ئەندێشەی کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکەیدا ، ئەو بە نووسینی ئەو ڕۆمانە دەیویست کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکە مەدح و سەنای بکەن... بۆچی مەدح و سەنای بکەن؟! بۆ ئەو ڕۆڵەی لە ژیانی ناو ڕۆمانەکەدا بە یەك بە یەکی کارەکتەرەکانی بەخشیوە ، بەڵام خۆ ڕۆڵی مەدح و سەنا کردنیش دیسان ڕۆماننووس بە کارەکتەرەکانی دەبەخشی..!

لە ناو داستانەکەدا هەندێ نهێنی لە مەڕ خۆی و ژیانی خۆی درکاند بوو ، وتبووی: لە دورگەیەکی ناو دەریایەکی بێ پەیدا ژیان بەسەر دەبات ، ئەو خۆشی نەدەهات لەوەی پێ ی بوترێت ڕۆماننووس ، یاخود داستاننووس ، چونکە وتبووی: ( نووسینەکانی من تەنها وشەی بێ گیان نین ، بەڵکو ژیانن ، قسەی سەر زارەکی و پەرش و بلاوی ناو هەوا نین ، بەڵکو ڕۆحیان لەبەردایە و دەتوانن لەگەڵ زیندووەکاندا زیندوو بن )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەر لەوەی کاراکتەرەکانی ناو داستانەکە دابەزێنێت مەملەکەتێکی بۆ خولقاندن ، کارەکتەرێکی ژمارە کەم لە مەملەکەتێکی فراوان و بەرین دا ، چەند ڕۆمانێکی سەیرە ! پانتاییەکی بەرین لە شوێن داگیر دەکات و ڕۆڵ بە بە چەند کەسایەتییەك دەبینێ ، ڕۆماننووس دەیەوێ خۆی بکات بە پاڵەوانی ناو ڕۆمانەکەی ، ئەو لە ناو داستانەکەدا ڕۆڵی پادشای بە خۆی بەخشی بوو ، تەخت و تاج و دەست و پێوەندی لە خۆی کۆ کردبوەوە ، دیارە ژیانی تەنهایی ناو دورگەکە لا پەسەند نەبووە و دەیەوێ کۆمارێك لە سێبەر بۆ خۆی بخولقێنێ ، بۆ بەرز ڕاگرتنی شکۆمەندی خۆی فەرمانی دابوو بە دەست و پێوەندەکان بە دەوری دورگەکەدا و بە قەراغی دەریا فراوانەکەدا ئەڵقە ببەستن...

پادشا پلە و پایەی بۆ هەریەکەیان دیاری کرد بوو ، کەس بۆی نەبوو بە بێ فەرمانی ئەو پەنجە بە ئاودا بکات ، هیچ کەسێك لە دەست و پێوەندەکان — بە بێ پرسی ئەو — نەی دەتوانی بە دورگەی پیرۆزی پڕ لە شکۆمەندی دا هات و چۆ بکات...

دورگەکە بە دارستانێکی چڕ داپۆشرا بوو ، پادشای مەزن لەو دورگەدا زیندەگی خۆی بەسەر دەبرد ، تەنها چەند کەسێکی کەم مافی نزیك بوونەوەیان لەو پادشا شکۆمەندە هەبوو ، ئەوانیش لە سنوورێکی دیاری کراودا ، ئەو کەسانە فەرمانیان لە پادشای دورگەکە وەردەگرت و بەسەر دەست و پێوەندەکاندا دابەشیان دەکرد ، لە بیرمان نەچێت پادشای ناو ڕۆمانەکە ڕۆماننووس خۆی بوو ، دەسەڵاتی ڕەهای بە جۆرێك بەسەر دەست و پێوەندەکاندا سەپاند بوو کە بۆ تەنها چرکە ساتێك لە فەرمان و یادی ئەو بێ ئاگا نەدەبوون ، بەڵکو چێژو لەزەتیان لەو گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری یە دەبینی....

شکۆمەندی پادشا و کاری شەو و ڕۆژیان خەو و خواردنی لە بیر بردبوونەوە ، ئەوان لە بەردەم دەسەڵاتداری مەزن دا لە سەراپای ئەو مەملەکەتەی لە ڕۆمانەکەدا خولقاند بووی بەرپرسیار بوون ، هەواڵی وردەکاری مەملەکەتی ڕۆمانیان بۆ ڕۆماننووس بەرز دەکردەوە ... فەرمانەکانی ئەویان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بە سەر کۆماری سێبەردا پەرش دەکردەوە ، لە هەردوو بارەکەش دا ڕۆماننووس خۆی بوو ڕۆڵی بە دەست و پێوەندەکانی دەبینی...

" جابۆ " سەرکردەی دەست و پێوەندەکان بوو ، کەس بۆی نەبوو لە فەرمانەکانی ئەو لابدات ، بەرزبوونەوە و دابەزینی پلە و پایەی دەست و پێوەندەکان دەبوا لە ڕێگەی ئەوەوە بوایە ، ئەمەش هونەرێکی تری ڕۆماننووس بوو کە دەیویست شکۆمەندی و پیرۆزی خۆی ڕابگرێ و تەنها " جابۆ " ڕوو لە تەختی پادشاهی بکات و کاروبارەکانی لەگەڵ دا تاوتوێ بکات...

لەو دیو دەریاکەوە مەملەکەتێکی "حەوت" هەرێمی بوو ، بۆ هەر هەرێمێك بەرپرسێك و کۆمەڵێك دەست وپێوەندی دانابوو ، بەرپرسی هەرێمەکان ڕاپۆرتی خۆیان بۆ "جابۆ " ی سەرۆکی گشتی بەرز دەکردەوە و ئەویش ڕەوانەی تەختی پادشاهی دەکرد و وەڵامەکانی بۆ دەگێڕانەوە...

ڕۆژێك " جابۆ " لە کاتی چوونی دا بۆ تەختی پادشاهی چاوی بە لەوحێکی زێڕین کەوت ، لەوحەکە نووسینی لەسەر نەقش کرا بوو ، بە ترسێکەوە لەمەڕ ئەو لەوحە زێڕینە پرسیاری لە پادشای مەزن کرد ، ئەو لە وەڵامدا وتی: لەوحە زێڕینەکە ڕۆمانەکەیە بە نووسین ، ئێوەش پیت و وشەی بەرجەستە بووی ناو ئەو لەوحە نوسراوەن..

" جابۆ " بوێری دایە بەر خۆ و وتی: ( ئەگەر لەو لەوحی نووسینەدا پلە و پایەم دابەزێت هەر بەو جۆرە لە ناو دەست و پێوەندەکاندا شانوشکۆم کەم دەکات؟! )

" ئاهو " شکۆمەندانە وەڵامی دایەوە وتی: ( بەڵێ... )

جابۆ: ( ئێمەی دەست و پێوەند دەتوانین نووسینەکانی ناو لەوحەکە دەستکاری بکەین ؟ )

ئاهو: ( هەندێکی کەمتان ، بەڵام ئەگەر دەستیشی تێوەر دەن هەر " ئاهو " ی مەزنە ڕۆڵی بە ئێوە داوە و ڕێگەتان پێ دەدا گۆڕانکاری بەسەر نەقشی سەر لەوحەکەدا بهێنن ، هەرچی بکەن [illegible] کە خۆم دەمەوێت ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ویست و جووڵەی ئێوە لە ناو ویست و جووڵـەی بـەرینی زەینـی مندایـە ، چۆنم بوێـت وا هـەڵتان دەسـوڕێنم ، ئێـوە نابێـت لـە بیرتـان بـچێت کارەکتـەری نـاو ڕۆمانێکن...)

لە هەر چوونێکی دا بۆ لای " ئاهو " ی مەزن "جابۆ" لاپەڕەیەکی لە لەوحە زێڕینەکە دەخوێندەوە ، ڕۆژێك ناوێکی سەیری لە لاپەڕەیەکدا بەرچـاو کـەوت و بڕیاری دا لەو بارەیەوە پرسیارێك لە پادشای مـەزن بکـات: ( خـاوەن شـکۆ ، " ئادۆ " کێ یە؟!)

ئاهو: ( "ئادۆ" کەسێکی کۆیلەیە )

جابۆ: ( یەکەمین جارە وشـەی " کۆیلـە " دەبیـستم ، مانـای "کۆیلـە" چـی یە؟)

ئاهو: ("کۆیلە"کەسێکە لە ڕۆمانەکەدا سەربەست و ئازادی دەکەم ، ڕۆڵی پێ دەدەم ئەگەر بیەوێت دەتوانێت فرمانەکانی من بشکێنێ )

جابۆ: ( بۆ کەس هەیە بتوانێ لە فرمانەکانی تۆ دەربچێت؟!)

ئاهو: ( تەنها ئەو کەسانەی شایستە دەبن بە ڕۆڵی فەرمان شکێنی )

جابۆ: ( شوێن و جێگەی " ئادۆ " لە کوێ یە ؟)

ئاهو: ( سەرەتا لە هەرێمی " حەوت " دایدەنێم و پاشـان ئـاوارەی هـەرێمی "یەك"ی دەکەم..)

جـابۆ: ( خـاوەن شـکۆ ، ئـەم قـسانەی نێوانمـان بـە دەسـت و پێوەنـدەکان ڕابگەیەنم؟)

ئاهو: ( بەڵێ ، پێیان بڵێ کە پادشای مـەزن دەیـەوێ ناوچـەی "ئەرسـا" لـە هەرێمی "یەك" بە " ئادۆ " ئـاوەدان بکاتـەوە ، " ئـادۆ " کۆیلەیەکـە و مانـای کۆیلەشیان تێ بگەیەنە ، دەزانم دەست و پێوەندی گوێڕایەڵم خۆشیان نایەت لە کەسێك فرمانەکانی من بشکێنێ و سنوورەکانم ببەزێنێ ، بـەڵام پێیـان بڵـێ کـە هەر پادشا خۆیەتی ڕۆڵی بەو بەخشیوە و هەر خۆشی دەزانێ چی دەکات..)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕۆژێك پادشا پەیکەرێکی قوڕینەی دایە دەستی " جابۆ " و فرمانی دا لە جەنگەڵی هەرێمی " حەوت " دابنرێت...

" ئەهرا " ی فەرمانڕەوای هەرێمی "حەوت" کەوتە ماخۆلان و بیرکردنەوە ، ترسی ئەوەی کەوتە سەر پادشای ڕۆماننووس ڕێز لەو پەیکەرە قوڕینە بنێت و ڕۆڵێکی گەورەی لە ڕۆمانەکەدا پێ ببەخشێ...

" ئەهرا " لە پەیکەرە قوڕینەکە نزیك بوویەوە و چەند جارێك بە دەوریدا پێچ و خولی خوارد و لێ ی ڕاما ، ئەو دەیزانی فیکری ڕۆماننووس زۆر فراوانە و لە داهاتوودا ئیشێکی بەم تۆپەڵە قوڕە هەیە، دەترسا لەوەی ڕۆژێك پلەو پایەی بەرزی ئەو تۆ بلێ ڕۆڵی گرنگی ناو ڕۆمانەکە بخرێتە سەر شانی پەیکەرە قوڕینەکە ، لە ناخەوە جۆرێك لە ڕق و کینەی بەرانبەری حەشار دا ، بیری دەکردەوە بۆچی دەبێ لە هەرێمەکەی ئەودا ئەم قوڕە قنج بکرێتەوە؟! نەشیدەوێرا لەو بارەیەوە پرسیار لە پادشای مەزن بکات...

" ئەهرا " هەموو گیانی بە پارچەیەك لە ڕق و تووڕەیی گۆڕا...

" جابۆ " پرسیاری لە پادشا کرد: ( خاوەن شکۆ ، ئەو پەیکەرەت چۆن و لە چی دروست کردووە؟! )

پادشا " ئاهو ": ( ئاو و خۆڵی ئەم دورگەیەم تێکەڵ کرد و قوڕم لێ پێك هێنا ، سەردەمێك قوڕەکە مایەوە و بوو بە قوڕێکی ترشاو ، پاشان خەستبوویەوە و قوڕێکی مچی لێ دەرچوو ، لە دوایی دا بە دەستی خۆم ئەو پەیکەرەم لێ دروست کرد ، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە فووی دەمی من هەڵبگریت و بیکەیت بە لاشەی ئەو پەیکەرە قووڕینەدا...)

" جابۆ " فووی دەمی پادشای مەزنی هەڵمژی و بەرەو هەرێمی "حەوت " بەگەڕ کەوت و ڕووی کردە جەنگەڵستانەکە و خۆی گەیاندە هەیکەلی قوڕینە و پڕێك لە هەوای سی و دەمی خۆی — کە بە ڕۆحی ئاهوی مەزن تێر بوو بوو — کرد بە ناو لاشەی پەیکەرەکەدا و لە دوورەوە وەستا تاکو بزانێ چی ڕوودەدات...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گەورەیی و شکۆمەندی بۆ پادشای مەزن ! بینی پەیکەرە قوڕینەکە کەوتە جووڵە و خرۆش ، سەرەتا چاوی کردەوە و پژمەیەکی توندی بۆ کرد و دەستەکانی کەوتە بزوان و پاشان لاقەکانی دەستی بە جووڵە کرد و بەرەو " جابۆ " بە گەڕ کەوت....

" جابۆ " دیمەنەکەی زۆر لا سامناك بوو ، خەریك بوو لە دەستی هەڵبێت ، بەڵام هەیکەلە قوڕینەکە بانگی لێ کرد: ("جابۆ" ، "جابۆ" مەترسە ، ڕاوەستە دەمەوێ گفتوگۆت لەگەڵ بکەم...)

" جابۆ " بەسەر سوڕمانەوە وەستا و کەوتە سەرنج و تێڕامان لەم بوونەوەرە ناوازەیە...

" ئادۆ " داوای لە " جابۆ " کرد بۆ لای " ئاهو " پادشای مەزن بەرزی بکاتەوە..

" جابۆ " پرسیاری لێ کرد: ( چۆن " ئاهو " دەناسیت؟! )

" ئادۆ " لە وەڵامدا وتی: ( لەناخەوە ئارەزوومە بگەڕێمەوە بۆ لای " ئاهو " ی مەزن ، ئەو فووە بەرزو بڵندەی تۆ کردت بە جەستەی مندا عاشقی بینین و گەڕانەوەیە بۆ لای "ئاهو " ، من بەشێکم لە "ئاهو"ی مەزن ، بۆیە تکا دەکەم بمگێڕەرەوە بۆ ئەو سەرچاوەی لێ یەوە هاتووم )

جابۆ: ( تۆ تەنها فووی دەمی "ئاهو" نیت ، بەڵکو خاك و خۆڵیشی، ئەی بۆ ئارەزووی گەڕانەوە بۆ خاك ناکەیت ؟)

ئادۆ: ( تۆ دەزانی خاك و قوڕی جەستەم دارای هێزو جووڵە و ژنەوتن نەبوو ، فووی دەمی پادشای مەزن منی خستە جۆش و خرۆش، بۆیە نهێنی من لە فووی دەمی پادشای مەزندایە)

جابۆ: ( گەر بە تەنها فووی پیرۆزی دەمی " ئاهو " دەبووی دەمتوانی بۆ باوەشی پادشای مەزنت بگێڕمەوە ، بەڵام جەستەی قوڕاوی تۆ فووی موبارەکی لە گەردش و دەوران خستووە و لەم قاڵبەدا توانای گەڕانەوە و بینینی ئەوت

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نییە ، تاکو فەرمانم پێ نەکات ناتوانم تۆ بەو بگەیەنم ، لەم جەنگەڵەکەدا بمێنەرەوە تا هەواڵت بۆ دەگێڕمەوە...)

" ئادۆ " کە ئەوەی بیست پشتی هەڵکرد لە " جابۆ " و بە ناو جەنگەڵەکەدا کەوتە گەڕان...

" جابۆ " گەڕایەوە بۆ دیوانی پادشای مەزن و وتی: ( شکۆمەندی بۆ پادشای مەزنمان ، فووی دەمی پیرۆزی ئێوە قوڕ بە زێڕ دەکات...)

ئاهو — پادشای مەزن —: ( تەواوی کاربەدەستان و دەست و پێوەندەکان و لێپرسراوی هەرێمەکان کۆدەکەیتەوە و فرمانی منیان پێ ڕادەگەیەنیت )

جابۆ: ( فرمانی ئێوە هەمیشە لەسەر سەرە و جێ بەجێ کراوە)

ئاهو: ( فرمان بەسەر هەموان دا دەردەکەم : سوژدەی ڕێز و نەوازش بۆ " ئادۆ " ببەن ، هەرکەسێك لە فرمانم یاخی ببێت ئەڵقەی گوێڕایەڵی و بەندایەتی لە گوێ ی دەکەمەوە و وێڵی مەملەکەتی تاریکستانی دەکەم )

جابۆ: ( فرمانی پادشای مەزن جێبەجێ کراوە)

" جابۆ " تەواوی بەرپرسان و دار و دەستەی پادشای مەزنی لە هەرێمی " حەوت " دا کۆکردەوە و فەرمانی پادشای بەسەردا خوێندنەوە: ( پادشا ، خاوەن شکۆ "ئاهو"ی مەزن فرمانی داوە بەسوژدە بردن بۆ " ئادۆ")

" جابۆ " بۆخۆی بەرلە هەموان سەری ڕێز و حورمەتی بۆ " ئادۆ " نەوی کرد و بە دوایدا سەرجەم بەرپرسان و دەست و پێوەندەکان چەمینەوە.....

" ئەهرا " ئاگری تووڕەیی و ئیرەیی بەربووە گیانی و هاواری کرد : ( کارێکی ئاوا نەشیاوە ، چۆن دەبێ ئێمەی مەزن و پیرۆز سوژدە بۆ شتێك ببەین کە تا دوێنێ قوڕێکی بۆگەنی بەر خۆرەتاو بوو؟!)

دەنگێك لەدارستانەکەوە دەبیسترا کە گوێ ی هەموانی پڕکرد بوو ، ئەو دەنگەش دەنگی " ئاهو " ی مەزن بوو دەیوت: ( "ئەهرا" بۆچی بۆ " ئادۆ "

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سوژدە نابەیت ، من "ئادۆ"م لە شێوەی خۆمدا و بە دوو دەستی خۆم دروست کردووە ، پاشان لە ڕۆحی خۆمم بە بەردا کردووە؟)

ئەهرا: ( ناتوانم سوژدە بۆ شتێك ببەم لە قوڕێکی بۆگەنی وشکەوەبووی بەرخۆر دروستت کردبێت ، من لەو بەرز و بڵندترم ، لە ئاگر منت دروست کردووە ، بەڵام ئەوت لە قوڕ خولقاندووە)

ئاهو: ( ئەگەر سوژدە نەبەیت دەکەویتە بەر ڕق و قین وخەشمی پادشای مەزنەوە)

ئەهرا: ( باکم نییە ، هەرخۆتی ڕۆڵت پێ بەخشیوم و بە کاراکتەرێکی یاخیم دەکەی )

ئاهو: ( بەڵام من فرمانت بە سوژدە بردن بۆ " ئادۆ "پێ دەکەم )

ئەهرا: ( بەڵام پێشتر فرمانت داوە کارەکتەرێکی یاخی بم )

ئاهو: ( ئەی تۆ بۆ وەك هەموان سوژدەی بۆ نابەی؟! چی بەرت لێ دەگرێت؟)

ئەهرا: ( ئەوەی ڕێگەم لێ دەگرێت فرمانی پێشینەی تۆیە ، تۆ ویستووتە من یاخی و گومڕا ببم )

ئاهو: ( تۆی وادەزانی من بڕیاری پێشینەم لەسەر گومڕاکردنی تۆ داوە ، بڕۆ بەرنەفرەتی خۆمت دەخەم...)

ئەهرا: ( تەنها ڕۆڵم پێ بدە و تەمەنم درێژ بکە تاکو تۆڵەی خۆم لەو تۆپەڵە قوڕە بکەمەوە ، سوێند بێت بە شکۆمەندی تۆ هەموویان وەکو خۆم گومڕا دەکەم ، ڕێگە نادەم بەندەیەکی گوێڕایەڵی تۆ بن ، بەڵکو لەغاویان دەکەم و لە هەموو لایەکەوە بۆیان دێم ، هەموو ئەوانەش یاخی دەبن – هەروەکو من – تۆ یاخییان دەکەیت و ڕۆڵی یاخی بوونیان پێ دەبەخشی...)

ئاهو: ( تۆ هێز و دەسەڵاتت تەنها لەسەر کەسانێکە شوێنت دەکەون و گوێڕایەڵیت دەکەن ، بەندە دڵسۆزەکانی بە تۆ گومڕا ناکرێن ، برۆ تا ڕۆژی دوایی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕێگەت پێ دەدەم ، بەڵام تەنها ئەوانە شوێنی فرمانەکانت دەکەون کە وەك تۆ وان ، بەندە ڕاستەقینەکانم دەسەڵاتی تۆیان بەسەردا زاڵ نابێت)

ئەهرا: ( ئەوە تۆی ڕۆڵی گومرا و سەرلێشێواوت لە ڕۆمانەکەتدا بەمن بەخشیوە تاکو ببمە هۆی گومڕاکردنی هەموو ئەوانەی کە خۆت گومڕایان دەکەیت ، بەڵام باش بزانە سەرجەمی گومڕابووەکان من بم یان ئەوان تەنها بە بڕیاری تۆ بووە...)

ئاهو: ( دیارە شایستەی ئەو ڕۆڵەی ، بەڵگەی شایستەبوونت بۆ گومڕایی ئەم قسانەی ئێستایە کە دەیکەیت...)

ئەهرا: ( ئەم قسانەش من خاوەنی نیم ، بەڵکو هەر بۆ تۆ دەگەڕێتەوە )

ئاهو: ( تۆ هەموو شتێك بۆ من دەگێڕیتەوە ، ئەگەر لەگەڵ ئەم گشت تەسلیمبوونەدا ڕاستت بکردبایە گوێڕایەڵیت لێ دەکردم و سوژدەت بۆ " ئادۆ " دەبرد ، بەڵام تۆ خۆت لەبەردەم دەسەڵاتی مندا بەرز کردۆتەوە ، کەسی " ئاهوناس" و ملکەچ بە فرمانەکانی خۆی ناکات بە دوژمنی سەرسەختی " ئاهو " ، چونکە دەزانێت هەموو شتێك بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ، ئەم قسەشت خستە سەر قسەکانی پێشووت ، تۆمەتبارکردنی من لە لایەن تۆوە بەڵگەی شایستە بوونتە بۆ ڕۆڵی یاخیبوون ، دەمت دابخە و لەوە زیاتر پێ ڕامەکێشە ، چونکە لە ژێر دەسەڵاتی خۆمدای )

ئەهرا: ( دەزانم لەژێر دەسەڵاتی تۆدام ، بەڵام تۆ وتت مۆڵەتت دەدەم و تەمەنت درێژ دەکەمەوە تاکو تۆڵەی خۆم لە نەوەی " ئادۆ " بکەمەوە)

ئاهو: ( بەڵێ ، ئێستاش دەڵێم تۆ ڕێگەت پێ دراوە و هەرچی لە دەستت دێت ئەنجامی بدە..)

ئەهرا: ( هەرچیم لەدەست بێت تۆ پێم ئەنجام دەدەی..)

ئاهو: ( من شەڕ و خراپەم گەرەك نییە )

ئەهرا: ( بەڵام شەڕت خولقاندووە ! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئـاهو: ( ژیـان بـۆ مـرۆڤ تاقیکردنەوەیـە ، بـە بـێ بـوونی شـەڕ مـرۆڤ تاقیناکرێتەوە )

ئەهرا: ( بەڵام منت گێڕا بەو شەڕە ! )

ئاهو: ( من تەنها پۆشاکێکم دووری بـوو ، تـۆ دەتـوانی ئـەو پۆشـاکی شـەڕە نەپۆشیت ، خۆت بڕیارت دا پۆشاکەکە بکەیت بە کاڵای باڵات)

ئەهرا: ( بەڵام دەبوا کەسێك بیپۆشیبایە ! )

ئاهو ( بۆ دەبێت تۆ خۆت بەو کەسە بگێڕی؟ کێ زۆری لێکردی تۆ ئەو کەسە بیت؟ )

پیرەمێردەکە مەنجەڵە قارچکەکەی لەسەر ئاگرەکە لادا و لە قاپێکدا هەندێ قارچکی سوورکراوەی بۆ " راز " تێ کرد و لەگەڵ دەستە نانێکدا نایە بەردەمی و پێ ی وت: ( نان بخۆ... )

"ڕاز" سەرنجێکی پڕ لە پرسیاری لـە پیرەمێردەکـەدا و هاتـە وەڵام : ( نـانی چی بخۆم ! دەیان پرسیارم لا هوروژاوە و دەمەوێ تێ بگەم )

پیرەمێردەکە: ( نانەکەت بخۆ و بڕۆ ، بۆ خۆت بە دوای وەڵامی پرسیارەکاندا بگەڕێ ، هەر پرسیارێکیش بێ وەڵام مایەوە هەفتەی داهاتوو پێکەوە گفتوگۆی لەسەر دەکەین... )

" ڕاز " هەندێك نان و قارچکی سـوورکراوەی خـوارد و هەسـتایە سـەر پـێ و خواحافیزی لە پیرەمێردەکە کرد و بەر لـە چـوونە دەرەوە پیرەمێردەکـە داوای لێ کرد پەرداخێ ئاو لە کوپەکە بخواتەوە ، "ڕاز"یش پەرداخێکی پڕ کرد و نای بـە سـەریەوە و بەپەلـە لـە ئەشـکەوتەکە چـووە دەرەوە ، ماوەیـەك بـە لاپـاڵی چیاکەدا هاتە خوارەوە و لە ناکاو کپ بوونەوەیەك بەسـەر هـەموو هەسـتەکانیدا داباری و خەوە نوسکێ داگیری کـرد ، بـەدەم ڕێـوە چـاوەکانی لێـك نـا ، کـاتێ چاوی کردەوە خۆرئاوایەکی درەنگە و بە توونـدی لـە دەرگـای ماڵـەوە دەدات ، داپیرە دەرگاکەی بۆ کردەوە و باوەشی پیادا کرد و دەستەکانی لە مل ئاڵانـد و وتی: ( کوڕم ، لە کوێ بووی ؟ بۆ در

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ڕاز " سەلامی کرد لە داپیرە و بەرەو ژوورەکەی خۆی ڕۆیشت ، داپیرە پرسیاری لێ کرد: ( خواردنت بۆ ئامادە بکەم؟)

لەوەڵامدا وتی: ( نە ، داپیرە گیان ، زۆر ماندوم ، دەمەوێ هەندێ بنووم ، ئەگەر بە ئاگا هاتم دێم بۆ هۆڵەکە...)

" ڕاز " زۆر شەکەت بوو ، هەر ئەوەندە خۆی گەیاندە ناو جێگەکەی کەوتە ناو خەوێکی قووڵەوە ، داپیرەی یەك – دوو جارێ سەری کێشایە ژوورەکەی ، بەڵام ئەوەندە خەوەکەی خۆش بوو دڵی نەهات بە ئاگای بهێنێت...

سبەینێ شەممە یەکی ئایار بوو ، ئەو ڕۆژەش لە سەراپای وڵات دا پشوو بوو ، بەیانی درەنگ بە ئاگا هات ، دەتوت بە مەکوکێکی ئاسمانیی لە گەشتێکی گەردوونییەوە گەڕاوەتەوە...

باخە گەورەکە و دەرەوە و ناوەوەی خانوەکە و تەنانەت داپیرەش لەبەر چاوی " ڕاز " گۆڕابوون ، لە دەستشۆری هاتووخانەکەدا دەستی شۆری و چوو بۆ لای داپیرەی کە لە چێشتخانەکە دانیشتبوو: ( بەیانی باش داپیرە )

داپیرە: ( بەیانی باش ، کوڕی شیرینم ، وەرە دابنیشە...)

بە دەم خواردنی ژەمی بەیانی یەوە " ڕاز " پرسیاری لە داپیرە کرد: ( ڕوخسار و دەم و چاوم نەگۆڕاوە؟)

داپیرەی دەستێکی هێنا بە سەر سەری دا و وتی: ( خۆ نەخۆش نیت گیانی داپیرە؟)

" ڕاز " دەستی بۆ پارووییەکی تر برد و وتی: ( نا... مەبەستم ئەوە بوو هەست ناکەیت گەورە بووم؟)

داپیرەی بزەیەك کەوتە سەر لێوانی و وتی: ( ماشەڵاَت لێ بێت پیاوێکی کامڵیت ، خودا لە تیری حەسوودان بە دوورت بگرێت)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاش خواردنی ژەمی بەیانی سفرەکەی بۆ داپیرە پاك کردەوە و پیاڵەکانی بۆ شۆری و لە دۆڵابەکەدا ڕیزی کردن ، ئەوجا کتێبێکی بە دەستەوە گرت و ڕۆیشت بۆ ناو باخەکە...

سەرەتا لە ناو جۆلانەکەدا دانیشت و گورێکی بە خۆی دا و جۆلانەکە کەوتە هات و چۆ...

قسەکانی دوێنێ ی پیرەمێردەکە هاتەوە بەر زەینی: ( بلێ ی ئەم پیرەمێردە کەسێکی ڕاستەقینە بێت؟!، یاخود خەیاڵێکی دروستکراوی زەینی من بێت ، تۆ بڵێ ی کارەکتەری ڕۆمانێکی نەنوسراوی من بێت ؟ یاخود خەونێکە و دوێنێ شەو بینیومە؟ ئەو دونیایە بە جۆرێکی دی دەکەوێتە پێش چاوان... دەڵێ ی گابەردێکم و لە شوێنی خۆم هەڵکەنراوم ، دارگوێزێکم بارەشی بەهێز پەل و پۆکانی تێك شکاندووم، باخێکی میوەم تۆفانی بەهار تەرزەکوتی کردوم و هەموو گوڵەکانی وەراندووم ، هەناوم دەڵێ ی دۆڵێکە و لافاو دایدڕیووە ، لەو مێش هەنگانە دەچم مرۆڤە چڵێسەکان دەست بەسەر پلوورەکەیاندا دەگرن و هەموو شانە هەنگوینەکانی بە تالان دەبەن ، من پەپوولەیەکم ڕەشەبا هەڵی گرتووم و مەملەکەتی خۆمی لێ بزر کردووم ، گەرا ماسییەکم دایکم لە دەریالووشەوە هاتووە و منی لە قولاخی بن بەردی ڕووبارێکدا هەڵ ڕشتووە و بەجێ ی هێلاوم...

بلێ ی من و داپیرە بەشێك لە داستانەکەی ئەو نەبین؟! ئەگەر وابێت خۆشەویستی نێوان من و داپیرەم ئەو خولقاندوویەتی ، چەندە تاڵە من و ئازیزانم ئەکتەری فیلمی ئەم پیرەمێردە بین! بلێ ی ئێمە سەرقاڵی ڕۆڵێك بین نووسەر و دەرهێنەرەکەی خۆمان نەبین ؟! دەبێ کێ بێ دەرهێنەری ئەم شانۆیە؟! پیاوی ناو ئەشکەوتەکە؟ کابرای دورگە سیحراوییەکە؟ جابۆ؟ ئادۆ؟ ئەهرا؟ خۆم؟ بە ڕاستی ئێمەی مرۆڤ لە قەیرانێکی تەواو ڕاستەقینەدا دەژین... ئەگەر قەیرانیان بۆ خولقاندبین ، دەبێ کێ بێت بەرپرسی یەکەم لەم هەموو تەنگەژەی ڕوو بە ڕووی دەبینەوە..؟!

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاشـان پوختـەی شـانۆکەی " یوسـوف " کـە لەسـەر زمـانی ئـاژەڵان نووسیبووی هێنایەوە بەر کامێرای خەیاڵ و لە یەك بە یەکی ڕووداوەکان ڕا دەما ، کورتە شانۆکەی زۆر لا شیرین بوو ، پڕ بە دڵ بەو سەرئەنجامەی ڕوو بـە ڕووی " گاجووت" بوویەوە پێکەنی ، کورتە شانۆکەی لەسـەر تەپڵەکەکـەی بـەردەمی دانـا و لـەناو خۆیـدا کەوتـە پرسـیار و بیرکردنـەوە ( یوسـوف نووسـەری کورتـە شـانۆکەیە ، لـە بـیری خۆیـدا هەنـدێك لـە کارەکتـەرەکانی سـەر خـست و سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و هەندێکی تریان دۆڕاو و هەڵهاتوو...

" شێر" ی کرد بە شێری مەیدان و براوە لە جەنگدا ، "گـاجووت"یـشی کـرد بـە گـاجووتێکی ترسـنۆك و هـیچ لـەبارا نـەبوو ، ئایـا نەیـدەتوانی ڕۆڵـی شـێر و گـاجووت پێـچەوانە بکاتـەوە ، گـاجووتی بکردبایـە بـە پادشـای ڕاسـتەقینە و جەنگەڵی لە دەستی زوڵم و زۆری "شێر " قوتار بکردبایە ؟

یاساکانی جەنگەڵ چۆنە "یوسوف"بەو شێوەیە سەرئەنجامەکان دیاری دەکـات ، ئـەویش لـە ژێـر دەسـەلاتی یاسـای جەنگەڵدایـە ، واتـە شـانۆنووس لـە ژێـر کاریگەری شانۆدایە ، هەر بەو جۆرە ڕۆمانووس لە ژێر کاریگەری ڕۆماندایە...

" قالاو و پاساری" تاوانیان چی یە بە ڕووڕەش و ناپاك دەردەچن ، ئـەی بـۆ دوو قارەمانیان لێ دروست نەکرا ، تاوان لە ئەوانەوەیە یان لـە نووسـەری کورتـە شـانۆکەوە ؟ بـۆ دەبـێ "پاسـاری" ڕووبـەڕووی ئـەو سـەرئەنجامە تراژیـدی یـە ببێتەوە ؟ خیانەت و کوژران دوو مەرگەساتی بێ وێنەن ! ئێمـە چـی لـەم کورتـە شانۆوە فێر دەبین؟ ئەم کورتە شانۆیە کوێ ی ئێمـە ئـاوەدان دەکاتـەوە؟ ئـەم کورتە شـانۆیە پێمـان دەڵـێ : هـیچ شـتێك ناگۆڕێـت ، ئەگـەر بتـەوێ بیگـۆڕی خراپی دەکـەیت ، نووسـەری ئـەم شـانۆیە دەڵـێ: ئـەوەی پادشـایە دەبـێ هـەر پادشا بێت و کەس ناتوانێ لە دەرەوەی دەسەلاتی " شێر " ژیان بەسەر بەرێت ، هەموان لە جەنگەڵدا ڕەعیەتی " شێر" ن و ئەگەر چەند گیانـدارێك یـاخی بـبن سەرئەنجامیان وەکو گاجووت و ڕاوێژکارانی دەبێت ، ئەگەر گۆڕان بوونی هەبێت ئەوە تەنها لە ڕۆڵی "پاساری"دایە ، بەلام کـام گـۆڕان؟ گـۆڕان سـەرئەنجامێکی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

وای بـە "پاسـاری" بەخـشی هـیچ کەسـێك نـەوێرێ لـە ژیانیـدا بـیر لـە گـۆڕان بکاتەوە...

بە کورتی شتەکان چۆن هاتوون هەروا دەبن ، کەس ناتوانێت گۆران لە یاسا سروشتیەکاندا بکات ، ئەگەر گۆڕانێکی کەمیش بکرێت تێکدان و کاولکـاری یـە ، ئایا ئەم تێڕوانینەی "یوسوف " بۆ ژیان دروستە یان هەڵەیە؟ بە پێوەری واقیـع دروستە چونکە ئەم شـانۆیە باسـی واقیعێـك دەکـات کـە هەیـە ، " شـێر " بـالاَ دەستە و کەس ناوێرێ لێ ی نزیك بکەوێتەوە ، بەلاَم بـە پێـوەری دادێـك کـە لـە قووڵایی ناخی ئێمەدا بوونی هەیە نابێت ژیان بەو جۆرە بێت... خەونی ئێمە بۆ عەدالەت شتێکی ترە و واقیعی عەدالەت وێنەیەکی ترمان نیشان دەدات... ئێمـە نامانـەوێ زاڵـم بـە هـۆی هێـز و زۆرییـەوە پایـەدار بێـت ، پێمـان خۆشـە لاواز و مەزڵوم دەسەلاَت بگرنە دەست ، بەلاَم کە لە واقیعدا ئەم خەونەی ئێمە دێتە دی ، واتــە زاڵــم دەڕوخــێ و مــەزڵوم ســەردەکەوێت ، زۆرجــار ئــەو ســەرکەوتنە ئەنجامێکی پێچەوانەی لێ دەکەوێتەوە...

زۆرجار کە مەزڵوم دەستی دەگاتـە کورسـی دەسـەلاَت بـۆ زاڵمێکـی ترسـناك دەگۆڕێت ، بە جۆرێك ژیان و زیندەگی لە مەردومان تاڵ دەکات خـەڵکی خۆزگـە بە پادشا زاڵمەکەی پێشتر بخوازن ، کەوابوو پادشای پێشوو زاڵم نەبوو کورسـی دەسەلاَت زاڵمە ، " شێر" لە خۆیدا ستەمکار نییە ، سروشت ستەمکارە ، مـرۆڤ لە خۆیدا زۆردار نییە بەڵکو ئەو پلە و ئەستێرانەی لە سـەر شـانی دانـراون زوڵـم کـردن دەخـوازن، هـاتنی شـیوعییەکان بـۆ سـەر دەسـەلاَت هاتنـە دی خـەونی کرێکاران و هەژاران بوو ، بەلاَم دواتر خەڵکی خۆزگەی بە سەردەمی "قەیـسەر" دەخواست...

هەمیشە کۆیلـە کـە دەگاتـە دەسـەلاَت زەبـر و زۆری چـەند بەرانبـەری زۆر و سـتەمی سـەردارەکانە... کۆیلـە بـە نەفـسییەتی کۆیلـەیی خـۆی دەیـەوێ لـە کەمترین ماوەدا دونیای دەرەوە بەو جۆرە لێ بکات کە ئـەو دەیـەوێ ، ئەمـەش ناچاری دەکات زەبر و زۆر بەکار بهێنـێ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاپەڕاندنی دەسەڵات لە لای کۆیلە وەك نانخواردنەکەی وایە لەسەر سفرە ، کۆیلە لەسەر بنچینەی لەزەت سفرە دەڕازێنێتەوە ، سەردار لەسەر بنچینەی تەندروستی پارووەکانی دەجاوێت ، کۆیلە هەموو ئەو شتەی دادەنرێت حەپەلووشی دەکات ، سەردار لە هەر خواردنێك چەند کەوچکێك دەخوات ، کۆیلە بە خێرایی و لە کاتێکی کەمدا شتەکانی سەر سفرە هەڵدەلووشێ ، سەردار یەك – دوو کاتژمێر بە مەراسیمی خواردن و خواردنەوەوە بەسەر دەبات ، کۆیلە لەسەر سفرەدا جگە لە مرە مرِ شتێکی تری لێ نابیستی ، سەردار بەشێك لە قسەکانی خۆی بۆ سەر سفرە هەڵ دەگرێت ، کۆیلە نایەوێت کەس لەگەڵی نان بخوات تەنانەت ژن و منداڵەکانیشی ، سەردار لەگەڵ کەسانی تردا نەبێت نانی پێ ناخورێت ، کۆیلە دوای تێربوون داوای ڕابواردن و ژووری نوستن دەکات ، سەردار باسکردنی چەندین بابەتی گرنگ بۆ دوای نانخواردن هەڵ دەگرێت...

گەورەترین ترس کە ڕووبە ڕووی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەبێتەوە ئەوەیە کۆیلەکان دەسەڵات بگرنە دەست ، کۆیلە بەر لەوەی ڕقی لە هەر شتێك ببێتەوە ڕقی لە کۆیلەیە ، واتە ڕقی لە خۆیەتی ، بوونی کۆیلە ئازارەکانی کۆیلەیەتی بەبیر دێنێتەوە ، بۆیە دەیەوێ هەموو کۆیلەکان ڕەشەکوژی بکات...

"ستالین" ی کۆیلە دەیان ملیۆن مرۆڤی کۆیلەی لە کۆمارەکانی ڕووسیادا قەتڵ و عام و زیندەبەچاڵ کرد ، ڕووخانی پادشایەتی و هاتنی دەسەڵاتی کۆماری لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵا تدا هەڵەیەکی مێژوویی بوو... بۆ ؟ چونکە کۆیلە نازانێت چۆن سیاسەت بەرقەرار دەکرێت ، بەشێك لە هۆکاری کۆیلەبوونی کۆیلە نەزانی و تەمبەڵی خۆیەتی ، بۆیە دەیەوێ وڵات پڕ ئاشووب بێ و ئەو لە بێ یاسایی و تاڵان و بڕۆ سوودمەند بێت ، ئەم هەموو ڕقەی من لە کۆیلە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆشم کۆیلەم...

بەڵێ منیش کۆیلەم ، بەڵام ڕق و کینەی کۆیلەیەکی وەکو من لە کۆیلەکان ڕاستێتی قسەکانم دەربارەی کۆیلە دەسەلمێنێ ، کۆیلە بە قەدەر " گاجووت " دەسەڵاتەکەی بەردەوام دەبێت ، ماوەیەك هەوا دەکاتە خۆی و پاش کەمێك

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

وەکو باڵۆن فش دەبێتەوە ، کۆیلەکانی "یەکێتی سۆڤیەت " ی جاران تەنها " سێ " چارەکە سەدە توانیان لە دەسەڵات دا بمێننەوە ، پاشان دانیان بە کۆیلەیی خۆیاندا نا و کلکیان بە دوای خۆیاندا گووشی ، نەفرەت لەو کەسانەی لە مێژوودا کۆیلەکان هەڵ دەنێن بۆ ئەوەی لە ڕێگای زەبر و زۆرەوە دەسەڵات بگرنە دەست...)

" ڕاز " بە دەنگی داپیرەی بە ئاگا هاتەوە کە لە بەردەمی دا وەستا بوو ، پێ ی وت: ( کوڕم بۆ لەبەر خۆتەوە قسە دەکەیت؟ نەفرەت بۆ سەر کێ دەنێری؟)

دیار بوو " ڕاز " نەفرەت کردنەکەی بە زوبان گۆ کرد بوو ، هاتە وەڵام و وتی: ( ئاگام لە خۆم نەمابوو ، بیرم لە شتێك دەکردەوە...)

داپیرە: ( بیرت لە چی دەکردەوە ؟)

ڕاز: ( باشە داپیرە بنەماڵەی ئێمە ڕەگ و ڕیشە و بنەچەی لە کوێوە هاتووە و بۆ سەر کێ دەگەڕێتەوە؟)

داپیرە لەسەر یەکێك لە کورسییەکان دانیشت و وتی: ( چەند جار لە " وەستا مەحمود " ی باپیرتم بیستووە ئەویش لە باپیرانیەوە بۆی باس کراوە گوایە بنەماڵەکەی ئێوە لە "ئێران"ە وە ڕووی لەم وڵاتە کردووە...

کاتێك حکومەتی " کەریم خانی زەند " لە " ئێران " دەڕوخێ عەشیرەتەکەی دەکەونە بەر هێرش و پەلاماری عەشیرەتەکانی تر و بەشێکیان ڕوو دەکەنە دەشتی " هەولێر" و بەشێکی تریان ڕوولە " شارەزوور " و " گەرمیان " دەکەن ، " وەستا مەحمود " دەیوت : ئێمە لەو بنەماڵە ئاوارانەین کەلە ترسی زوڵم و زۆر بەرەو ئەم وڵاتە هەڵهاتووین...لە باوەڵی نەختینەکەدا شەجەرەکەی تێدایە و تاکو ئێستا پارێزگاریم لێ کردووە...)

ڕاز: ( داپیرە خۆت بۆ سەر چ عەشیرەت و بنەماڵەیەك دەگەڕێیتەوە؟)

داپیرە: ( من دایکم لە سەیدەکانی بەرزنجەیە و باوکیشم لە بەگزادەکانی هەورامانە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( شەجەرەی ئێوەش نوسراو و دیارە ؟)

داپیرە: ( بەڵێ، لای کوڕەکانی مامی گەورەم پارێزراوە...)

ڕاز: ( دایکم و خاڵەکانم ڕەگ و ڕیشەیان دیارە ؟)

داپیرە: ( باوکی دایکت ، واتە " باپیرت " پیاوێکی هەژار بوو ، بەلاّم عیززەتی نەفسی بە قەدەر پادشایە بوو ، ئەو پیاوێکی سنگ فراوانی نەجیب بوو ، حەزی بە میوان و خزمەتی خەڵکی بوو ، هەموو کەسێك خۆشی دەویست ، پیاوێکی جوانخاسی پێکەوتو بوو ، هەموو جارێ بە شۆخییەوە بە " وەستا مەحمود " م دەوت : حەیفە تۆ میر و بەگ بی و خەزوری کوڕەکەشت پێ ی بوترێت مسکێن.... وەستا مەحمود – یاخوا بە ڕەحمەت بێت – تێر بە قسەکەم پێ دەکەنی و دەیوت : " مام ڕەحمان " زۆر لە میرو بەگ گەورەترە ، ئەو خودا دڵ و دەروونێکی پێ بەخشیوە لە ئاوێنە سپیترە... جوانی ناوەوەیەتی ڕووخسار و دەرەوەی پێکەوتوو کردووە...)

ڕاز: ( بۆچی تاکو ئێستا ئەم قسانەت بۆ باس نەکردووم؟)

داپیرە: ( حەزم کردووە ڕۆژێك لات ببێتە پرسیار ئەوجا بۆتی باس بکەم... هەستە با بچین بۆ چێشتخانەکە و شتێك پێکەوە بخۆین...)

ڕاز: ( با بڕۆین......)

عەسرەکەی ئەو ڕۆژە خەریکی ئامادەکردنی وانەکانی بوو ، شەوەکەشی هەندێکی لە ئەدەبی عەرەبی خوێندن و پاشان لە سەر جێگەکەی ڕاکشا و کەوتە بیرکردنەوە لە گەڕانەوەی دوێنێی لە ئەشکەوتەکەوە بۆ ماڵەوە: ( بە ڕاست لە ئەشکەوتەکەوە بۆ ماڵەوە بیست تا سی کیلۆمەترە و بەچی ئەو ماوەیەم بڕیوە؟ بە پێیان؟ یان بە ئۆتۆمۆبێل؟ یا بە فڕین؟ نایەتەوە بیرم سواری ئۆتۆمۆبێل بووبم ، خۆ باڵیش ناگرمەوە ، بە پێیان هاتوومەتەوە ، بەلاّم چۆن لەو بێ ئاگاییەدا ڕێگەم لێ ون نەبوو ؟ نازانم ؟ چۆن هەستم بە ماندوبوونی ڕێگا نەدەکرد ؟ دیسان نازانم...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سبەینێ کورتە شانۆکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ قوتابخانە و دایەوە دەستی " یوسوف " و دەستخۆشانەی لێ کرد و هەموو سەرنجەکانی خۆی دەربارەی شانۆکە پێ ڕاگەیاند...

هەموان کۆبوونەوە و بۆ پرۆڤەکردنی کورتە شانۆکە رۆژێکیان بڕیاردا...

" یوسوف" ڕۆڵەکانی دابەش کرد و هەر کەسە و دەقی تایبەت بە خۆی دایەدەست تاکو خۆیانی بۆ ئامادە بکەن ، شوێنی پرۆڤەکە باخەکەی ماڵی " ڕاز " بوو ، بۆ کاتی یەکتر بینیان ئێوارەی ڕۆژی سێ شەممەیان دانا...

ئەو ڕۆژە دوای دەوامی قوتابخانە سەرقاڵی لەبەر کردنی ئەو دەقە بوو کە " یوسوف " بەوی دابوو تاکو بۆ پرۆڤەکە خۆی ئامادە بکات ، ڕۆڵی بولبول ( ڕاوێژکاری یاسایی پادشا ) تا ڕادەیەك ئاسان بوو ، وای هەست دەکرد ڕۆڵەکە بەو دەخوات و جۆرێك لە هەماهەنگی لە نێوان کەسایەتی " بولبول " و " ڕاز " دا هەیە...

لە ژوورەکەیدا بیری لە ڕۆڵی " بولبول " و بەدیهێنەری ڕۆڵەکە ، واتە " شانۆنووس " دەکردەوە ، " یوسوف " بەدیهێنەری شانۆکە و ڕۆڵەکەیە ، " بولبول " کارەکتەری ناو شانۆکەیە و " ڕاز " یش کە ڕۆڵی " بولبول " دەبینێت " ئەکتەر " ی ڕۆڵەکەیە...

" یوسوف "، " بولبول "، " ڕاز "، واتە ( نووسەر ، کارەکتەر ، ئەکتەر ) ، " کاراکتەر " لە بوونی نووسەرەوە سەرچاوە وەردەگرێت ، واتە بوونی کاراکتەر وابەستەی بوونی نووسەرە ، ئەگەر نووسەر بوونی نەبێت شانۆ و کاراکتەریش بوونی نابێت ، ئەکتەریش ڕۆڵی بێ گیان و مردوو زیندوو دەکاتەوە ، ئەکتەر ڕۆح بە کارەکتەر دەبەخشێت ، ئەو زەمەنی ئێستا سفر دەکات و ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە بۆ ئەو ساتە وەختانەی کە ڕوویان داوە ، یان بە پێچەوانەوە زەمەنی ناو دەقی شانۆ لە ئێستادا زیندوو دەکاتەوە ، ئەکتەر دەبێت بە بوونێك کە بەشێکە لە نووسەر و بەشێکیش نی یە لە نووسەر ، بەشێکە لە نووسەر، چونکە ڕۆڵی کارەکتەرێك دەبینێ کە لە نووسەرەوە هەڵقوڵاوە، بەشێك نی یە لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نووسـەر ، بـەڵکو ڕۆح بـە شـتەکانی نووسـەر دەبەخشێت ، چـونکە ئـازادە لـە هەڵبژاردنی جۆری ڕۆڵەکاندا ، ئەو دەتوانێ ڕۆڵی بولبول ببینێ ، دەتـوانێ ڕۆڵـی پاساریەکی ناپاکیش هەڵبژێرێ ، لە سەرێکی ترەوە هەمیشە ئـەو ڕۆڵـەی وەری دەگرێت بەو جۆرە نمایشی دەکـات کـە خـۆی دەیـەوێ و تـێ ی دەگـات و لێ ی دەزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت گەر ڕۆڵی " بولبول " ی وەرگرتبێـت ڕۆڵـی " گاجووت " نمایش بکات ، واتە بە ناوی ڕۆڵـی "بولبـول"ە وە ڕۆڵـی "گـاجووت" ببینێـت ، چـونکە لـەو بـارەدا لـە چـەقی دەقەکـە لای داوە ، بـەڵکو ڕۆح و حەقیقەتی دەقەکەی تیا بردووە...

نووسەر بە دیاری کردنی ئاراستەی ڕۆڵەکان ئەکتەر سنووردار دەکات ، من لە ناو ڕۆڵی "بولبول"دا ناتوانم ڕۆڵی "کەروێشك" ببینم ، چـونکە ئاراسـتەی ڕۆڵـی بولبول ڕوون و ئاشکرایە...

نووسـەر گیـان دەکـات بـە بـەر ئەکتـەردا لـە ڕێگـەی ئـەو ڕۆڵـەی کـە پـێ ی دەبەخشێ ، ئەکتەریش جووڵە و گیان بە کارەکتەرەکانی ناو شانۆکە دەبەخشێ ، گەر لە گۆشەیەکی ترەوە سەرنج بدەین: ئەکتەر بوونێکی سەربەخۆی هەیـە و لە گەمەیەکی شانۆیی دا ڕۆڵی کارەکتەرێك دەبینێ، واتە من "ڕاز" بولبول نیم ، من " ڕاز " م ، بەڵام خۆم دەکەم بە "بولبول "، لە ڕاستی دا ڕۆڵی " بولبـول " بەشێکی زۆر کەمە لە تەمەن و ڕۆڵەکانی " ڕاز "، لە شانۆیەکدا ڕۆڵی " بولبول" دەبینم لەوانەیە لە شانۆیەکی تردا ڕۆڵی پیاوێکی دز ببینم...

کارەکتەر نەمرە و هەتا مرۆڤ بوونی هـەبێ ئـەویش لـە نـاو شـانۆکەدا بـوونی هەیە ، هەتا مرۆڤ مرۆڤ بێت " ماکبێس " کارەکتـەری شـانۆگەری " مـاکبێس " ی نووسەری ئینگلیزی "شکسبیر"ە . کارەکتەر نەگۆڕە ، بەڵام ئەکتـەر گـۆڕاوە ، لە سەردەمی نووسینی شانۆگەری "ماکبێس"ەوە تاکو ئێستا لەوانەیە دەیـان " ئەکتەر " ڕۆڵی "مـاکبێس"ی بینیبێـت ، بـەڵام کارەکتـەری "مـاکبێس" هـەر "ماکبێس"ە و نەگۆڕاوە....)

" سبەینێ لە وانەی ئایین دا مامۆستا وانەکەی تەرخان کرد بۆ پرسـیارەکەی " ڕاز " کە لە ڕۆژی پێشوتردا لە مامۆستای کرد و زەنگی بشوی بە سەردا هـات ،

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"ڕاز" پرسیارەکەی دووبارە کردەوە و وتی: (ئایین چ ڕۆڵێکی هەیە لەو ململانێ ی دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و غەریزەکانی لە لایەکەوە و مرۆڤ و کۆمەڵگە لە لایەکی ترەوە؟)

مامۆستاپرسیارەکەی "ڕاز" ی ڕووبەڕووی قوتابییەکان کردەوە ، یەکێك لە قوتابییەکان هەستا و وتی: ( ئایین دژ بە غەریزەکانی ئێمەی مرۆڤ دەوەستێتەوە ، مرۆڤیش کەوتۆتە نێوان مومارەسەکردنی حەز و چێژی غەریزەکانی و هەڕەشەی ئایینەوە ، مرۆڤ یان دەبێ بە گوێ ی حەزەکانی بکات یان بە گوێ ی ئایین ، واتە یان دەبێ گوێڕایەڵی خۆی بێت یان ملکەچی خودا ، لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا ڕێگای مام ناوەند بوونی نی یە ، یان خۆت یان خودا ، یان چێژ و بەختەوەری یان ئازار و دڵەڕاوکێ...)

مامۆستا: ( قسەکانت سەرنج ڕاکێشن ، من وەك مامۆستا چ جای قوتابی بەو بۆچوونانە سەرسامم ، بەڵام ورد کردنەوەی مەبەست و مەرامی قسەکان بۆ هەموومان پێویستە...)

قوتابیەکی تر: ( ئەگەر ئێمە خودا دروستی کردووین غەریزەکانیشمان ئەو دروستی کردووە ، خودا کاری ناپەسەند و ناجوانی لێ ناوەشێتەوە ، بۆیە هەموو غەریزەکانی ئێمەی مرۆڤ چاك و پاکن و نابێ بە شەڕەنگێز و نەفرەت لێکراو تەماشایان بکەین...)

مامۆستا: ( ئەم قسەش بە قەدەر ئەوەی پێشوو جوان و سەنگینە...)

شاروخ: ( من دەڵێم ئەم جەنگە خوێناویەی نێوان مرۆڤ و غەریزەکانی مرۆڤ کۆمەڵگە خولقاندوویەتی ، ئەگینا لە بنچینەدا هەموو غەریزەیەك لە مرۆڤدا بۆ کارپێکردن ڕوواوە ، بەڵام کۆمەڵ دێت و ڕشتەیەك بەها و کلتور بە سەرماندا دەسەپێنێ و ناچارمان دەکات دەستبەرداری حەزەکانی خۆمان ببین و غەریزەکانمان لەغاو بکەین و بیانپەرچێنین ، لە وڵاتانی خۆرئاوادا ئەم جەنگە خوێناوییە بوونی نییە، مرۆڤ ئازادانە مومارەسەی حەزەکانی خۆی دەکات...)

مامۆستا: ( ڕایەکی باش و ماقوولە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

قوتابییەك كە لە ڕیزی ناوەڕاست و لە پێشەوە دادەنیشت دەستی هەڵبڕی و وتی: ( ڕاستە لە بنچینەدا غەریزەكان شەرعییەت لە بوونیاندا هەیە ، بەلاَم ئەو غەریزانە هەڵچوون و داچوونیان تیادا هەیە و دەبێ سیستم و یاسای بۆ دابنرێ و چوارچێوەیەك بۆ غەریزەكان دیاری بكرێت..)

قوتابییەكی نوكتەباز و قسەخۆش: ( ئەو چوارچێوانە پشتی ئێمەیان شكاندووە ، كە لە ماڵەوە هەڵدەكەمە سەر بانەكەمان باوكم بە بڵتە دەمهێنێتە خوارەوە و دەڵێ : سەگی سەگباب دەخوێنی یان سەیری كچەتیوەی گەڕەكم بۆ دەكەی؟!)

هەموو پۆلەكە دایە قاقای پێكەنین و مامۆستا تكای كرد لە قوتابیەكە نوكتەكانی بۆ كاتێكی تر هەڵ بگرێت...

پاشان مامۆستا ڕووی كردە هەموان و وتی: ( هەموو ڕایەكان جێگەی دەست خۆشی یە بەوەشەوە كە هەموانی هێنایە پێكەنین ، ئایین باوەڕی وایە مرۆڤ دارای ویست و ئیرادەیە ، خودا دوو هێزی لە ناخی مرۆڤدا ڕوواندووە كە هێزی " چاكە " و هێزی " شەڕەنگێزی"یە، بە هێزی شەڕەنگێزی – یاخود بە بوونی ئامادەیی بۆ خراپە كردن – دەتوانێت گەورەترین كاولكاری لە ژیان و گەردوون دا بەرهەم بهێنێ ، هەر بەو جۆرە بە هێزی چاكە دەتوانی ئاوەدانی و چاكە و سەعادەت دروێنە بكات...

مرۆڤ – بە تێڕوانینی ئایین – دەبێ خۆی لە بەشی شەڕەنگێزی پاكژ و پاك بكاتەوە و گرنگی و پەروەرش بە بەشی چاكە بدات ، گەورەترین سەعادەت لەو ساتەدایە كە دەرەوە و ناوەوەی مرۆڤ دەبێ بە یەك ، هەماهەنگی لە نێوان حەز و مومارەسەدا پەیدا دەبێت ، قسە و گوفتاری یەك دەگرنەوە ، لە دەستەكەی ترەوە تاڵترین و دژوارترین ژیان ژیانی كەسێكە دەرەوەی شتێك بێ و ناوەوەی شتێكی تر ، ئایین دێت و ئەو ناهاوسەنگی و دۆزەخ و دژوارییەی نێوان ناخی مرۆڤ و شاخی مرۆڤ ، نێوان پەنهان و ئاشكرای مرۆڤ هەڵ دەگرێت و چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە ، ئەگەر ئایین تەنها فەرمان كردن بێت بە جڵەوكردنی حەزەكان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

و غەریزەکان – بە بێ خستنە ڕووی چارەسەرێك– ئەوە دۆزەخی بۆ مرۆڤ خولقاندووە ، بەڵام ئایین پرۆسەی

" پاکژبوونەوە " دەکات بە بەدیل...

یوسوف: ( پرۆسەی پاکژبوونەوە چی یە؟)

مامۆستا: ( پرۆسەی پا...... کژبوونەوە....)

لێرەدا زەنگی پشوو لێدرا وباسەکە بە کراوەیی بۆ کاتێکی نەزانراو دواخرا....

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

- ٦ -

# ژیانێکی سادە و فەلسەفەیەکی مەزن

دوای تـــەواوبوونی دەوامـــی ئـــەو ڕۆژەی قوتابخانـــە " راز " لەگـــەڵ چـــەند هاوڕێیەکـــدا ســـەرێکی کتێبخانـــەی نـــاو قەیـــسەریەکەیان دا و چـــاوێکیان بـــە کتێبەکاندا گێڕا ، " ڕاز " ڕۆژنامەیەك و یەك دوو گۆڤار و ڕۆمـانی "چاوەکانی " ڕۆماننووسی مەزنی ئێرانی " بوزرگی عەلەوی " کڕی...

بۆ ژەمی نیوەڕۆ داپیرە چاوەڕوانی بوو کە گەڕایەوە ماڵـەوە داوای لێبـوردنی لە داپیرە کرد و لە دواکەوتنەکەی تێ ی گەیاند ، داپیرەی لە کـاتی نانخواردنـدا پێ ی وت : ("سێبەر خان" تەلەفونی کرد)

ڕاز: ( خێر بوو ؟! )

داپیرە: ( داوای لێکردین شەوی هەینی لە ماڵی ئەوان بین...)

ڕاز: ( یانی دەعوەت بین؟ جا چی لەوە خۆشترە..؟! )

داپیرە: ( دەزانم پێت خۆشە ، بۆیە پێم ڕاگەیاندی...)

ڕاز: ( ئەی مەگەر تۆ پێت خۆش نی یە ؟)

داپیرە: ( چۆن پێم خۆش نی یە ، بەلاّم تۆ زۆر زۆرت پێ خۆشە...)

ڕاز: ( داپیرە گیان ڕاست دەکەی من زۆر زۆرم پێ خۆشە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

داپیرە: ( کەوابوو خۆشییەکەی من دوو خۆشی یە ، خۆشییەك کە خۆم پێم خۆشە ، خۆشییەك کە دەبینم تۆ پێت خۆشە...)

ڕاز: ( داپیرە گیان خوا بۆ منت بهێڵێ...)

داپیرە: ( کوڕم کەس بۆ کەس نامێنێ ، هەمووی ماوەیەکە و دواتر لە یەکتر دادەبڕێین )

ئەو قسەی کۆتایی زۆر بە حوزنەوە کرد ، وشەکانی بۆنی ترسی مەرگی لێ دەهات...

" ڕاز " کە بینی ترسی مەرگ داپیرەی داگیر کردووە پاروەکەی بۆ قووت نەدەدرا ، بۆ دڵدانەوەی ئەو وتی: ( داپیرە گیان ئیشەڵڵا بە یەکەوە دەژین و بە یەکەوە دەمرین )

داپیرە: ( خوا نەکات کوڕی خۆم ، یاخوا لە دوای من " دووسەد " ساڵ تەمەنت بێت )

دوا نیوەڕۆ تا نزیکی عەسر لە ژوورەکەی خۆیدا نووست ، لە دوای عەسر چوو بۆ ناو باخەکە ، لە ناو جۆلانەکەدا بە کزی لێ ی دانیشت ، هێشتا کاریگەری قسەکانی داپیرە کە نیوەڕۆ بۆی کرد لەسەری نەسڕا بوویەوە ، لە ناو جۆلانەکەدا کەوتە بیرکردنەوە لە " مەرگ و ژیان" (ئایا مرۆڤ ناتوانێ نەمرێت؟ چارەسەرێك نی یە بۆ مەرگ؟ بۆ دەبێ مرۆڤ بمرێ؟ مردن چ مانایەکی هەیە؟ بۆ هەندێ کەس زۆر دەژی و هەندێکی تر کەم؟ ئای کە پرسیار زۆرە و مرۆڤ بیری لێ ناکاتەوە! وەی لەو هەموو لوغز و نهێنی و بێ وەڵامییەی مرۆڤ گیرۆدەی بووە! یاسای مردن زۆر بێ بەزەییە ، بیر ناکاتەوە لە گریان و دڵشکانی ئازیزان بۆ یەکتری ، ئەگەر مەرگ بە قەدەر سەرە دەرزییەك بەزەیی هەبێت من و داپیرە لە یەکتر ناکات..)

باخەوانە پیرەکە بیری مۆتەکەی مەرگی لە سەر ڕەواندەوە و سڵاوێکی لە " ڕاز " کرد...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( سەلام " خاڵە مەولود" ، با کورسییەکت بۆ بهێنم و تاوێك پێکەوە دابنیشین؟)

باخەوانەکە: ( پێت خۆشە؟)

ڕاز: ( بەڵێ، ئەگەر تۆ پێت خۆش بێت؟)

باخەوانەکە بە دەستی خۆی یەکێك لە کورسییە پلاستیکیەکانی ناو چیمەنەکەی هێنا و بەرانبەر بە جۆلانەکە داینا و " ڕاز " کەوتە پرسیارکردن لە " خاڵە مەولود ": ( خاڵە تۆ لە مردن ناترسی؟)

باخەوانەکە: ( نەخێر...)

ڕاز: ( چۆن ناترسی؟!)

باخەوانەکە: ( بۆ بترسم؟!)

ڕاز: ( بترسە لە ئازاری مەرگ ، لە ژیان بەجێ هێلاّن ، لە دابڕانی خۆشەویستان و ئازیزان ، لە نادیاری سەرئەنجامی مەرگ..)

باخەوانەکە: ( من تەنها کەسێکم دەمرم یان هەموو مرۆڤێ دەبێ بمرێ؟)

ڕاز: ( هەموو مرۆڤێ دەبێ بمرێ...)

باخەوانەکە: ( کەس دەتوانێ ڕۆژی مردنی خۆی دوابخات؟)

ڕاز: ( نەخێر )

باخەوانەکە: ( کە هەموومان دەمرین و کەس ناتوانێ وادەی مردن دوابخات ، ئیتر لە چی بترسم؟!)

ڕاز: ( لەوەی دوای مردن دەست پێدەکات بترسە..)

باخەوانەکە: ( پاش مردن یەکێکە لەم دووانە: یان دەبینەوە بە خۆڵ و ژیانێکی تر بوونی نی یە ، لەم بارەدا هەر کە مردین ئازار کۆتایی پێ دێ و هەست بە هیچ جۆرە خەم و مەینەتییەك ناکەین ، یان ژیانێکی تر بوونی هەیە ، ئەگەر هەبوو ئەوە دەبێ بەختەوەری و کلۆڵی بە پێ ی کردارەکانی ژیانی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دونیامان بێت ، بۆ ئەمەشیان من بە درێژایی تەمەنم پیاوێکی هەژار و کەم دەست بووم ، زەرەر و زیانم — نە بە دەست و نە بە زمان — بۆ هیچ کەس نەبووە ، بەو ژیانە کەمەی هەمبووە قەناعەتم کردووە ، ئیٚ خۆ خواش بەڕەحم و بە بەزەیی یە ، ئیتر بۆ دەبیٚ لە مردن بترسم ؟!)

ڕاز: ( خۆزگەم بە خۆت " خاڵە مەولود " وا بە سادەیی و دروستی لە ژیان و مەرگ تێگەیشتووی...)

باخەوانەکە: ( خاڵە گیان ئەوەندە قوولٚ بۆ ژیان دامەچۆ ، سادە سەیری شتەکان بکە ، ژیان سادەیە...)

" ڕاز " لە حیکمەت و زانایی باخەوانەکە سەری سوڕما بوو ، بیری دەکردەوە: ( تێگەیشتن لە ژیان بە خوێندەواری و بڕوانامە نی یە ، ئەم پیرەمێردە نەخوێندەوارە زۆر دروست لە ژیان حاڵی بووە ، بەو حاڵی بوونەش سەعادەتی ژیانی بە دەست هێناوە...)

پاشان دەنگی هەڵبڕی و وتی: ( باشە " خاڵە مەولود " کە دەبینی خەڵکی دەوڵەمەندن و تۆش هەژاری دڵگران نابیت ؟)

باخەوانەکە: ( کوڕی خاڵۆی ، گەر دوو کەس یەکێکیان " سەد" کۆشکی هەبیٚ و ئەویتریان کۆڵیتێکی هەبیٚ سکیان بە قەدەر یەکترە)

ڕاز: ( بەڵام خاوەن کۆشکەکە خواردنی خۆشتر دەخوا و لەوانەیە زیاتر بکاتە سکییەوە)

باخەوانەکە: ( ڕاست دەکەی ، بەڵام کە هەردووکمان تێرمان خوارد من لە نانە ڕەق و ئەو لە لاقە مریشك دیسان یەکسان دەبینەوە ، لەوانەشە من باشتر بم ، چونکە ئەو لەبەر ئەوەی خواردنەکەی خۆشە زۆر دەکاتە ورگییەوە و پاشان پیٚ یەوە گیرۆدە دەبێت ، بەڵام من هەر ئەوەندەم بۆ دەخورێت ئازاری برسێتیم لە کۆڵ بکاتەوە...)

ڕاز: ( ئەی سەیارە و ماڵ و ڕێزی خەڵك و پارە و پووڵی زۆر و ئافرەتی جوان چی لیٚ دەکەی؟!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

باخەوانەکە: ( دروستە ، دەوڵەمەند هەموو ئەوانەی هەیە ، بەلاّم ئەوانە هەمووی خۆشی و چێژی ڕووت نین ، هەریەکەیان دەیان گۆبەندی بە دواوەیە ، ئەگەر ڕێزی خەڵکی بۆ من بە هۆی دەوڵەمەندی و پارە و پووڵەوە بێت گێلێتی یە گەر دڵم پێ ی خۆش بێت ، خەڵکی عاشقی پارە بووە نەك عاشقی من ، ڕێزێك ڕێزە بۆ من بێت نەك بۆ پارەکەی من ، بۆیە کە پارەکەت بە دەستەوە نامێنێ و دەچێتە دەستی کەسێکی ترەوە خەڵکی ڕێزەکەت لێوەردەگرنەوە و دەیدەن بەو کەسەی پارەکەی لە دەستدایە ، ئەمەش گەورەترین غەم لای مرۆڤ دروست دەکات .. مرۆڤ هەرچەندی لە دونیا هەبێت تێری لێ ناخوات ، ڕۆژێك ، ساتێك نی یە بڵێ ئۆخەی دونیا تاسەم لێت شکا ، گەر تێر خواردن هەبوایە زۆرینەی دەوڵەمەندەکان وازیان لە کارو کاسپی و بازرگانی دەهێنا ، چونکە ئەوەندە سامانیان هەیە بەشی هەزارساڵی تەمەنیان بکات ، بەلاّم بۆ واز ناهێنن؟ چونکە تینوێتیان لە دونیا نەشکاوە...

مرۆڤ تا زۆری هەبێت زیاتر ژیانی لا شیرین دەبێ و ڕقی لە مردن دەبێتەوە ، بەلاّم دەبێ ڕۆژێك بێت ئەو و دونیا خواحافیزی لە یەکتری بکەن ، ئەگەر دەوڵەمەندەکە بە ئەقڵ و وریایی خۆی نەهێڵێ دونیای لە دەست دەربچێ و خۆی لە زەرەر و زیان بپارێزێ ، ئەوا بە ناچاری لە کۆتاییدا دەبێ ئەو لە دەستی دونیا دەربچێت و مردن دەرگای پێ بگرێت...

جا کوڕی خاڵۆی پیاو باری سووك بێت باشترە یان گران؟ ئەگەر دەوڵەمەند بیت یان دونیا لە دەستی تۆ دەردەچێ یان تۆ لە دەستی دونیا دەردەچیت ، بەلاّم بابای هەژار و ژیان سادە زۆر دۆستایەتی لەگەڵ دونیادا نەبووە تا بیر لە جیابوونەوەی ئازاری بدات ، ئەو پیرەمێردەی کچێکی حەڤدە ساڵ بە هاوسەری خۆی دەکات هەر کاتێك بیر لە جیابوونەوەی دەکاتەوە دونیایەك ئازار دەچێژێ ، بەلاّم ئەو پیاوە لاوەی بە پیرەژنێکەوە گیرۆدە بووە چاوەڕوانی ڕۆژی دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە دەکات ، ئەمەش نموونەی دەوڵەمەند و هەژارە لەگەڵ دونیادا )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ڕاز " زۆر بە قووڵی لە فەلسەفەی قسەكانی " خاڵە مەولود " ڕاما بوو: ( پیاوێكی سادە و فەلسەفەیەكی قووڵ ، فەلسەفەیەك ئەزموونی ژیان فێری كردووە ، ژیان تاقیگەیەكی گەورەیە و مرۆڤ زۆر مانای وردی تیادا بە دەست دەهێنێ ، تەجروبە مامۆستایەكی گەورەیە..)

باخەوانەكە: ( بیر لە چی دەكەیتەوە؟)

ڕاز: ( لەو هەموو ئەزموونەی كە ژیان فێری كردووی...)

باخەوانەكە: ( تۆش دەتوانی ئەزموونەكانی ژیان فێر ببیت)

ڕاز: ( لە تۆوە؟)

باخەوانەكە: ( نا ، لە ژیانەوە ، من بەشێكی زۆر بچووكم لە ژیان)

داپیرە لێیان نزیك بوویەوە و پێ ی وتن: ( لە بن كەپری مێوەكە "چا" م ئامادەكردووە ، وەرن لەوێ دابنیشین..)

" ڕاز " داوای لە " خاڵە مەولود" كرد بچن بۆ ژێر كەپرەكە...

خاڵە مەولود پێ ی وت: ( تۆ بڕۆ منیش دێم ، با سەیرێكی دار هەنارەكان بكەم )

پاش كەمێك چاو خشاندن بە باخەكەدا بە گشتی و هەنارەكان بە تایبەتی "خاڵەمەولود"ی باخەوان ڕۆیشت بۆ لای " ڕاز " و داپیرەی و ڕووی كردە پوورە " فاتم"و وتی: ( خوشكە "فاتم" شوكر بۆ خودا كوڕەكەت ئاقڵ و تێگەیشتووە )

داپیرەی ڕاز: ( كاكە مەولود ، ئومێد دەكەم " ڕاز " وەجاخی بنەماڵەكەی ڕۆشن بكاتەوە و نەهێڵێت ئاگرمان بكوژێتەوە)

باخەوانەكە: ( خودا بۆت بهێڵێ و ساڵحی بكات ، بەڵام كارەكانی خودا سەیر و سەر سوڕهێنەرە ، پێدەچێت ئەم گەنجە جوانە وەجاخی بنەماڵەی گەورە و كەسی مەزن ڕۆشن بكاتەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لەم قسەی " خاڵە مەولود " نە "ڕاز " و نە داپیرەی باش حاڵی نەبوون ، وا لێکیان دایەوە مەبەستی بنەماڵەکەی "وەستا مەحمود" ە، بەلاّم لە ڕاستیدا "خاڵە مەولود" پەی بە نهێنییەك برد بوو کە لە داهاتوودا پەردەی لەسەر لا دەدرێت...

ڕاز: ( "خاڵە مەولود" بۆچی مرۆڤ حەز دەکات لە دوای مردنی کەسێك لە دووی بەجێ بمێنێ و ناو و نیشانی لە بیر نەچێتەوە؟)

باخەوانەکە: ( گیانی "خاڵۆ مەولود" ، کاتی خۆی ماڵمان لە لادێ بوو ، من ئەو کاتە گەنجێك بووم تازە پێدەگەیشتم ، مەلایەکی زانا و خواناسمان هەبوو خەڵکی گوندەکە دوای عەسران لە دەوری کۆ دەبوونەوە و پرسیاریان دەربارەی هەموو شتێك لێ دەکرد ، لە بیرمە ڕۆژێك پرسیارێکی لەم جۆرەی لێ کرا و لە وەلاّمدا وتی: مرۆڤ حەز دەکات نەمرێت ، حەزی بە ژیانی نەمری و هەتا هەتایی یە ، کە دەبینێ بە ناچاری دەبێت بمرێت ، ئەو کات بیر دەکاتەوە لەوەی هاوشێوەیەك لە جێگەی خۆی دابنێت ، تاکو بەردەوامیی بە ژیان و کاروبارەکانی ئەو بدات ، نزیکترین هاوشێوە بۆ مرۆڤ بریتییە لە ڕۆڵە و وەچەکانی ، بۆیە حەزی بە منداڵە و نایەوێ ئاگری ژیانی بکوژێتەوە...

هەمان بیرکردنەوەیە وا لە مرۆڤ دەکات حەز بکا لە دوای خۆی ناوی چاك و پاکی هەبێت ، ئەو نایەوێ بە مردنی شوێنەوارەکانیشی لە ژیاندا بسڕێتەوە ، منداڵ و ناو و شوێنەواری باش وێنەیەکن لە ئەو و بەردەوامی بە ژیانی ئەو دەدەن )

ڕاز: ( نەبوونی کوڕ و کچ بۆ تۆ گران نی یە؟)

باخەوانەکە: ( هەندێ جار با ، سەختە ، بەلاّم دڵنەوایی خۆم بە شتی تر دەدەمەوە )

ڕاز: ( وەکو چی ؟)

باخەوانەکە: ( من پاکێتی و چاکە خوازی شاڕێگەی ژیانمە ، بۆیە هەموو پاك و چاکێك بە نەوە و ڕۆڵەی خۆم دەزانم ، لە دوای مردنی من چاکان هەر دەمێنن

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

، ئەوەی من بۆی دەژیام و ئاواتم بوو ئەوان لە سەری بەردەوام دەبن ، ئـەوەش وەك ئەوە وایە خۆم لە ژیاندا بم ، چی بكەم لە ڕۆڵەیەك لە دوای خۆم نەفرەتم لێ بكات و بە گێل و نـەفامم بزانـێ ؟! ئـەو كەسـەی ڕێگـەی چـاكان دەگرێتـە بـەر جگەرگۆشەی منە...)

باخەوانەكە سەری داخست و پەردەیەك لە حوزن بە دەم و چاو و ڕووخساری دا كێشرا...

" ڕاز " و داپـیرەی هەسـتیان بـە فرمێـسكەكانی ژێـر عەینەكەكـەی "خاڵـە مەولود " كرد و هەر زوو باسەكەیان گۆڕی...

داپیرە: ( كاكە "مەولود " گیان ، با چایەكی ترت بۆ تێ بكەم؟)

باخەوانەكە: ( خوشكە فاتم ، تێی بكە...)

ڕاز: ( خاڵە مەولود ، دار هەڵوژەكان ئەو ساڵ بەری باشیان گرتووە ! )

باخەوانەكە: ( بە پێ ی تەجروبەی پێشینانمان ئەو سـاڵ دەبـێ درەخـت پـڕ بەر بێت )

پاش كەمێكی تر دانیشتن ، " ڕاز " مۆڵـەتی لـە داپـیرە و " خاڵـە مـەولود " وەرگرت و ڕۆیشت بۆ ژوورەكەی...

حـوزنی قـووڵی داپـیرە و باخەوانەكـە — لەگـەڵ بـاس و خواسـی مەرگـدا— مانایەكی تـری دەبەخـشی ، " ڕاز " بـۆ دۆزینـەوەی ئـەو مانایـە لـە ژوورەكـەی خۆی ڕاكشا و كەوتە بیركردنەوە: ( گەشتی تەمەنی مرۆڤ بە چەند وێستگەیەكدا تێ دەپەڕێت ، بەجێ هێڵانی هەر وێستگەیەك دەبێتە مایەی ئازار و غوربەت ... ڕەحمی دایكمان بەجێ دەهێڵین بە گریان پێ دەنێینـە وێـستگەی سـەر زەوی ، زەوی بەجێ دەهێڵین ئازار و گریان بـۆ دەوروبـەرمان دروسـت دەكـەین.. ژیـانی سـەر زەویمـان چـەندین وێـستگەیە : منـداڵی ، لاوێتـی ، كامـڵ بـوون ، پـیری ، ئەفتادەیی و پاشانیش مەرگ ، مرۆڤ لە هەر وێـستگەیەكدا بـیر لـە وێـستگەكانی پێشتری خۆی دەكاتەوە ، هەست بە غوربەت دەكات و ئاهو حەسرەتی بۆ هـەڵ دەكێشێ ، كـۆی ژیـانی مـرۆڤ ترازیدیا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خولقاندووە... ئەو كە هێنراوەتە سەر شانۆی ژیان پرسی پێ نەكراوە ، كە لەم شانۆیەش دا ڕۆڵی تەواو دەبێت دیسان بە ویست و حەزی ئەو نی یە ، تەمەنی مرۆڤ لە نێوان دوو نەویستراودایە...)

سبەینێ لە قوتابخانە برادەران كورتە شانۆكەی " یوسوف " یان هێنایەوە بەر باس ، كات و شوێنی بە یەكتر گەیشتنەكەیان بۆ پرۆڤەكردن بیری یەكتر هێنایەوە...

ئەو ڕۆژە ئیدارەی قوتابخانە بڕیاری پشكنینی سەرجەم پۆلەكانیان دابوو ، چونكە ماوەیەك بوو چەند دیاردەیەكی دزێو لە قوتابخانەكەیان سەری هەڵدا بوو ، وانەی "بیركاری" یان هەبوو ، لە ناكاو بەڕێوەبەر و "دوو" یاریدەدەرەكەی بە پەلە خۆیان بە ژووردا كرد ، هەموو قوتابیان هەستان و بەڕێوەبەر داوای كرد كەس دانەنیشێتەوە ، پاشان فەرمانی بە یاریدەدەرەكانی كرد دەست بە پشكنینی گیرفانی قوتابیان و ناو مێزەكان بكەن...

قوتابییەك هەڵیدایە و وتی: (مامۆستا ئەمە پۆلە یان گرتووخانەیە؟)

بەڕێوەبەر: ( ئەمە پۆلە ، بەلاَم ئێوە ناچارمان دەكەن وەكو بەندیی مامەڵەتان لەگەڵ بكەین...)

قوتابیەكی تر: ( چۆن دەبێ لە سەر چەند قوتابییەكی یاسا بەزێن هەموو قوتابخانەكە سووكایەتی پێ بكرێت؟!)

بەڕێوەبەر: ( سەرەتا بزانە چەند قوتابییەك نی یە ، بەڵكو ژمارەیەكی زۆرە لە قوتابی ، دووەم حەز ناكەم وشەی سووكایەتی بۆ ئەم كارە بەكار بهێنی ، چونكە ڕێگایەكی تر شك نابەین یاسا شكێنەكانی پێ بناسینەوە جگە لە پشكنین )

ڕاز: ( ئەو كارانە چین ناوی یاسا بەزێنی لێ نراوە؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەڕێوەبەر لە سەر مێزێك عەلاگەیە شتی سەیر و سەمەرەی هەلّڕشت و وتی: ( ئەم شتانە لە پۆلەکەی ئەو دیو گیراون: خەنجەر بۆکس — پاکەتی جگەرە — ئەلّقە و ئەنگوستیلەی زێڕ — کاسێتی گۆرانی — وێنەی کچە هونەرمەندە جیهانی یەکان — تەزبێح — زنجیری دەست و مل — چەقۆ — دەرنەفیز — دەستەیە دۆمینە ، پاشان زەرفێکی بەرز کردەوە و وتی: ( مەپرسن چی لەم زەرفەدایە )

زۆربەی قوتابیان: ( چی لەو زەرفەدایە ؟! )

بەڕێوەبەر: ( من وتم مەپرسن ، بەلاّم با بزانن ناو ئەم زەرفە گۆڤارێکی سێکسی یە کە هەرچی ئابڕو غیرەت و مرۆڤبوونە تیای دا نییە.. )

قوتابی یە قۆشمەکە: ( مامۆستا بۆ نیشانمان نادەی بۆ ئەوەی هەریەکە و تفێکی تیّ بکەین... )

پێکەنین بە ڕووخساری بەڕێوەبەرەوە دەبینرا ، بەلاّم بۆ نیشاندانی هەیبەت و دەسەلاّتی ئیدارە بە پەلە ئەوەشی لە ڕووخساری دا سڕیەوە و وتی: ( بە ڕای ئێوە ئیدارە قوتابی ناچار بە پشکنین دەکات ، یان قوتابی ئیدارە ناچار دەکات؟! )

پۆلەکە بێدەنگ بوو ، کەسێك نەبوو بتوانیّ وەلاّم بداتەوە ، چونکە ئەو شتانەی لە پشکنیندا گیرا بوون هەندێکیان بۆ قوتابی و قوتابخانە ناشایستە بوون ، یەکێك لە یاریدەدەرەکان قەلّەمێکی سووراوی لە گیرفانی قوتابی یەکی کوڕدا دەرهێنا و هەر زوو بە زوو لە ناو لەپی دەستیدا ونی کرد ، بۆئەوەی قوتابییەکانی تر پیّ ی نەزانن...

بەڕێوەبەر وتی: ( ئێمە لە ئێوە پرسیار دەکەین : بۆ دۆزینەوەی ئەم دیاردە دزێوانە جگە لە پشکنین ڕێگایەکی تر پیّ شك دەبەن ؟)

ڕاز: ( بەلّیّ... )

بەڕێوەبەر بۆ دانیشتنەوە فەرمووی لە هەموو قوتابیان کرد و پاشان ڕووی کردە " ڕاز " و وتی: ( ئەو ڕێگەیە کامەیە ؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( پەروەردە و ڕۆشنبیرکردن و تێگەیاندن...)

بەڕێوەبەر: ( بە ڕای جەنابت ئێمە بە کاری پەروەردە و ڕۆشنبیرکردن هەڵ نەستاوین؟! )

ڕاز: ( ئەگەر پەروەردەیەکی دروست و پرۆسەیەکی ڕۆشنبیری فرە ڕەهەند بوونی هەبوایە ناوەندی خوێندن وەك دەلاڵخانەی لێ نەدەهات ، مامۆستا گیان ئەو شتانەی بەڕێزت لە ناو ئەو عەلاگە و زەرفەت ناوە شتی ناوەندی خوێندن نین ، ئەوانە کۆمەڵە شتێکن لە دەلاڵخانە دەفرۆشرێن ، ئێستا من پرسیارەکە لە بەڕێزت دەکەم: ئێمە لە دەلاڵخانەداین یان لە ناوەندی خوێندن دا ؟! )

بەڕێوەبەر هەندێ بە تورەیی یەوە: ( ئێرە ناوەندی خوێندنە ، گەر مرۆڤی بەرەڵا و بێ سلوك نەیگۆڕن بۆ دەلاڵخانە)

ڕاز: ( مامۆستا گیان ، کەوابوو پەروەردەیەکی دروست بوونی نییە ، بۆیە ئێمەی خوێندکاران ئەو جۆرە ڕەفتارە دزێوانەمان لێ دەوەشێتەوە)

بەڕێوەبەر هەندێك بە تورەیی یەوە : ( بە ڕای بەڕێزت دەبێ چی بکەین؟)

ڕاز: ( مامۆستای بەڕێز ، دەبێ ئێمە ئەو پرسیارە لە ئێوە بکەین ، چونکە ئێمە خوێندکارین ، ئێوە ئیدارە و مامۆستا ، ئێمە ناکامڵین ، ئێوە تەواو و کامڵ ، ئێمە نارۆشنبیر ، ئێوە زانا و ڕۆشنبیر...)

بەڕێوەبەر: ( ئێمەی مامۆستا کە دوێنێ قوتابی بووین مامۆستاکانمان هەر بەم جۆرە پەروەردەیان دەکردین ، هەمووشمان مامۆستا و کەسی چاك و هەڵکەوتوومان لێ دەرچووە...)

ڕاز: ( مامۆستا گیان ، سەردەمی ئێمە سەردەمێکی ترە ، بەڕێزتان باشتر دەزانن پەروەردە وابەستەی کات و سەردەمە ، ئێوە جۆرێك لە پەروەردەتان پێویست بووە و ئێمەش جۆرێکی تر، ئەو پەروەردە و شێوازەی جاران بۆ ئێوە شیاو بوو ، بەڵام ناتوانێ بۆ ئێمە لە ئاستی پێویست دا بێت)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەڕێوەبەر: ( یاسا و ڕێنموونی قوتابخانەکان چی داوا بکات ئێمە وا دەکەین و ناتوانین لێ ی لا بدەین )

ڕاز: ( دەزانم میتۆدی پەروەردە بە تەنها بەڕێزت ناگۆڕرێت، بەلآم ئێوەش بە ئەرکی سەر شانی خۆتان سەروی خۆتانی لێ ئاگادار بکەنەوە ، بەلکو لە چەند لایەکەوە فشار دروست ببێت و وەزارەتی پەروەردە پیاداچوونەوەیەکی ستراتیژی پەروەردە و فێرکردن بکات )

بەڕێوەبەر و یاریدەدەرەکان پۆلەکەیان بەجێ هێلا و بە دوای ئەواندا زەنگی پشوو لێ درا...

عەسری هەمان ڕۆژ هەموو برادەران لە باخەکەی مالّی " ڕاز " کۆبوونەوە ، هەریەکە و دەقی ڕۆلّەکەی خۆی لە چەند لاپەڕەیەکدا نووسی بووەوە ، " یوسوف " نووسەری کورتە شانۆکە بوو ، بە دەرهێنانی شانۆگەرییەکە هەلّدەستا و ڕۆلّی کەروێشکیشی دەبینی...

" ڕاز " ڕۆلّی بولبول ، " جوتیار " ڕۆلّی گاجووت و " ڕاوێژ " پاساری و " شاروخ " یش دەوری کەلّەشێری دەبینی... تەنها برادەرێکی تازە ئەمڕۆ بەشداری کرد بوو " سەیوان " بوو کە ڕۆلّی قالاوی پێدرا بوو...

ماوەی " دوو " کاتژمێرێ سەرقالّی پرۆڤە بوون ، کاتێکی خۆش و بە تام بوو ، وایان دەزانی چەند ساتێکی کەم بووە....

مرۆڤ کە بیر لە زەمەن ناکاتەوە ئارام و خامۆشە ، دژوارترین سات ئەو ساتانەیە مرۆڤ هەستی بە زەمەن بۆ دروست دەبێت و دەیەوێ خێرا بە سەریدا گوزەر بکات ، فەرامۆش کردنی زەمەن لە بیر کردنی ئازارەکانە ، ئازار مرۆڤ دەگێڕێتەوە ناو خۆی و هەستی بە زەمەن لا دروست دەکات ، گەڕانەوەش بۆ ناخی خۆ ئازارێکی گەورەیە.. بۆ؟ ژیانی ڕاستەقینە ئەو ژیانەیە مرۆڤ لەگەلّ خۆیدا و لە ناو خۆیدا دەژی ، ژیان لە دەرەوەی خۆ وەهم و ئەندێشەیە ، ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ڕاستەقینە ئازار بەخشە ، لە کاتێك دا ئەسپی خۆ تاودان لە وەهم و خەیالّدا چێژێکی گەورە لە ئامێز دەگرێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مـەرگ گـەورەترین ئـازارە ، چـونكە مـەزنترین حەقیقەتـە ، ژیـان (ژیـانی دەرەوە) ئەندێشەیەكی گەورەیە ، بۆیە جێگەی تێـر كردنـی حـەز و ئاواتـەكانی ئێمەیە ، ئەگەر ملكەچی ئەو لۆژیكە ببین كە دەڵێ: لە پشتی هەموو ئازارێكـەوە چێژ و لەزەتێكی گەورە حەشار دراوە ، هەر بەو پێودانە: لە دوو توێ ی هـەموو خۆشـییەكدا ئازارێـك لەگـەڵمان سـەرەتاتكێ دەكـات ، لـە پـشتی ئازارەكـانی بوونەوە جیهـانێكی ئـارامی بـەخش چاوەڕوانمان دەكات و لـە ئاسـۆی لەزەتـە وەهمییەكانەوە شالأوی ئێش و ژان هێرشمان بۆ دەهێنن...

ئازارەكانی بوون ئەو ساتانە بەرجەستە دەبن كـە مـرۆڤ هەسـت بـە بـوونی خۆی دەكات... هۆشیاری بە خۆ لە "لە خۆ ڕامان"ە وە سەر هەڵ دەدات ، "لە خۆ ڕامان" خۆ كردنە بە بابەت ( ئۆبجێكت) ، خۆ كردن بە بابەت پەی بردنە بـە هەموو ئەو دەهلیزانەی دەروونی خۆ كە چەندین ساڵە لە بەر تاریكی و ترسناكی كـەم كـەس وێراویـەتی ڕوویـان تـێ بكـات ، كەشـف كردنـی ئـەو دەهلیزانـە دۆزینـەوەی شـاراوەكانی مرۆڤـە، ئاشـكرا كردنـی ئـەو شـاراوانەش مـرۆڤ بـە حەقیقەتی خۆی ئاشنا دەكات ، دەركەوتنی ئەو حەقیقەتە تەواو پێچەوانەی ئەو كەسایەتی یە وەهمیەیە خۆمان و كۆمەڵگە دروستمان كردووە و نەخشاندوومانە ، ئەم دژایەتییەی نێوان ناوەوە و دەرەوە دەبێتە مایەی ڕووخاندنی كەسـایەتی دەرەوەی مرۆڤ و سەركەوتنی كەسایەتی ناوەوە كـە كەسـایەتی ڕاسـتەقینەیە ، لێـرەوە دوو جـۆر ئـازار سـەرهەڵ دەدات : ئـازاری دژایـەتی نـاوەوە و دەرەوە لەلایەكەوە و ئازاری داڕووخانی كەسایەتی دەرەوە لە لایەكی ترەوە...

دەرهێنـەری كورتـە شـانۆكە ( یوسـوف ) دەیویـست هـەموو ئەكتـەرەكان بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بەو جۆرە ڕۆڵەكە ببینن كە ئەو وێنای كرد بوو ، ئەكتەرەكانیش هەریەكەیان بە ڕۆڵی خۆی دەیویست بەو جۆرە دەور ببینێ كە خۆی دەیویست و لەگەڵی هەماهەنگ دەبوو ، هەردووش ( دەرهێنەر و ئەكتـەر ) لە چوارچێوەی ئەو كورتە شـانۆیە دەرنەدەچـوون كـە نووسـەرەكە دیـاری كـرد بوو...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە یەك شانۆدا سێ دەسەڵات ململانێ ی لەگەڵ یەكتردا دەكرد : دەسەڵاتی شانۆنووس ، دەسەڵاتی دەرهێنەری شانۆ ، لەگەڵ دەسەڵاتی ئەكتەر ، بە هەر سێكیان وێنەیەكی زیندوویان خولقاند بوو...

" یوسوف " خاوەنی هەر سێ جۆرە دەسەڵاتەكە بوو: خۆی شانۆكەی نووسی بوو ، خۆشی دەرهێنەری شانۆكە بوو ، وەك ئەكتەرێكیش رۆڵی " كەروێشك" ی دەبینی ، ئەو مومارەسەی دەسەڵاتی خۆی لە سەر خۆی دەكرد ، وەك نووسەرێك " یوسوف " دەرهێنەری شانۆكەی ناچار دەكرد بە پابەند بوون بە ئاراستە و چوارچێوەیەكی تایبەتەوە ، وەك دەرهێنەریش "یوسوف" ئەكتەری ناچار دەكرد بە نمایش كردنی رۆڵێك كە دەرهێنەر لێ ی حاڵی بوو بوو...

كەسی " یوسوف " ئەو پانتاییەیە كە هەر " سێ " هێزەكە ( هێزی نووسەر ، هێزی دەرهێنەر و هێزی ئەكتەر ) تیایدا كۆ دەبنەوە و دەكەونە ململانێوە ، هەرسێ "یوسوف"ە كە یەك "یوسوف"ە ، یەك "یوسوف"ە كەش سێ "یوسوف"ە ، "یوسوف" هەم تاكە و هەم كۆ ، بەڵام لە پشتی ئەو چەند جۆرە "یوسوف"ە وە "یوسوف" ێك هەیە ئیدارەی ململانێی "یوسوف"ە كان دەكات ، تاوێك "یوسوف"ی نووسەر بە هێز دەكات ، دەمێك "یوسوف"ی دەرهێنەر باڵادەست دەكات ، هەندێ كاتیش ویست و توانینی "یوسوف"ی ئەكتەر دەردەخات...

لە بێ ناوی دونیای ئەدەبەوە " یوسوف " جیلوە دەكات و كورتە شانۆیەك دەنوسێت و ناوی دێتە نێو ناوانەوە ، جیلوە كردنی دووەم هەستانە بە دەرهێنانی كورتە شانۆكە ، جیلوەی سێیەم رۆڵی ئەكتەر بینینە ، ئەو ( یوسوف ) لە دونیای خامۆشی و بێ ناوییەوە بەو سێ جیلوە كردنە خۆی بە دەرەوەی خۆی ناساند...

بۆچی " یوسوف " دەیەوێ خۆی بناسێنێ ؟

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەدەب و هونەر وەکو هێزێکی شاراوە لە ناخی ئەودا پـەنگی خواردۆتـەوە ، لەگەڵ ڕەخسانی زەمینە و هاتنی وەرزی ئەدەب دا هێزە شاراوەکە لـە شـێوەی شیعر و ڕۆمان و چیرۆك و شانۆدا خۆی نمایش دەکـات و دێتـە دەرەوە ، حـەز و توانایەك لە " یوسوف " دا بوونی هەیە کە هێزی شاراوەی ئـەدەب بـۆ شـاکارە ئەدەبیەکان دەگۆڕێت ، ئەو حەزە بریتی یە لە "حەزی خۆناساندن" ، لەوانەیـە ئەو حەزە لە چەندین شوێنەوە سەرچـاوەی گرتبـێ : سەرچـاوەیەك دەیـەوێ " یوسوف " — وەك مرۆڤێـك — لـە نـاو بـرادەران و هاوڕەگـەزەکانی دا بـاڵاترین و بەهێزترین کەسایەتی بێت ، سەرچاوەیەکی تر دەیەوێ " یوسوف " لە جوانی و بەهرەکانی خۆی بە دەور و بـەری ببەخـشێت ، دواهـەمین سەرچـاوە ئەوەیـە " یوسوف " شاکارە ئەدەبیەکانی دەکات بە ئاوێنەیەك و دەیەوێ وێنەی ناوەوەی خۆی تیادا ببینێت ، ئەو دەیـەوێت پـەنهان و تاریکییـەکانی نـاوەوەی خـۆی بـە نووری ئەدەب ڕۆشن بکاتەوە و لێ ی ڕا بمێنێ ، خۆ بینین لـە ئاوێنـەدا چـێژێکی تایبەتی هەیە....

دوای تەواوکردنی پرۆڤەکەیان سەرو شەربەتیان نۆش کرد و خواحافیزیان لـە " ڕاز" کرد و ڕۆیشتن...

سبەینێ لە قوتابخانە لەگـەڵ مامۆسـتای " هونـەر " بـاس و خواسـی کورتـە شانۆکەیان کردەوە و داوایان لێ کرد لەگەڵ ئیدارەدا باسی بکات و مۆڵەتیان بـۆ وەربگرێت تاکو بتوانن کورتە شانۆکە لە هۆڵی قوتابخانەکە نمایش بکەن...

چەند ڕۆژێـك بـە خوێنـدن و ڕۆتینـی قوتابخانـەوە خـەریك بـوون و "ڕاز" بـۆ هاتنی شەوی هەینی و سەردانی ماڵی خاڵی بە پەرۆش بوو ، ڕۆژی پێنج شـەممە دوای گەڕانەوەی لە قوتابخانە لەگەڵ داپیرە دەربارەی چوونیان بۆ مـاڵی خـاڵی گفتوگۆیان کرد ، داپیرەی دەیوت: ( کوڕم من لە مێژە نەچوومەتە ماڵی خاڵت ، دەبێ بمبەی بۆ بازاڕ و دیاریی بۆ "سێبەر خان و لاڤە" گیان بکڕم )

ڕاز: ( داپیرە گیان ، پێویست بەوە دەکات؟! )

داپیرە: ( بەڵێ ، پێویست دەکات)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەردوو بڕیاریان دا عەسرەکەی بچنە بازاڕ و داپیرە دیاری یەکانی خۆی بکڕێ و هەر لەوێوە بچنە ماڵی مامۆستا ئەحمەد ( خاڵی ڕاز ) .

" سێبەر خان " بۆ میوانداری داپیرە و" ڕاز " زەحمەتی بەر خۆی دابوو ، سفرە و خوانێکی جوان و ڕازاوەی – شایستە بە میوانەکان – ئامادە کرد بوو...

مامۆستا "ئەحمەد" و خێزانی و "لاڤە"ی کچی بەگەرمی بەخێرهاتنی "پوورە فاتم و ڕاز" یان کرد و بە عادەتی جوانی خۆی مامۆستا "ئەحمەد" تا دانیشتنی سەر سفرەش خۆشهاتنی میوانەکانی دووبارە دەکردەوە...

لە سەر سفرە پوورە " فاتم " ڕووی کردە " سێبەر خان " و وتی: (بەه.. بەه.. لەم سفرە پڕ و ڕازاوەیە! دەستی کچی شیرینی خۆم "سێبەر خان " خۆش بێت..)

سێبەر خان: ( زۆر بەخێر بێن دایە گیان ، شایستەی ڕووی بەڕێزتانی نی یە)

پوورە فاتم: ( وا مەڵێ کچی خۆم ، لە خودا بە زیاد بێت لە هیچی کەم نی یە ، تەنها شوکری ناز و نیعمەتی خودای دەوێ ) ، پاشان ڕووی لە مامۆستا " ئەحمەد " کرد و وتی: ( مامۆستا ئەحمەد ، "سێبەر خان" دەرسی چێشت لێ نانی نەخوێندووە و ئەو هەموو خواردنە بە تامەشی ئامادە کردووە..)

پوورە " فاتم " بەو قسەیەی مەبەستی لە قسەکەی پێشوتری مامۆستا "ئەحمەد" بوو کە لە میوانداریيەکەی ماڵی پوورە " فاتم " دا بە " سێبەرخان" ی وت : پێویستە وانە بۆ چێشت لێنان لای پوورە "فاتم " وەربگرێت...

مامۆستا " ئەحمەد " بە پێکەنینەوە: ( ئەو هەموو جارەی ئێمە دێینە لای ئێوە و تۆ و "سێبەر" دوو بە دوو قسە و گفتوگۆ دەکەن جگە لە وانە وەرگرتن دەبێ چیتر بێت ؟!)

سێبەر خان: ( کچ لە دایکی خۆیەوە دەبێ هەموو شتێکی باش فێر ببێت )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( خاڵە تکا دەکەم وەك جاری پێشو خۆت تووشی دادگا و گەمارۆی ئابوری دەکەیەوە ، ئەوەندە لە خاڵۆژنم مەخوێنە )

مامۆستا ئەحمەد: ( کوڕم ، تازە من تەسلیمی خاڵۆژنت بووم ، خودا ڕەحمی خۆی بە تۆ بکات)

" ڕاز و لاڤە " هەردوو سەریان داخست و بە خواردنەکەوە خۆیان خەریك کرد و قسە توێکڵ دارەکەی مامۆستا " ئەحمەد " یان تێپەڕاند...

پوورە فاتم: ( ئیشەڵا کچی جوانم " لاڤە " گیانیش لە ڕەوشت و سەلارییدا دەچێتەوە سەر دایکی )

سێبەر خان: ( مرۆڤ تا مردن پێویستی بە مامۆستا هەیە ، من ئەوەندەی لە دایە " فاتم" سوودم وەرگرتووە ئەوەندە خوێندن و کتێب وانەی دانەداوم )

هەموو ئەم قسانە لە پشتی یەوە مانـاو مـەرامێکی حەشار دابوو ، قسەکان حەزی " مامۆستا ئەحمەد و سێبەر خان و پوورە فاتم " ی بۆ ژنهێنانی "ڕاز" و مێرد کردنی " لاڤە " نیشان دەدا... دیارە تەنها کەسێك بە شایستەی "ڕاز"ی بزانن "لاڤە"ی کچە خاڵی "ڕاز"ە...

"لاڤە و ڕاز" لە قسەکان حاڵی دەبوون ، بۆیە ناو بە ناو شەرم دای دەگرتن و بە تەنها بزەیەك هەڵوێستەکەیان دەگوزەراند...

بە درێژایی دانیشتنی سەر سفرەیان تەنها جارێك چاوەکانی "ڕاز" لە چاوانی " لاڤە " گیرا و هەر زوو بە زوو لە یەکتر هەڵخلیسکان و سەریان داخستەوە...

" ئالان " کە قسەو بیرکردنەوەی لە منداڵ نەدەچوو داوای لە "ڕاز" کرد پەرداخێ پیپسی بۆ پڕ بکات ، کە لە دەستی " ڕاز " ی وەرگرت پێ ی وت : پەرداخێکیش بۆ " لاڤە " پڕ بکات ... " ڕاز " یش بە هەندێك شەرمەوە پەرداخێکی تری پڕ کرد و ویستی لە ڕێگەی "ئالان"ە وە بە لاڤەی بگەیەنێت، بەڵام ئالان بۆ شەرمەزارکردنی لاڤە — فێڵبازانە — ڕووی کردە " لاڤە " و وتی: ( لە دەستی بگرە ، بۆ تۆی تێ کردووە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" لاڤە " بە چاوێکی کەمێك ڕقاوییەوە بەرانبەر بە " ئالان " دەستی بۆ پەرداخەکە درێژ کرد...

باش بوو ئەم گفتوگۆیەی نێوان " ڕاز و ئالان و لاڤە " لە کاتێك دا بوو " مامۆستا ئەحمەد و سێبەر خان و پوورە فاتم " سەرقاڵی قسەکردنی خۆیان بوون...

دوای چا خواردنەوە ، کاتی خوێندنی "لاڤە و ڕاز" هاتە بەرەوە ، لە ڕاستیدا لە پاڵ پێ خوێندنی "لاڤە" لەلایەن "ڕاز"ە وە مەرامێکی تر حەشار درابوو ، " مامۆستا ئەحمەد و سێبەر خان " دەیانویست لێك نزیك ببنەوە و تێگەیشتن لە نێوان ئەو دووانەدا پەیدا ببێ و خۆیان بگەنە ئەو ئەنجامەی کە ئایا دەتوانن ژیانێك پێکەوە دروست بکەن یان نا..؟ دانیشتنی " لاڤە و ڕاز " لە ژووری کتێبخانەکەی مامۆستا "ئەحمەد " دا بوو کە تا ڕادەیەك لە هۆڵی دانیشتنەکەیان دوور بوو...

دوای نیو کاتژمێر لە خوێندن دیار بوو " لاڤە " حەز و توانای گوێ گرتنی نەما بوو... هەردوو پێیان خۆش بوو باسێکی تر جگە لە خوێندن بە نێوانیاندا گوزەر بکات...

ڕاز: ( مامۆستاکانتان چۆنن ؟)

لاڤە: ( هەندێکیان زۆر زیرەکن ، هەشیانە بەو جۆرە نی یە )

ڕاز: ( مامۆستایان تێدایە بتوانێ بە ژیان ئاشناتان بکات ؟)

لاڤە: ( لە مەبەستت ناگەم...)

ڕاز: ( هەیانە بتوانێ لە چوار دیواری وانە و مەنهەج دەربچێت و ئەوەی مرۆڤ تینووە بۆی قسەی لێ بکات ؟)

لاڤە: ( بەڵێ ، مامۆستای مێژوومان تا ڕادەیەکی زۆر ڕۆشنبیر و بە توانایە ، زۆر شتی ورد و بە تاممان لە مێژوو بۆ باس دەکات )

ڕاز: ( یەکێك لە قسەکانیت لە بیر ماوە ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لاڤە: ( هەموو جارێ دەڵێ: دانە بە دانەی مرۆڤەکان مێژوونووس بن ئەوجا مێژوو ڕاست و دروست دەنوسرێتەوە ، هەر مرۆڤێك مێژوویەکە، لە بیرکردنی ئەو مێژووە یاخود ئەو مرۆڤە گەردێك لە گەردەکانی جەستەی مێژوو لە بەین دەچێت ، یاخود ون دەبێت ، لەوێشەوە ڕاستییەك لە ڕاستی یەکان زیندە بەچاڵ دەکرێت...)

ڕاز: ( بەڕاستی وتەیەکی قووڵ و مەزنە ، ئەو مامۆستایە شایستەی ئەوەیە قوتابی جوان گوێ ی بۆ بگرێ و دروست لێ ی حاڵی ببێت ، دەتوانم سەردانێکی بکەم؟)

لاڤە: ( نازانم ، با پرسی پێ بکەم... ئەو مامۆستای ئافرەتە پیاو نییە)

ڕاز: ( هەرچییەیك هەیە ، من ئەقڵ و بیری ئەو دەدوێنم و ئێمە فێرخوازین و ئەوانیش مامۆستا...)

لاڤە بۆ دوورخستنەوەی " ڕاز " لە داوایەکەی وتی: ( ئا... بەڕاست ئێوە لەگەڵ مامۆستاکانتان چۆنن ؟)

ڕاز: ( بە ڕاستی – وەك سوهراب دەڵێ –"باشترن لە ئاوی ڕەوان" ، مامۆستاکانی ئیمە بۆ سارای دڵ و فیکرمان بارانی لێزمەن ، خۆزگە خوێندن لە قوتابخانەکەماندا بیست ساڵ دەبوو)

لاڤە: (هەموو مامۆستاکان پیاون؟)

ڕاز: ( تێکەڵن ) پاش بێدەنگییەك ( "لاڤە " تۆ بۆ خۆت چۆن لە ژیان گەیشتووی؟)

لاڤە: ( لای من ژیان ماندووبوون و کۆشانێکە دەبێ ڕوو بە ڕووی ببینەوە ، عیشقێکە دەبێت بە باڵای دا سەر بکەوین ، سەفەرێکە دەبێ خۆمانی بۆ ئامادە بکەین ، دایکێکە دەبێ بە حورمەتەوە سەیری بکەین ، وەك تۆ دەڵێ ی ئاوێکی ڕەوانە پێویستە لە تینوێتی دا بینی لێ بگرین ، کەشتی یەکە سوارمان دەکا و لە بەندەر و دورگە جیا جیاکاندا دامان دەبەزێنێ ، ئاوێنەیەکە دەبێ حەقیقەتی شاراوەی خۆمانی تیا نمایش بکەین

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پێی ناگەین ، مانگە شەوێکە پەڵە هەورە چڵکنەکان ناو بە ناو لێمان تاریك دەکەن ، ژیان ئەم ساتەیە من و تۆی پێکەوە گرێ داوە ، ئەو حەزەیە من و تۆ دەخاتە پەنایەکەوە و حەز ناکەین کەسی سێ یەم ڕوومان تێ بکات ، ئەو شەرمە قووڵەیە بەرانبەر بە یەکتر هەڵمان گرتووە ، تاسە و تینوێتییەکە عاشقێك بۆ مەعشوقەکەی هەیەتی...)

ڕاز – بە سەرسامییەوە – : ( بەسە ، ڕاوەستە... بۆ خاتری خودا تۆ چیت ؟! تۆ کێیت ؟! تۆ مرۆڤی قسە دەکەی یان فریشتەیەك ؟! تۆ کەی "لاڤە"یت ؟! لای من "لاڤە" کچێکی سادە و ساکار بوو ، ئێستا ئەم گشتە حیکمەت و مانا قووڵانە لە کوێوە دەهێنی؟ ئەی هاوار من لە هیچ نەگەیشتووم! نزیکترین کەس بە من " لاڤە " یە و تاکو ئێستا نەم ناسیوە ، نزیکترین کەس بە من دوورترین کەس بووە...)

لاڤە: ( تۆ بۆ من سەرچاوەی مانا و حیکمەتی ، بە چاوانیش نەم توانیوە ئەوەی لامە بەرانبەرت بۆت دەربڕم ، بێ باکی تۆ زۆری ئازار داوم ، بەڵام دانم بە خۆم دا دەگرت و چاوەڕوانی ئەو ساتە بووم کە قسە لە نێوانماندا دروست دەبێت...)

ڕاز: ( من هیچم پێ ناوترێت ، هەستە بچینەوە لای ئەوان )

لاڤە: ( ئەمەش جۆرێکی تر نی یە لە بێ باکی؟! )

ڕاز: ( بەرگەی قسەکانت ناگرم ، دەترسم ئەوان بە حاڵم بزانن )

هەردوو هەستان و گەڕانەوە بۆ لای " پوورە فاتم و مامۆستا ئەحمەد و سێبەر خان "

" ڕاز " ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو ، کپی و بێ دەنگییەك بە سەریدا داباری بوو ، زەنگی قسەکانی " لاڤە " لە گوێ ی دا دەزرنگایەوە...

ئەو شەوە هەرچەند مامۆستا " ئەحمەد " بەسەرهات و نوکتەی خۆشی دەگێڕایەوە " ڕاز " حاڵەتەکەی نەدەڕەویەوە و بەری نەدەدا ، ناو بە ناو بۆ ڕازی کردنی مامۆستا " ئەحمەد" بزە[illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەلاّم هەر زوو بە زوو ئەویش بالّی دەگرتەوە و لێوە وشك هەلّهاتووەكانی بەجێ دەهێلاّ...

تا درەنگانێكی شەو مانەوە و بەیانی لەگەلّ خۆرهەلاّتن " ڕاز " و داپیرەی بۆ مالّەوە گەڕانەوە...

ئەو ڕۆژە دەستەخوشكی دێرینی داپیرە " نەسرین " خان سەردانی داپیرەی كرد ، " نەسرین" خان بەڕێوەبەری قوتابخانەیەكی ناوەندی كچان بوو ، هاوەلّ و خۆشەویستی سەردەمی مندالّی پوورە " فاتم " بوو ، ئەو چەند هەفتە جارێك بە سەردانی پوورە " فاتم " دەهات و ڕۆژێك تا ئێوارە پێكەوە دەمانەوە و هەرچی یادەوەری و قسەی خۆشی جارانە دەیانهێنایەوە بەر یاد ، ئەم جارەیان " نەسرین" خان باسی سەردەمی زانكۆی خۆی بۆ پوورە "فاتم" كرد ، خۆشییەكانی سەردەمی گەنجێتی دەهێنایەوە بەر هەست ، لە درێژەی باسەكەیدا ناوی یەك بە یەكی ئەو كوڕ و كچانەی دەهێنا لە كۆلیژەكەی ئەودا بوون و ئێستا هەندێكیان مردوون و هەندێكیان نەخۆش و كەمیان هەیە بە دەردی پیرییەوە گرفتار نەبوو بێت ، لە ناو ئەو كەسانەدا باسی گەنجێكی كرد بە ناوی " موهتەدا " و وتی ( ئەو گەنجە " چوار " سالّ لە یەك كۆلێژدا بووین تەنها هەلّەیەكم لێ نەبینی ، مرۆڤێكی دامەزراو بوو، كەسێكی زانا و ڕۆشنبیر بوو ، هەمووماں لێی بەهرەمەند بووین ، دیار بوو لە خانەوادەیەكی دەولّەمەند و ناودار بوو، لێتی ناشارمەوە بە ڕەوشت و ئاكاری سەرسام بووم ، حەزم دەكرد زیاتر بچمە ناو ناخییەوە ، لە هەموو كەس زیاتر لێی نزیك بوومەوە ، زیرەكی و بلیمەتییەكەی بێوێنە بوو ، لە كەمترین ماوەدا بە زانستەكەی كێشی دەكردی و حەزت دەكرد هەموو گیانت بكەیت بە گوێ و سوودی لێ ببینی ، من لەگەلّ هاوسەری ڕەحمەتیمدا كە ئەو كات پێكەوە قوتابی زانكۆ بووین بڕیاری هاوسەرگیریمان دابوو ، ئەلّقەی دەستگیرانیم لە دەستدا بوو ، " موهتەدا " نزیكبوونەوە لە ڕادەبەدەرەكەی منی بە باش نەدەبینی ، ڕۆژێك من و دەستگیرانەكەمی بانگ كرد و پیاسەیەكی پێكردین و باسی خۆشەویستی و وەفاداری و چۆنێتی دروست كردنی خێزانی بۆ كردین ، تا ئەو كاتە باسی لەو جۆرەمان نەبیستبوو ، ئێمە بە جۆرێكی تر سەیری ژیان و خێزان و خۆشەویستیمان دەكرد ، لەو باسەوە تێگەیشتنمان بە تەواوی گۆڕا و لە ماوەی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

"سی و پێنج" ساڵی هاوسەرداریماندا بۆ تەنها جارێکیش دڵی یەکترمان نەڕەنجاند ، هەموو جارێك قسەکانی "موهتەدا"مان دەهێنایەوە یادی خۆمان و گوڕ و تینی بە ژیانمان دەبەخشی ، نازانم ئەو گەنجە چی لێهات و ڕووی لە کوێ کرد ، من دڵنیام ئەو مرۆڤێکی مەزنی لێدەرچووە ، بەڵام نازانم کەوتە چ سووچێکی ئەم ژیانەوە ؟!)

پوورە فاتم: ( چیم بۆ دەکەی ئەگەر هەواڵی ئەو مرۆڤەت پێ بدەم؟)

نەسرین خان: ( شۆخی دەکەی یان بەڕاستە؟!)

پوورە فاتم ( بەڕاستمە )

نەسرین خان ( چۆن دەیناسیت؟! ئەو لە کوێیە و ئێستا چی دەکات؟)

پوورە فاتم ( من لە ڕێگەی خاڵە "مەولود"ە وە ناسیومە ، ئەویش لە ڕێگەی پیرانەوە "موهتەدا"ی ناسیوە)

نەسرین خان ( " ڕێگەی پیران "؟! مەبەستت چی یە ؟)

پوورە فاتم ( ئەو "پیر"ە ی خاڵە "مەولود" ی پەروەردە کردووە لە دوای مەرگی خۆی "موهتەدا"ی پێ ناساندووە)

نەسرین خان: ( یانی ئێستا " موهتەدا " یەکێکە لە پیران؟)

پوورە فاتم ( ئەو عاریفێکی مەزنە و لەو مەیدانەدا کەسی پێناگات)

نەسرین خان ( ئێستا لە کوێ دەژی؟)

پوورە فاتم ( لە گوندێکی نزیك سەر سنوورە )

نەسرین خان ( تۆ بینیوتە؟)

پوورە فاتم ( بەڵێ ، چەند جارێك لەگەڵ خاڵە "مەولود" سەردانم کردووە)

نەسرین خان ( من دەتوانم بیبینم ؟)

پوورە فاتم ( دەبێ پرس بە خاڵە "مەولود" بکەم )

نەسرین خان ( زۆرم پێخۆش دەبێت ئەگەر پێکەوە بچین سەردانێکی بکەین )

پوورە فاتم ( جوابت لێ دەگێڕمەوە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕۆژێکی هەینی " ڕاز " بیانوویەکی بۆ داپیرە هێنایەوە و لە ماڵەوە بەرە و ئەشکەوتی پیرەمێردەکە بەڕێ کەوت ، ئەمجارەیان پیرەمێردەکە لە ناو ئەشکەوتەکەدا چاوەڕوانی دەکرد کە " ڕاز " ی بینی وتی: ( هاتی؟)

ڕاز: ( بەڵێ ، هاتم... هاتنم بە دەستی خۆم نی یە ، سەلام..)

پیرەمێردەکە ( سەلام...)

دوای کەمێك پشوودانی " ڕاز " پیرەمێردەکە دەستی بە گێڕانەوەی داستانەکە کرد: ( "ئادۆ" لە جەنگەڵەکەدا ژیانی بە سەر دەبرد ، لە دەروونی خۆی دا هەستی بە غوربەتێکی قووڵ دەکرد ، ئەو تەنها بوو ، هاوشێوەی خۆی نەبوو ، لە بن دار خورمایەکدا خەوی لێ کەوت... دوای خەوێکی قووڵ بە ئاگا هات ، بەڵام چی بینی؟! کەسێکی هاوشێوەی خۆی ، بە بینینی تەمی غوربەت لە ناخیدا ڕەویەوە و بە بێ قسە لێ ی نزیك بوویەوە ، لێ ی ڕاما ، ئەویش بە سەرسامییەوە سەیری " ئادۆ " ی دەکرد ، کاتێك " ئادۆ " لێ ی نزیك دەبوویەوە ئەو دەست و لاقەکانی بە دەوری خۆیدا گرمۆڵە دەکرد ، ترسی ئەو بوونەوەرە حەزی نزیك بوونەوەی لە لای" ئادۆ " زیاتر کرد ، زۆرتر لێ ی نزیك بوویەوە ، ئەویش زیاتر خۆی گرمۆڵە دەکرد..

" ئادۆ" لە تەنیشتییەوە دانیشت و بە ترسێکی زۆرەوە دەستی چەپی لە گەردنی ئەو ئاڵاند ، ئەویش خۆی هاوێشتە ئامێزی " ئادۆ "، تێر تێر یەکتریان گووشی ، حەز و تاسەی "ئادۆ" پاراو بوو ، ئارامییەکی قووڵ بە سەریاندا داباری ، هەستی خۆشەویستی و ئولفەت کەوتە نێوانیانەوە ، " ئادۆ " لێ ی پرسی ناوت چی یە؟ ئەویش وتی ناوم " ئاوا " یە ، ئەی تۆ ناوت چی یە؟

ئادۆ: ( ئادۆ... ناوم " ئادۆ " یە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ئادۆ و ئاوا " لە ژیانی پڕ لە تام و لەززەتی جەنگەڵستان دا نوقم بوون ، شەوانە دەستیان دەئالآندە گەردنی یەكتر و لێ ی دەنوستن ، سەرما و گەرما لەو دارستانەدا نەبوو ، بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەسان و گەشتی دارستان و ڕنینی بەری دارەكانیان دەست پێ دەكرد ، دەگەڕان و بەری دارەكانیان بە پێ ی حەزی خۆیان دەكردەوە و دەیانخوارد ، ئەوانماڵیان نەبوو ، خواردنیان كۆ نەدەكردەوە و لە هەر جێگەیەكدا شەویان بە سەردا بهاتبایە خۆیان لە یەكتری دەئالآن و دەنوستن...

ڕۆژێك " جابۆ " سەردانی كردن و سەلامی پادشای مەزنی پێ گەیاندن ، " جابۆ " پێ ی وتن : خواردنی هەرچی بەر و میوەی ئەم دارستانەیە ڕەوایە تەنها یەك درەخت نەبێت ، پادشای گەورە فەرمانی داوە نابێ لەو درەختە بخۆن ، چونكە خواردنی دەبێتە هۆی ژیانی تاڵ و كوێرەوەری...

داواكەی پادشای گەورە بە نەخواردنی بەری ئەو درەختە – كە "جابۆ " پێی ڕاگەیاندن – جێگەی سەرنجی " ئادۆ و ئاوا " نەبوو ، چونكە درەختگەلێكی بەردار ئەوانی لە بەری ئەو تەنیا درەختە بێ نیاز كرد بوو ، ئەوان پێویستییەكیان بەو درەختە نەبوو ، بۆیە لە مەرامی نامەكە نەگەیشتن و جێگەی تێڕامانیان نەبوو ، ئەم بێ باكی یە سەری كێشا بۆ لە بیرچوونەوەی نامەكە و لە یادكردنی ناوەڕۆكەكەی...

" ئەهرا " كە بە هۆی " ئادۆ " وە دەسەلآت و پلە و پایەی لە دەست دابوو گڕی ڕق و كینە بەر بووە گیانی ، بیری تۆڵە كەوتە سەری و بڕیاری دا پیلانێك دژ بە " ئادۆ " و هاوسەرەكەی گەلآڵە بكات...

" ئادۆ " و هاوسەرەكەی مانای پیلان و ڕق و كینەیان نەدەزانی ، لەو سەرو بەرەدا بوو پادشای مەزن داوای لە " جابۆ " كرد بە هەموو دەست و پێوەند و كاربەدەستەكان ڕابگەیەنێ كە پادشای مەزن دەیەوێ ناوچەی " ئەرسا " ی هەرێمی یەك ئاوەدان بكاتەوە و بەرپرس و جێنشینێكی بۆ دابنێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" جابۆ " فەرمانەکەی پادشـای مـەزنی پـێ ڕاگەیانـدن ، ئـەوانیش بـە کـۆی دەنگ و بە ئەدەبێکی پڕ لە نازەوە بە " ئاهو " ی مـەزنیان وت : ( ناوچـەی " ئەرسا " جێگەی شەڕ و ئاشووب و خوێنڕێژی یە ، خاوەن شکۆ ئاگاداره پێشتر خێڵی " جانا " گەورەترین فەساد و وێرانکاریـان لـەو ناوچـەیەدا ئـەنجام داوە ، ئێمە شکۆمەندی پادشای مـەزن ڕادەگـرین و کارەکـانی ڕادەپـەڕێنین ، ئـیتر بـۆ دەبێ جارێکی تر ئەو ناوچەیە کاری نارەوا و دژ بە حەزی "ئاهو " ی مەزنی تیا ئەنجام بدرێت؟ ! )

پادشای مەزن لە وەڵامیاندا وتی: ( من پادشام و باشتر لە ئێوە دەزانم چـۆن کارەکانم ئەنجام بدەم )

دەست وپێوەندەکان: ( درووود و شکۆمەندی بۆ پادشای مەزنان )

" ئـاهو "– پادشـای مـەزن – فـەرمانی دا بـە " جـابۆ " بـۆ دەرخـستنی گەورەیی " ئادۆ " نهێنی هەموو ناوەکانی فێـر بکـات ، " ئـادۆ " فێـری هـەموو ناوەکان بوو ، هەر شتێکی دەبینی دەیتوانی ناوێکی بۆ بدۆزێتـەوە ، زمـانی بـە قسەکردن پاراو بوو...

" ئاهو " – پادشای مەزن – بە دەست و پێوەندەکانی وت : (ئەگـەر دارای زانستن ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ، ئەوانیش بە یەك دەنـگ وتیـان: گـەورەیی و شکۆمەندی بـۆ پادشـای مـەزن ، ئێمـە هـیچ شـتێك نـازانین جگـە لـەوەی فێـرت کردووین ، تۆی هەڵمان دەسـوڕێنی و قـسەشمان فێـر دەکـەیت ، ئێمـە چـیترین جگە لە چەند کاراکتەرێکی ناو داستانێکی مەزن؟ ! )

بە فەرمانی " ئاهو " سەرجەم ناوەکان فێری " ئادۆ " کـرا ، فـەرمانی بـە " جابۆ " دا تەواوی داروودەستەکانی کۆ بکاتەوە و "ئـادۆ" ببـات بـۆ ناویـان و لـە هەریەکەیان ناوێك بنێت ، ئەمەش بۆ دەرخستنی ڕێـز و پلـە و پایـەی " ئـادۆ " بوو...

کاتێ هەریەك لە داروودەستەی پادشای مەزن بوو بە خاوەنی ناوی خۆی و لـە ڕاسـتی یـەکانی خـۆی گەیـشت " ئـا[illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شکۆمەندی وتی: ( پێم نەوتن من زاناترم بە شتانێك کە ئێوە نایزانن؟! بینیتان " ئادۆ " چۆن کارەکتەرێکە ، ئەو دەتوانێ خۆی و دەرەوەی خۆی بناسێت ، بەلاّم ئێوە تەنها من دەناسن ، نە خۆتان و نە جگە لە من کەسێکی تر ناناسن ، " ئادۆ " دەتوانێ لە خۆی رابمێنێ و پەنهانەکانی خۆی پەی پێ ببات ، بە هەمان شێوە لە دەوروبەری رادەمێنێ و پەردە لە سەر نهێنی یەکانی بوون رادەماڵێ ، بە هۆی کەشفکردنی ئەم دوو جیهانەوە: ( جیهانی ناوەوە و جیهانی دەرەوە ) من دەناسێ و ئاشنایم لە گەڵدا پەیدا دەکات ، هەر کەسێك ناوی خۆی بزانێ خۆی دەناسێت ، ئەگەر توانی لە پاڵ زانینی ناوی خۆیدا ناویش لە شتەکان بنێت ، ئەوا شتەکانیش دەناسێت ، سەرچاوەی خۆناسینی ئێوە " ئادۆ " یە ، بەلاّم سەرچاوەی خۆناسین و دەرەوە ناسینی "ئادۆ" منم ، من ناوەکانم فێری " ئادۆ " کردووە ، بەلاّم " ئادۆ " یە ئێوەی فێری ناوەکانتان کردووە ، ئێوە دەبێ لە خزمەتی " ئادۆ " دا بن ، کارەکانتان و داواکانتان لە پێناوی ئەودا بێت ...

" راز " گێڕانەوەی داستانەکەی بە پیرەمێردەکە بڕی و وتی : (گرنگی و نهێنی فێربوونی "ناو " لە چی دایە؟)

پیرەمێردەکە: ( ناو بەڵگە و نیشانەیە ، بەدەست هێنانی زانست –هەر زانستێك– کۆکردنەوە و ئاشنا بوونە بە کۆمایەك لە بەڵگە و نیشانە)

راز: ( حەقیقەتی " ناو " چی یە ؟ ئەو وشە و دەنگانەیە ئێمە گۆیان دەکەین ، یاخود شتێکی ترە؟)

پیرەمێردەکە: ( "ناو" مانا و حەقیقەتی هەر شتێکە ، بەم پێ یە "ناو و ناولێنراو " مەبەستم" دال و مدلول "ە یەك شتن ، ناو شتێك نییە و ناولێنراو شتێکی تر ، بەڵکو ناو رووی دەرەوەی شتەکەیە و حەقیقەت و مانای " ناو " یش رووی ناوەوەیە ، هەمیشە دەبێ بۆ تێگەیشتن لە شتێك توێکڵەکانی دەرەوە ببڕیت تا دەگەیتە کرۆك و جەوهەر ، واتە دەبێ ناوی سەر زارەکی ببڕین تا دەگەینە مانا و ناوەڕۆکی " ناو " کە حەقیقەتی شتەکەیە ، با ئەوەش بڵێین: مەعریفە و زانست لە نێو " زمان " دا گەشە دەکات ، ئەگەر زمان ( لغة )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نەبوایە زانیاری مرۆڤ گەشەی نەدەکرد ، زمانیش کۆمایەکی گەورەیە لە " ئاماژە و ئاماژەبۆکراو " واتە ( دال و مەدلول ) .

پاشان پیرەمێردەکە گەڕایەوە سەر داستانەکە و وتی: (" ئادۆ " گەڕایەوە بۆ ناو جەنگەڵستانی هەرێمی حەوت ، " ئەهرا " پیلانێکی دژ بە " ئادۆ " و هاوسەرەکەی ئامادە کرد ، لە " ئادۆ " نزیك بوویەوە و پێ ی وت: ( دەتەوێ درەختی نەمریی و موڵکی هەمیشەیت پێ نیشان بدەم؟ " ئادۆ " زۆر لە مردن و تیا چوون دەترسا ، هەمیشە بیری لێ دەکردەوە ، مۆتەکەی مردن یەخەی بەر نەدەدا ، شالاوی مەرگ لە بەر چاوی ون نەدەبوو ، بۆ ڕەواندنەوەی ترسی مەرگ بیری لە موڵکێکی هەمیشەیی و بەردەوام دەکردەوە ، موڵکێك ببێتە مایەی مانەوە و خۆشگوزەرانی ئەو...)

ڕاز ( یانی ڕەگ و ڕیشەی مەرگ لە ناخی ئێمەدا بوونی هەیە؟! مەرگ لەگەڵ هەویری سروشتماندا شێلراوە؟!ئەگینا " ئادۆ " بۆ لە مەرگ دەترسا ؟ خۆ نموونەی کەسێکی نەدی بوو لە بەرچاوی بمرێت؟! ئەگەر ترسی مەرگ بەشێك نەبوو لە سروشتی " ئادۆ " ئەی چۆن دزەی کردبووە ناو بیر و ئەندێشەیەوە؟!)

پیرەمێردەکە ( پرسیارەکەت بەجێ یە ، ترسی مەرگ حاڵەتێکی وجوودی یە ، ئەگەر منداڵێك لە یەکەمین چرکەی لە دایکبوونەوە لە ناو دارستانێکدا بژی و چاوی بە مرۆڤ و گیاندارانی تریش نەکەوێت ئەو هەر لە مەرگ دەترسێت ، چونکە مەرگ بەشێکە لە بوونی ئەو ، مەرگ بەشێکە لە ژیان...)

دوای وەڵامی پرسیارەکەی " ڕاز " گەڕایەوە سەر داستانەکە و وتی ( ئەهرا لەو دوو خاڵە لاوازەی " ئادۆ " وە هاتە ژوورەوە – دەروازەی نەمری و دەروازەی موڵکی هەر هەری– " ئادۆ " بەر لەو قسەیەی "ئەهرا " ی دوژمن وتەی درۆ و ناڕاستی نەبیست بوو ، لەگەڵ درۆدا هیچ تەجروبەیەکی نەبوو ، ئەو پێ ی وابوو هەموو قسەیەك ڕاست و دروستە ، بۆیە هەر زوو بە زوو کەوتە ناو پیلانەکەی " ئەهرا " وە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ئەهرا " هەردوو " ئادۆ و ئاوا " ی بردە لای درەختە قەدەغە كراوەكە و پێ ی وتن: ( دەزانن بۆ " ئاهو " ی مەزن ڕێگەتان پێ نادات لەم درەختە بخۆن؟)

ئادۆ: ( بۆ؟)

ئەهرا: (چونكە هەر كەسێك لەم درەختە بخوات نەمریی بە دەست دەهێنێ و دەبێ بە خاوەنی مولكی نەبڕاوە ، " ئاهو " بڕیاری داوە تەنها خۆی نەمر بێت و هەموو شتەكانی تر تیا ببات ، ئەگەر تۆ لەم درەختە بخۆیت لەگەڵ نەمری " ئاهو " دا نەمر دەبیت)

" ئادۆ و ئاوا " بۆ ڕزگاربوون لە مەرگ باوەڕیان بە قسەكەی "ئەهرا" كرد و كەوتنە خواردنی بەری درەختەكە ، تام و چێژی بەری درەختەكە هەر ئەوەندە بوو كە لە زاریان نا ، لەگەڵ قووتدانی چەند دەنكێك لە بەری ئەو درەختە هەستیان بە عەورەت و نەنگی خۆیان لە لا دروست بوو ، ئەوان بەر لە خواردنی بەری درەختەكە ڕووت بوون ، بەلام هەستیان بە ڕووتی خۆیان نەدەكرد ، خواردنی ئەو بەرە مانای ڕوتیی تێ گەیاندن ، بۆیە دەستیان لە سەر عەورەتی خۆیان دادەنا و بە گەلای درەختەكان دایان دەپۆشی...

" ئەهرا " دایە قاقای پێكەنین و پشتی لێ كردن ، ئادۆ و ئاوا ی هاوسەری زانیان فەرمانی پادشای مەزنیان شكاندووە ، بۆیە كەوتنە گریان و پاڕانەوە ، لە ناكاو دەنگی " ئاهو " ی مەزن هەموو دارستانەكەی پڕ كرد و وتی: ( پێم ڕانەگەیاندن لە بەری ئەو درەختە مەخۆن ، نەموت " ئەهرا " دوژمنی خۆت و هاوسەرەكەتە ، بۆ بە قسەكانی خەڵەتان و سنوورەكانی منتان بەزاند؟!)

" ئادۆ و ئاوا " نەیان دەزانی چی بڵێن ، " ئاهو " بەزەیی پێیاندا هاتەوە و " جابۆ " ی ناردە لایان و فێری كردن بڵێن: ( ئەی پادشای مەزنمان ئێمە خەتاكار و گوناهكارین ، ستەممان لە خۆمان كردووە ، ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەییەكت بە ئێمەدا نەیەتەوە چووینەتە ڕیزی خەسارۆمەندان و ڕەنجەڕۆیانەوە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ئادۆ و ئاوا " بە پێچەوانەی " ئەهرا " وە تـاوان و گوناهەکـەیان دایـە پـاڵ خۆیان و پادشای مەزنیان بەوەی ئەو کارەکەی پێ ئەنجام دابن تۆمەتبار نەکرد ، هەردوو شانیان دایـە ژێـر کـۆڵی قورسـی تـاوانی خۆیـان و تـەنها خۆشـیان بـە زیانمەند تەماشا کرد ، چونکە پادشای مەزن باکێکی نی یە لە تـاوانی دەسـت و پێوەندەکانی، " ئاهو " ی مەزن بڕیاری دا " ئادۆ " و هاوسەرەکەی و " ئـەهرا " ی نەفرەتلێکراو نەفی بکات و ڕەوانەی هەرێمی یەك و ناوچـەی "ئەرسـا" یـان بکات...

کە گەیشتە ئەم خاڵە پیرەمێردەکە سەرێکی داخست و لە قسەکردن وەستا و پاش ماوەیەك لە بێدەنگی سەری هەڵبڕی و وتی: ( لێرەدا دەوەستم ، ئەگەر بـە یەکتر گەیشتینەوە باسەکەت بۆ تەواو دەکەم... هەستە با درەنگـت لێ نـەکات و جامێ ئاوی کوپەکە نۆش بکە و بۆ لای داپیرەت بگەڕێرەوە...)

لەگـەڵ چـەند هـەنگاوێك دوورکەوتنـەوە لـە دەرگـای ئەشـکەوتەکە "ڕاز" لـە جیهانێکی پڕ لە ئەفسووندا نوغرۆ بوو ، گوێ یەکانی پەردەیەك درا بە سەری دا و لە دەوروبەری خۆی دابڕا ، پاش ماوەیەك لـە کپبـوون سـەری بـەرەو ئاسمـان هـەڵبڕی و بینـی هەرچـی ڕەنگـی جـوان هەیـە لـە قـووڵایی ئاسمـان دا پـەرش بوونەتەوە ، بوونەوەرە سپی یەکان ئەڵقـەیان بەسـتووە و لـە نـاو دەریایـەك لـە ڕەنگدا سەما دەکەن ، یەکێك لەو پەری یە نازدارانـە بـانگی " ڕاز " ی دەکـرد و بە زمانێکی شیرین و سیمایەکی سپی بلوورینەوە بەرەو " ڕاز " باڵی دەگرتـەوە ، تەنی لەشی سووك بوو ، چڕی ماددە ڕەویەوە ، وردە وردە لاقەکانی لە زەوی دەبڕان ، باڵەکانی وەك باڵی دالێك بلاو دەبوونەوە ، پڕ بـە سـنگی هـەوای هـەڵ دەمژی ، تا سەر ئەنجام کەوتە باڵەتەپێ ، فڕین بەرەو ڕەنگـە زیـوینی یـەکان ، بەرەو بوونەوەرە سپی یـەکان ، بـەرەو کـۆڕی عیـشق و ئەڵقـەی سـەمای پـەری یەکان ، فڕی تا ئەو جێگەی مرۆڤ دەبێت بە چێژ ، دەبێت بە ڕەنگ ، بـە بـۆن ، پاشان وردە وردە بەرەو زەوی گەڕایەوە لەگەڵ بەرکـەوتنی پێیـەکانی لـە زەوی بـە ئاگـا هاتـەوە و بینـی لـە سـەر جێگـەی نوسـتنە و داپـیرەی بـە دیاریـەوە دانیشتووە و فرمێسك دەڕێژێ ، لە سەر جێگەکەی ڕاست بوویەوە و دەستەکانی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە گەردنی داپیرەی ئالاند ، پاشان پرسیاری لێ کرد: ( داپیرە گیان بۆچی دەگریت؟! )

داپیرە: ( چوزانم ، شوکر ناساغ نیت؟! )

ڕاز: ( نا ، زۆر باشم ، چی ڕوویداوە؟! )

داپیرە: ( لە دوێنێوە بێ ئاگایت ، دکتۆرم هێنا و وتی: هیچی نی یە تەنها خەوی لێ کەوتووە )

ڕاز: ( کێ منی هێنایەوە بۆ ئێرە؟! )

داپیرە: ( بۆ خۆت هاتیتەوە ، بەلام هەرچی پرسیارم لێ دەکردی هیچ وەلامت نەبوو ، ڕاستەوخۆ خۆت خزاندە ژوورەکەت و خەوت لێ کەوت )

ڕاز – لە دڵی خۆی دا –: ( بە ڕاستی جیهانێکی سەیرە ، هەرچی ئەو پیرەمێردە دەبینم ڕووداوێکی ناسروشتی لێم ڕوو دەدات ) پاشان بە دەنگی بەرز : ( داپیرە گیان برسیمە )

داپیرە: ( گیانی داپیرە ، هەستە با بچینە چێشتخانەکە )

" ڕاز " ئەو ڕۆژە نەیتوانی بچێت بۆ قوتابخانە ، عەسرەکەی بۆ هەواڵ پرسین چەند برادەرێکی بە دەر کەوتن ، " یوسوف " بە گەرمی لە جێگەی مامۆستایان و هەموو پۆلەکەیان هەواڵپرسی " ڕاز " ی کرد و وتی: ( هەموان خەمی دیار نەبوونی تۆیان بوو ، دەیانوت "ڕاز " زۆر دەگمەن لە قوتابخانە دوا دەکەوێت ، خوا بکات شتێك ڕووی نەدابێت)

" ڕاز " سوپاسی هەموویانی کرد و ناساغی کرد بە بیانووی نەچوونی بۆ قوتابخانە...

" ڕاوێژ " سەیرێکی قووڵی " ڕاز " ی کرد و وتی: ( لە ناوەوە وا هەست دەکەم ڕووداوێکی سەیر لە تۆ ڕوویدابێت ، من بە حوکمی زۆر نزیکیم لە تۆوە هەموو شتێك لە سیمات دا دەخوێنمەوە ، دەم و چاوت شتێکی تر بە من دەڵێت...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( تۆ هەمیشە بە هۆی خەمخۆریتەوە بۆ من شتێك هەست پێ دەکەی لەوانەیە وا نەبێت ، هیچ خەمی منت نەبێت ، هەمان " ڕاز "ە کەی جارانم )

ڕاوێژ: ( من تەندروستی و ئاسودەیی تۆم دەوێت )

پاشان باسەکەیان بە ئاقارێکی تردا گۆڕی و " جوتیار " پرسیاری کرد: ( یارییەکەی ئەم شەوتان بینی؟)

شاروخ: ( من بینیم.. بەڵام خۆزگە نەمبینیبایە )

یوسوف: ( بۆ؟)

شاروخ: ( یەکەمجارە هەڵبژاردەی " بەرازیل " تووشی ئاوا شکستێك دەبێتەوە)

یوسوف: ( ژیان ڕستێکی درێژکراوەیە لە سەرکەوتن و شکست ، مرۆڤ بە بێ شکست تامی سەرکەوتنەکان ناکات ، کەسی زانا و ئازا ئەو کەسەیە لەشکست سەرکەوتن دروست بکات...)

جوتیار: ( مرۆڤ چۆن دەتوانێ لە شکست سەرکەوتن بە دەست بهێنێ؟)

یوسوف: ( هەڵبژاردەی بەرازیل شکستی خوارد ، هەموو هەڵبژاردەکە بە تاکە کەسێك بشوبهێنە ، ڕاهێنەری هەڵبژاردەکە ئەقڵی تاکە کەسەکەیە ، ئەگەر ڕاهێنەر ئەو خاڵە لاوازانەی کە بوو بە هۆی دۆڕانی تیپەکەی دیاری بکات و بە وردی لە سەر یاریزانەکان کار بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکان بکات ، ئەوا ئەو شکستە سەرکەوتنێکی گەورە دەستەبەر دەکات ، کەوابوو سەرەتای دەست پێ کردنی سەرکەوتن لە ناوەڕاستی شکست دایە ، مرۆڤ لە کاتی شکست دا توانای پیاچوونەوە و دیاری کردنی هۆکارەکانی شکستی هەیە ، بەڵام لە کاتی سەرکەوتندا خاڵە بەهێزەکان لە لای بەرجەستە دەبێت ، ئەو لە کاتی سەرکەوتندا بیر لەو هێز و توانایانەی خۆی دەکاتەوە کە سەرکەوتنی بۆ ئەو دەستەبەر کردووە ، وەلێ لە کاتی شکست دا بە پێچەوانەوەیە )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شاروخ: ( مەرج نی یە هەموو شکستێك سەركەوتنی بە دوادا بێت ، مرۆڤ هەیە شکست دەخوا و لە هەموو ژیانیدا ڕاست نابێتەوە)

یوسوف: ( بەڵێ ڕاستە ، بەڵام من وشەی " شکست " بۆ ئەو دیاردەیە بەکار ناهێنم ، ئەوەی تۆ دەیڵێی ی شکست نی یە ، بەڵکو تێکشکانە ، شکست کەوتنێکە هەستانەوەی بە دوادا بێت ، لە کاتێك دا تێکشکان کۆتا خاڵە و جارێکی تر ئەگەری بەرزبوونەوەی لێ ناکرێت )

شاروخ: ( جا کەوابوو " شکست و سەرکەوتن " تەنها ناوی "سەرکەوتن " ی لێ بنێ و "تێکشکان " یش ناو بنێ " شکست" ، چونکە گەر " شکست " جۆرێك بێت لە " سەرکەوتن" کەوابوو تەنها سەرکەوتن بوونی هەیە)

یوسوف: ( دەتوانین بڵێین سەرکەوتن دوو جۆرە: جۆرێکیان لە خاڵە بەهێزەکانەوە بە دەست دەهێنرێ ، جۆرەکەی تریان لە پیاداچوونەوە و دیاری کردنی خاڵە لاوازەکانەوە سەرەتاکەی دادەمەزرێت )

ڕاز: ( کاك " یوسوف " ئەوەی سەرنجی من ڕادەکێشێ و بەهێزیی ئەقڵ و بیری تۆ نیشان دەدات گەمە کردنی تۆیە بە وشە و یاریکردنتە لە ناو زمان دا...)

یوسوف: ( حەز دەکەم ڕۆشنتر لە مەبەستت بگەم )

ڕاز: ( تۆ جارێك وشەی " شکست " لە بەرانبەر ، یاخود دژ بە وشەی " سەرکەوتن " بەکار دەهێنی و ئێمەش بەو بەکارهێنانە قەناعەت پێ دەهێنی ، دواتر وشەی " شکست " و وشەی "سەرکەوتن" هاوملی یەکتر دەکەیت و دەیانکەیت بە هاوواتا و هاومانای یەکتری ، ئەمەش زیرەکی و بەراعەتی تۆ بە گەمەکردن لە ناو زمان دا دەسەلمێنێ ، کە " شاروخ " ڕێگەت لێ دەگرێت و پێت دەڵێ: مەرج نی یە هەموو شکستێك سەرکەوتنی بە دوادا بێت ، ڕاستەوخۆ دێیتە دەست و گەمەیەکی تر دەدۆزیتەوە ئەویش دۆزینەوەی وشەی "تێکشکان" ە ، ئەمەش دیسان هونەرێکی ترە لە گەمەکردنی تۆ لە ناو زماندا )

یوسوف: ( منیش بە توانایەکی لە ڕادەبەدەری تۆ مەدهۆش دەبم )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: ( ئەو توانایە کامەیە؟)

یوسوف: ( تۆ دەتوانیت هەموو شتێك پێناسە بکەیت ، دەتوانیت چوارچێوە بۆ هەموو قسە و بیر و فەلسەفەیەك بدۆزیتەوە ، تۆ بەو پێناسەکردن و چوارچێوە دۆزینەوەیە بۆ بەرانبەرەکەت خۆت بە تواناتر و بالآتر لە کەسی پێناسەکراو نیشان دەدەیت ، تۆ هەمیشە ئەو بازنە بەرینەیت بە دەوری بازنەکانی تردا دەهێنرێیت )

ڕاز: ( پێت وانی یە بەم پێناسەیەی کە تۆ بۆ منی دەکەیت منت چوارچێوەدار کرد و بووی بەو بازنە فرە بەرینەی بە دەوری بازنە بەرینەکەی مندا دەهێنرێیت؟)

یوسوف: (بەڵێ من ئەو بازنە بووم بازنەی تۆم هێنایە ناو خۆمەوە ، بەلآم بازنەکەی من تا ئەو کاتەی تۆ پرسیارەکەت نەکرد بوو بازنەی بەرین بوو ، کە ئەم پرسیارەی دوایت کرد دیسان منت هێنایەوە ناو خۆت و ژێر دەستەت کردمەوە)

ڕاز: ( ئەمەش گەمەیەکی تری زمانە )

یوسوف: ( ئەمەش پێناسەکردن و چوارچێوەدار کردنێکی ترە )

هەموو دایانە قاقای پێکەنین و پاش ماوەیەکی تر لە دانیشتن برادەرانی "ڕاز"خواحافیزیان کرد و ڕۆیشتن..

** ** ** ** ** **

پوورە " فاتم" داواکەی " نەسرین" خانی بۆ سەردانی "مەولانا " بە خاڵە " مەولود" گەیاند و ئەویش ڕۆژێکی دیاری کرد و هەرسێ بە یاوەری مامۆستا " ئەحمەد " و بە ئۆتۆمبێلەکەی ئەو سەردانی گوندەکەی " مەولانا " یان کرد ، لە ڕێگەدا خاڵە "مەولود" لە مامۆستا " ئەحمەد" پرسیاری کرد : خەم و پەژارە بە ڕووخسارتەوە دەبینم ! [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا " ئەحمەد" لە وەڵامیدا وتی: باس و خواسێك ناخی داگیر کردووم و دەمەوێت هیچی لە بارەوە نەدرکێنم تا دەگەینە لای ئەم پیاوەی کە ئێوە زۆر بە مەزن ناوی دەهێنن...

گەیشتنە بەرەوە و لایاندایە ماڵی "مەولانا " و خۆشبەختانە گوندەکەی بەجێ نەهێڵا بوو ، " مەولانا " پێشوازی لێکردن ، "نەسرین" خان بە بینینی "مەولانا " دایە قوڵپەی گریان و ماوەیەکی باش فرمێسکی داباراند ، موهتەدا "نەسرین" خانی ناسییەوە ، بە بینینی ئەو ژیانی " چوار" ساڵی زانکۆی هاتەوە بەر یاد...

مامۆستا " ئەحمەد " گلەیی لە پوورە "فاتم" و خاڵە "مەولود" کرد بۆچی تاکو ئێستا باسی "مەولانا " یان لای ئەو نەکردووە ، ئەوان چەند جارێك سەردانیان کردووە ، بەڵام ئەویان لەگەڵ خۆیان نەبردووە...

"مەولانا " بۆ دامەزراندنی متمانەی مامۆستا " ئەحمەد " بە هێزی عیرفان و دەسەڵاتی مەعنەوی عاریفان و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی ناخی مامۆستا " ئەحمەد " ی داگیر کرد بوو وتی ( ئەو قسانەی ئەم شەو میوانەکەت بۆی کردی هەموو ناڕاستە ، بەڵگەش بۆ ناڕاستی قسەکانی کە گەڕایتەوە پێی بڵێ: چەندە پارەت بۆ کردنی ئەو قسە ناڕاستانە وەرگرتووە ، ئەگەر حاشای لێکرد پێی بڵێ: بەو ناونیشانەی کەسەکە شەو هاتە ماڵتان و نیوەی پارەکەی پێ دایت و وتی: نیوەکەی تری دواتر بۆت دەهێنم...

موهتەدا بە " نەسرین " خانی وت ( لە نەخۆشیەکەت مەترسە ، چونکە ترس و دڵەڕاوکێت هۆکاری زیادکردنی نەخۆشییەکەیە ، باری دەروونی خۆت ئاسوودە بکە ، خەمی داهاتووی منداڵەکان کارێکی باشە بەڵام دڵەڕاوکێ و خەمۆکی لە خۆت دوور بخەرەوە ، منداڵەکانت هەموو کەسانی چاك و پاك دەردەچن بە تایبەت کوڕە بچووکەکەت...

بە پوورە " فاتم" ی وت ( خۆزگە " فاتمە" خان بە قەدەر تۆ دڵ و دەروونم گوشاد دەبوو ، خۆزگە خودا دەرونێکی وەك دەروونی تۆی پێ دەبەخشیم ، ئەو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاکێتی و ڕۆح سووکییەت پیرۆز بێت ، ئومێد دەکەم خودا بە هۆی ئەو دڵە مەزنەی تۆوە ئێمەش ببەخشێت ، دواتر ڕووی کردە خاڵە " مەولود " وتی: دوێنێ شەو هەتا بەیانی لەگەڵت بووم...

خاڵە " مەولود " یش وتی: ئەی بۆچی داوایەکەت جێبەجێ نەکردم و کارەکەت بۆ ئەنجام نەدام؟!

مەولانا وتی: " پیری مەزن " ڕازامەندی لەسەر نەبوو ، ئەو پلەیە زۆری دەوێت تاکو مرۆڤ هەنگاوی یەکەمی بۆ بنێت...)

ئەو ڕۆژە تا ئێوارە میوانەکان لە لای " مەولانا " مانەوە و دواتر سواری ئۆتۆمبێلەکەی مامۆستا " ئەحمەد " بوون و بۆ شار گەڕانەوە ، لە ڕێگەدا خاڵە "مەولود " پرسیاری لە مامۆستا " ئەحمەد " کرد و وتی ( وەڵامی خۆتت بەر دەستکەوت ؟ )

ئەویش وتی ( بەڵێ، مەمنونی هەمووتانم کە لەم سەفەرەدا منتان لەگەڵ خۆتان هێنا ، بەر لەوەی سنگی خۆمتان بۆ واڵا بکەم دەمەوێ ئەو پرسیارە لە خاڵە " مەولود " بکەم : ئەو چەند قسەیە چی بوو بە نێوان تۆ و " مەولانا" دا گوزەری کرد ؟!)

خاڵە مەولود ( ئەو شەوەی "مەولانا" ئاماژەی پێدا لای من شەوێکی زۆر تایبەت بوو ، من لە خزمەتی " مەولانا و پیری مەزن" دا بووم ، ڕۆحەکانمان ئاوێزانی یەکتر بوو بوون ، داوام لە " مەولانا " کرد : لە مەقامی چاودێری ( المراقبة ) دا کارم لەسەر بکات و بەو پلە باڵایەی عیرفانم بگەیەنێت ، ئەویش ڕازی نەبوو ، چونکە " پیری مەزن " ئاماژەیەکی بەودا کە من لێی تێنەگەیشتم ، تاکو ئەمڕۆ خۆی فەرمووی: "پیری مەزن" لەسەر داوایەکەت ڕازی نەبووە... ئێستا تۆش باسەکەی خۆتمان بۆ بکە و پێمان بڵێ چی ڕوویداوە؟)

مامۆستا ئەحمەد ( دوو ڕۆژ لەمەوبەر ناسراوێکم هات و هەواڵێکی زۆر تاڵ و ناخۆشی دا بە گوێمدا ، هەواڵەکە [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هەموو دونیام لێهاتۆتەوە یەك و نەمدەزانی چی بکەم و لە چییەوە دەست پێ بکەم ، ئەو کچە باوکی نییە و هەموو ڕاز و نیاز و گرفت و پرسێکیان لە لای منە ، ئەو مرۆڤە ناپەکە هات و تۆمەتی ناپاکی دایە پاڵ ئەو کچە بێ تاوانە ، ئەم هاتنەم بۆ لای "مەولانا" ژیانی پێ بەخشیمەوە و لە زەلکاوی گومان دەری هێنام ، ئێستا ماوە بچم بۆ گیانی ئەو مرۆڤە ناپاکە و ئەوەی " مەولانا " فەرمووی لەگەڵی ساغ بکەمەوە ، بەڵام خاڵە "مەولود" داوایەکم لە خزمەتتدا هەیە ، ئەویش ئەوەیە لەگەڵم بێی و پێکەوە ئەو مرۆڤە ناپاکە بانگ بکەین و لێی بپێچینەوە )

خاڵە "مەولود" لەسەر داواکەی مامۆستا " ئەحمەد " ڕازی بوو ، بەڵێنی پێدا کە گەڕانەوە چاویان بەو کەسە بکەوێت...

بۆ سبەینێ مامۆستا " ئەحمەد و خاڵە مەولود" پیاوەکەیان بانگ کردە ماڵی مامۆستا "ئەحمەد" و پێیان وت ( لە پێناوی چیدا ئەو تۆمەتە گەورەیەت دایە پاڵ ئەو کچە بێ گوناهە ؟ ! )

پیاوەکە کە ناوی " کەمال" بوو وتی ( کەسێکی زۆر باوەڕپێکراو بۆی باس کردووم )

مامۆستا ئەحمەد ( دەتوانیت ناوی ئەو کەسەمان پێ بڵێیت؟)

کەمال ( ناتوانم ، چونکە داوای لێکردووم ناوی نەهێنم )

مامۆستا ئەحمەد ( لەبەر چی بوو تۆ ئەو هەواڵەت بە من گەیاند؟)

کەمال ( هیچ ، تەنها جیرانمی و ڕێزت لە لام هەیە و پێم ناخۆش بوو بنەماڵەکەتان لەکەدار بێت )

- ( یانی تۆ بەهۆی خەمخۆرییەوە ئەو هەواڵەت بە من گەیاند؟ ! )

+ ( گومانت نەبێت )

- ( ئەی ئەگەر ئێمە سەلماندمان تۆ بەهۆی شتێکی ترەوە ئەو هەواڵەت گەیاندووە ، تۆ چی دەڵێیت؟ ! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لێرەدا " کەمال " ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و زمانی بە باشی گۆی نەدەکرد و وتی + ( لە مەبەستت تێناگەم ؟! )

- ( باش لە مەبەستم حاڵی دەبیت ، ناوی ئەو کەسەمان پێ دەڵێیت تۆی ڕەوانەی لای من کردووە یان بەڵگەت بۆ بهێنینەوە ؟ )

+ ( ئاخر ناتوانم ناوی بهێنم ! )

- ( بۆ ؟ خۆ باجت لێ وەرناگرێت ؟! )

+ ( نا ، مەبەستم ئەوە نییە ، ئەو نایەوێت ناوی ئاشکرا بێت )

- ( بڕوانە " کەمال " ، ئەم شێر و ڕێوی یە بۆ من مەهێنەرەوە ، ناوی کەسەکەمان پێ بڵێ ، چونکە بەڵگەی تەواومان لەسەر تۆ و ئەو کەسە بە دەستەوەیە )

+ ( بەڵێنم پێدەدەیت لە لای ئەو ناوم نەهێنیت ؟ )

- ( بەلاَم تۆش بەشی خۆت تاوانباریت ! )

+ ( بۆ من تاوانبارم ؟! )

- ( لە بەرئەوەی بە وەرگرتنی پارە تۆمەتی ناڕاست بلاَو دەکەیتەوە )

+ ( پارەی چی ؟! من پارەم وەرنەگرتووە )

- ( ئەی ئەگەر ناونیشانی پارەکەمان پێدایت ، تۆ چی دەڵێیت ؟ )

+ ( فەرموو بیڵێن با بزانم پارەم وەرگرتووە یان نا ؟! )

- ( بەو ناونیشانەی نیوەی پارەکەت وەرگرت و نیوەکەی تری وتی: دواتر بۆت دەهێنم )

کە مامۆستا " ئەحمەد " ئەو قسەی کرد " کەمال " شڵەژان و تێکچوون ڕووی تێکرد و وتی +( مامۆستا " ئەحمەد " تەنها ئەم جارە بمبەخشە ، ئەو کابرا ناپاکە کارەکەی پێ کردم ، هەژاری پاڵی پێوەنام بەو کارە هەڵبستم ، بە هەرچی شێخ و پیرە حەزم نەکردو [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لێرەدا "کەمال " دەستی بە گریان کرد و خۆی خست بەسەر دەست و پێی ماموستا " ئەحمەد" دا...

ماموستا ئەحمەد وتی – ( جارێ ناوی کەسەکەمان پێ بڵێ )

+ ( کەسەکە " شاوەیس" ی جیرانی ماڵی کاکتە )

ماموستا ئەحمەد – لەبەرخۆیەوە – ( ئەی " شاوەیس" ی ناپاك! ئێستا تێدەگەم بۆچی ئەو تۆمەتەی بۆ ئەو کچە بێ بابە بەستەزمانەی کاکم هەڵبەستووە ، ناهێڵم لە دەستم دەربچیت ، تۆڵەت لێدەکەمەوە)

خاڵە مەولود ( ماموستا " ئەحمەد " مرۆڤ کە خودای لەگەڵ بوو با ترسی لە هیچ شتێك نەبێت ، تۆ کە خودا کۆمەك و پاڵپشتتە پێویست ناکات تۆڵەی تاکە کەسی بکەیتەوە ، تۆ پێویستە لێبوردە بیت ، ئەوەندە بەسە کەسەکان شەرمەزار بوون و کچەکە و بنەماڵەکەشتان لە درۆ و تۆمەت بە سەلامەت دەرچوون ، " مەولانا " ڕازی نییە تۆ بەکاری تۆڵە سەندنەوە هەڵبستیت ، ئەو گرفت و خەمەکەی لەسەر تۆ ڕەواندەوە و سوپاس بۆ خودا کچەکەش پاك و بێگەرد دەرچوو ، بۆیە نابێت بە هیچ جۆرێك بیر لە تۆڵە کردنەوە بکەیتەوە )

ماموستا ئەحمەد ( خاڵە مەولود ، ماوەیەك لەمەوبەر ئەو مرۆڤە ناپاکە داوای ئەم کچەی کرد بۆ یەکێك لە براکانی و کچەکە پێی ڕازی نەبوو ، لە ڕاستیدا منیش حەزم بە خزمایەتی ئەوان نەبوو ، "شاوەیس" بۆ تۆڵە سەندنەوە لە من و ئەو کچە بەم کارە چەپەڵەی هەستاوە و ئەم مرۆڤە خۆفرۆشەی ڕەوانەی لای من کردووە )

خاڵە مەولود ( خودا بەرگری کرد لە تۆ و ئەو کچە تاکو سوپاسگوزاری بن نەوەك تۆڵە بکەیتەوە ، تۆ دەبێت لە جێگەی تۆڵە ئەو دوو کەسە بە من ببەخشی )

" کەمال " کە ئەوەی بیست خۆی خست بەسەر دەست و پێیەکانی خاڵە " مەولود " دا و داوای لێکرد لە لای ماموستا " ئەحمەد " تکاکاریان بێت...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مامۆستا ئەحمەد ( کاتێك لێیان دەبوورم بە مەرجێك هەردووکیان بێنە ماڵەکەم و دان بە تاوانەکەی خۆیاندا بنێن و دەستی بەرێزت ماچ بکەن و بەڵێن بە تۆ بدەن نەچنەوە سەر ئەو کارە دزێوەیان )

کەمال وتی ( تۆ تەنها لێمان خۆش ببە ئێمە ئامادەین هەموو داوایەکانت ئەنجام بدەین ، بەڵام با خەڵك پێمان نەزانێت )

ئەو ئێوارەیە " کەمال و شاوەیس " چوونە لای خاڵە " مەولود " و تکایان لێکرد لەگەڵیان بێت بۆ ماڵی مامۆستا ئەحمەد ، خاڵە مەولودیش وتی ( بە یەك مەرج لەگەڵتان دێم )

شاوەیس ( مەرجەکەت لەسەر سەرمانە )

خاڵە مەولود ( بەڵێنم پێبدەن لە کاری خراپە دەست بکێشنەوە و جارێکی تر نەچنەوە سەری )

هەردووکیان ( بەڵێن بێت لەسەر دەستی تۆ خاڵە " مەولود " جارێکی تر نەچینەوە سەر خراپە)

خاڵە مەولود ( دەزانن ئەگەر بەڵێنەکەتان بشکێنن چیتان بەسەر دێت؟)

کەمال ( چیمان بەسەر دێت؟! )

خاڵە مەولود ( ڕووبەڕووی بەڵای گەورە دەبنەوە )

هەردوو لەگەڵ خاڵە "مەولود" چوونە ماڵی مامۆستا " ئەحمەد" و دوای دەربڕینی دونیایەك خەجاڵەتی و دەریایەك لە پاڕانەوە و بەڵێندان مامۆستا " ئەحمەد " لێیان بوورا )

خاڵە " مەولود" یش وتی ( پێشنیار دەکەم هەفتەی داهاتوو هەر چوارمان بە ئۆتۆمبێلەکەی مامۆستا " ئەحمەد " سەفەرێکی ئەو گوندانەی نزیك بە چیاکە بکەین و کێ نالێت لەوێش چاومان بە پیاوێکی گەورە ناکەوێت و هەموومان لێی بەهرەمەند نابین! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خاڵە "مەولود" مەبەستی بینینی " مەولانا " بوو ، بۆیە هەموو بەڵێنیان دا هەفتەی داهاتوو سەردانەکەیان بکەن...

لە دوای ئەو سەردانە بۆ لای " مەولانا " کەمال و شاوەیس و مامۆستا ئەحمەد بوون بە برای گیانی بە گیانی و برازاکەی مامۆستا "ئەحمەد" یش بۆ برایەکی خێزانەکەی "شاوەیس " داواکرا و خۆشەویستی و تەبایی جێگەی ڕق و کینەی گرتەوە...

** ** ** ** ** **

دوانیوەڕۆیەك " مەولانا " لە ئەشکەوتەکەدا لە بیرکردنەوەیەکی قووڵ دا بوو ، چاوەکانی لێك نابوو ، بە دەنگی پێ بە ئاگا هاتەوە و چاوەکانی کردەوە ، زۆری نەخایاند دوو کەس خۆیان بە ئەشکەوتەکەدا کرد ، یەکێکیان گەنجێکی خەڵکی گوندەکەی "مەولانا" بوو، ئەویتریان پیاوێکی ڕیش سپی بوو ، دیار بوو گەنجەکە وەك ڕێ نیشاندەر بۆ لای "مەولانا " لەگەڵی هات بوو ، سەلامیان کرد ، گەنجەکە هەندێ خواردن و شتومەکی بۆ "مەولانا " لەگەڵ خۆی هێنا بوو ، توێشەبەرەکەی دانا و بە پیاوە ڕیش سپییەکەی وت: ( ئەم پیاوە " مەولانا " یە ) پاشان ڕووی لە "مەولانا" کرد و وتی ( گەورەم من دەبێ بگەڕێمەوە ، دەبێ مۆڵەتم بدەن )

"مەولانا " گەنجەکەی بەڕێ کرد و ڕۆیشت ، پاشان ڕووی لە پیاوە ڕیش سپییەکە کرد و وتی ( بەخێر بێیت ، زۆر لەبەرچاوم نامۆ نیت )

پیاوە ڕیش سپییەکە – بە گریانەوە – ( برای شیرینم "موهتەدا " بۆ ئەوەندە پیر و لاواز بوویت؟! )

مەولانا ( بڵێم چی؟ گەنجێتی نامێنێتەوە و زوو کۆچمان لێدەکات )

پیاوەکە ( گەر ئەو گەنجە تۆی نیشان نەدابام هەرگیز نەمدەناسیتەوە ! )

مەولانا ( تۆ کێیت ؟! )

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پیاوەکە ( من "سمکۆ"م ، "سمکۆ" چەتوونە یاخییەکەی جاران )

"موهتەدا و سمکۆ " چەند کاتژمێرێك چاوەکانیان وشك نەدەبوویەوە و بێدەنگی باڵی بەسەریاندا کێشا بوو، تەنها تەماشای یەکتریان دەکرد و فرمێسکیان هەڵدەوەراند...

موهتەدا بە " سمکۆ " ی وت ( با بگەڕێینەوە بۆ گوندەکە و لە ماڵەوە میوانداریت لیێ بکەم )

سمکۆ ( ئێرەم پیێ خۆشە ، هەڵدێم لە ئاوەدانی ، لە چوارچێوەی دیوارەکان بێزارم )

ئەو شەوە "سمکۆ " کەوتە گێرانەوەی سەربوردەی مەینەتییەکانی و وتی ( ئازار و مەینەتییەکانی تۆیان بۆ باس کردووم ، حەز دەکەم گویێ بۆ بەسەرهاتی من بگریت ، بە گێڕانەوەی مەینەتییەکان  ئاسوودە دەبم )

موهتەدا ( بە بەشێکی ئاگادارم ، پێم خۆشە گوێبیستی بەشەکەی تری ببم )

سمکۆ ( بە هەر دەردی سەرییەك بوو گەیشتمە " ئەورووپا " و تێکەڵ بە دونیایەك بووم کە بۆی تامەزرۆ بووم ، خۆم لە هەرچی حەزی جەستەیە خاڵی کردەوە ، تێرکردنی ورگ و داوێن بوو بە خەمی شەو و ڕۆژم... خواردن ، خواردنەوە ، ڕابواردن سیێ خەمی بەردەوامم بوون ، لە چێژێکی ماددیەوە بۆ چێژێکی تر ، لە حەزێکی جەستەوە بۆ حەزێکی تر ، لە خواردنەوەیەکی بێهۆشکەرەوە بۆ خواردنەوەیەکی تر، بەو جۆرە داهێنانم لە چێژی مادیدا دەکرد ، تێرم نەدەخوارد ، دانەدەمرکامەوە ، بە دوای چێژی گەورەتر و گەورەتردا دەگەڕام ، شەوێك چەند برادەرێك لام مانەوە و باسی تام و چێژ و سوودەکانی تلیاك و ماددەی سڕکەریان بۆ کردم ، منیش لەسەر زمانی ئەوانەوە عاشقی ئەو ماددە بێهۆشکەرە بووم ، پرسیارم کرد : چۆن بەدەستی بهێنم ؟ وتیان: ئێمە دەتوانین بۆت پەیدا بکەین ، بەلآم بە مەرجێك کارمان لەگەڵ بکەیت... پرسیم : چ کارێك؟ وتیان: بازرگانی تلیاك...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەڵێ ، تێکەڵ بە جیهانی ئەو دەستە مرۆڤە ناپاکە بووم و کەوتینە بازرگانی کردن بە تلیاك ، چەند ساڵێك خەریك بووین و دەستمان بە چەندین تاوان سوور بوو ، سەرئەنجام دەستی یاسا گەیشتە سەرمان و من و دوو کەسی تریان دەستگیر کرد و لە دادگا "بیست و پێنج" ساڵ زیندانی درا بەسەرمدا و ماوەی چەند مانگێکە لە بەندیخانە — دوای تەواوکردنی ئەو ماوەیە لە زیندان — هاتوومەتە دەرەوە ، بەندیخانە منی گۆڕی بە مرۆڤێکی تر ، کەوتمە بیرکردنەوە لە هەڵەکانی تەمەنم ، قسەکانی تۆم هاتەوە بەر یاد ، گەڕامەوە بۆ بەرائەتی منداڵی و سادەبوونەوە ، " بیست و پێنج" ساڵ زیندانی ڕۆحی منی لە زیندانی جەستەم قوتار کرد ، تەنها کەسێك لەم نیشتمانەدا بیرم لێ دەکردەوە تۆ بوویت ، شەوانە دەهاتیتە لام و دڵنەوایت دەکردم ، ڕێگەت نیشان دەدام ، ئاواتت لا دروست دەکردم ، هیوات پێ دەبەخشیم ، "بیست و پێنج " ساڵ لە زینداندا من لەگەڵ تۆدا بووم ، زۆربەی ئەوانەی لەگەڵ مندا بوون خەم و ئازارەکانی زیندان فەوتاندنی ، بەڵام من بە هیوای دیداری تۆوە ، بە هیوای ئەو ڕۆژەی دەرگای زیندانم لێ دەکرێتەوە شەوم دەدایە دەم ڕۆژ ، تۆ شەوانە پێت دەوتم : "سمکۆ " من و تۆ یەك دەگرینەوە ، پێکەوە دەژین و پێکەوە دەمرین ، ئارام بە ، بە ژیان گەشبین بە... ئەوا یەکمان گرتەوە ، ئیتر من تۆ بەجێناهێڵم ، منیش دەمەوێت لەم ئەشکەوتەدا بژیم ، نامەوێت شەو و ڕۆژ لێت جیا ببمەوە ، ئەم تەمەنەی کە ماوە پێکەوە بەسەری دەبەین و پێکەوەش دەمرین ، تۆ بۆخۆت لە بەندیخانەدا پێت وتم : پێکەوە دەمرین ، لە یەك ڕۆژدا دەمرین...)

موهتەدا ( ژیان لەم جێگەدا ئارامی گەرەکە )

سمکۆ (من ئازاری زۆرم چەشتووە ، ئەم جێگەیە لای من بەهەشتە ، خەمی منت نەبێت..)

موهتەدا ( چەندە پێت خۆشە بمێنەرەوە)

** ** ** ** ** **

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

شەوێك " ڕاز " تەلەفونی بۆ ماڵی خاڵی كرد و دوای هەواڵ پرسینی خاڵی و " سێبەر خان " داوای كرد هەندێ قسە لەگەڵ " لاڤە " دا بكات ، " ڕاز " داوای چاوپێكەوتنێكی لە " لاڤە " كرد ، ئەویش ئامادەیی دەربڕی ، بەڵام لە كوێ یەكتر ببینن ؟ باشترین شوێن ماڵی داپیرەیە و بەڵێنی دا سبەی دوای نیوەڕۆ لەگەڵ " ئالان " ی برای سەردانی ماڵیان بكات...

مامۆستا " ئەحمەد " و " سێبەر خان " یش ئەو نزیكبوونەوەی "لاڤە و ڕاز " یان پێ خۆش بوو ، بە تایبەت كە دەیانبینی " ڕاز " گەنجێكی ڕۆشنبیری ڕەوشت بەرزە و داپیرەش ئافرەتێكی ماقووڵی پڕ لە سۆزو میهرە...

هاتنی " لاڤە " پوورە " فاتم " ی زۆر دڵخۆش كرد ، ناوچاوانی "لاڤە " ی ماچ كرد و "ئالان" ی لە ئامێز گرت و دەم و چاوی خستە ناو هەردوو لەپی دەستییەوە ، پوورە " فاتم" بە ڕادەیەك میهرەبان بوو تەنها یەك جار بینین بەس بوو بۆ خۆشویستنی ، ئەو لەو یەك جارە بینینەدا هەندە ڕێز و سۆز و قسەی شیرینی بۆ بەرانبەرەكەی دەردەبڕی كە دڵڕەقترین مرۆڤی دەهێنایە جۆش و خرۆش ، ئەو ئافرەت بوو بە مانای قووڵ و پیرۆزی وشەی " ئافرەت" ، لە ناخی دا كەسێكی مەزن بوو ، دوور بوو لەڕق و كینە ، بە یاسای خۆشەویستی یاخیترین مرۆڤی كەمەندكێش دەكرد و دەیهێنایە ژێر بار ، ژیان و ڕەفتاری پوورە " فاتم " فەلسەفەیەكی نەنوسراوەی تایبەت بوو ، هەڵس و كەوتەكانی لەگەڵ دەوروبەردا بە ڕادەیەك ورد و پڕ حیكمەت بوو واهەستت دەكرد حەكیم و عاریفێكی زەمانەیە و لە ڕشتەیەكی فەلسەفی قووڵەوە كردارەكانی سەرچاوە وەردەگرێت ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ كام لەوانە نەبوو ، بەڵكو لەوانە مەزنتر بوو ، ئەو مرۆڤێكی سینەسافی پڕ لە میهر و جوانی بوو ، لە سروشتی پاك و پەری ئاسای خۆیەوە كارەكانی ئەنجام دەدا ، ئەمەش واتە " سادەبوونەوە " كە مەزنترین فەلسەفەیە...

" ڕاز " بە ڕوویەكی گەشەوە پێشوازی لە" لاڤە " كرد ، پوورە "فاتم " بە بیانووی سەیركردنی باڵندەكان و گوڵە ڕەنگا و ڕەنگەكانەوە دەستی " ئالان " ی گرت و ڕۆیشتن بۆ ناو باخچە بەرینەكە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

تەنها کەوتنی " لاڤە " لەگەڵ " ڕاز " دا شەرمێکی زۆری بە سەردا هێنـان و بۆ زاڵبوون بە سەر ئەو هەستەدا بە باس و خواسی قوتابخانە دەستیان پێ کـرد ، دوای ماوەیەك قسە و باسی دووبارە و پڕ لە ڕۆتین " ڕاز " وتـی: ( دەزانـی بـۆ حەزم بە بینینت بوو؟)

لاڤە: ( تا ئێستاش نازانم بۆچی دەتەوێ بمبینی! )

" ڕاز " هەندێ خۆی کۆکردەوە ، هەردوو دەسـتی لێـك ئـاڵان و بـە شـەرم و سەر داخستنەوە وتی: ( من... دەمەوێ پێت بڵێم... ئە... ژیان یاسـای تایبـەت بە خـۆی هەیـە و بـە سـەر مـرۆڤ دا دەیسەپێنێ... ئـە... یـەكێك لـەو یاسـایانە هاوسەرگیری یە... لە ڕاستی دا... من تۆ بە کچێکی ژیر و ڕەوشت بەرز تەماشـا دەکەم...ئیتر نازانم..! )

لاڤە: ( هەر ئەوەندە ، ژیرم و ڕەوشت بەرزم ، چیتر؟! )

ڕاز: ( لە ڕاستی دا لە ناوەوە هەستێکی غەریبم بەرانبەرت هەیە )

لاڤە: ( دەتوانی تەعبیر لەو هەستە غەریبەی خۆت بکەی ؟)

ڕاز: ( یانی هەست بە سۆز و بەزەیی دەکەم بەرانبەرت )

لاڤە: ( جا بۆ بەزەیت پیامدا دێتەوە ، خۆ شەل و کوێر نیم ؟! )

ڕاز: ( مەبەستم بە بەزەیی ، ئەوەیە...)

لاڤە: (چی یە؟! )

ڕاز: (مەبەستم ئەوەیە کە من... یانی " من تۆم خۆش دەوێ ")

لاڤە: ( ئەی بۆ لە سەرەتاوە وا ناڵێ ی؟)

ڕاز: ( ترسام بە هەڵە لێم بگەیت )

لاڤە: ( هیچ کەسێك لە خۆشەویستی بـە هەڵـە حـاڵی نابێـت ، خۆشەویستی زمانێکی ترە و بەر لەوەی بکرێت بە قسە لە دڵەوە هەستی پێ دەکرێت )

ڕاز: ( جا ئەگەر بە دڵ هەستت دەکرد کە من خۆشـم دەوێ ی بـۆ دەتویـست بە زمان ئیقرارم پێ بکەی؟! )

لاڤە: ( شایەتمان تەنها لە دڵەوە بەس نی یە ، بەڵکو دەبـێ بـە زمـانیش ڕای بگەیەنی )

ڕاز: ( پێم خۆشە بزانم هەستی تۆ ...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لاڤە: ( ئەگەر بە دڵ نەزانی هەستم چۆنە بەرانبەرت دیارە دڵت زیندوو نی یە... وەکو تۆ و لە تۆش زیاتر ، بەڵکو خۆت و خۆشەویستییەکەی ناو دڵت دورگەیەکی بچووکن لە دەریای خۆشەویستی مندا )

ڕاز: (" لاڤە " گیان لە بەردەم میهر و خۆشەویستی تۆدا هەست بە بچووکی خۆم دەکەم )

لاڤە: ( مەزنی تۆیە منی کردووە بە دەریایەکی بێ سنوور ، ئەگەر ڕۆحی شیرینی تۆ نەبووایە من بیابانێکی چۆڵ و بێ ئاو دەبووم )

ڕاز: ( خۆشەویستی نێوان من و تۆ خۆشەویستی منداڵی یە ، لە بیرت دێ بە منداڵی دەمگرتیتە باوەش و لە گۆمە ئاوەکان دەمپەڕاندیەوە ؟! )

لاڤە: ( ئەی لە بیرتە پێڵاوەکانت کەوتە ناو ئاوی چەمەکە و پێڵاوەکانی خۆمم لە پێ کردی؟ )

ڕاز: ( هەندێ جاریش دڵمان لە یەکتر دەڕەنجا و پێم دەوتیت : دایە گەورەم گەزۆم بۆ دەکڕێ ، بەشی تۆ نادەم)

لاڤە: ( منیش دەموت: جا منیش نانە قەیسیت بەش نادەم )

هەردوو دەستیان بە پێکەنین کرد ، زۆری نەخایاند داپیرە بە سینییەك و دوو چاوە خۆی کرد بە ژووردا و بە بزەیەکی شیرینەوە وتی: ( ئیشەڵلاّ ئەم چایە چای خۆشی دەبێ ، من و "ئالان " تێر بۆنی گوڵمان کرد ، سەیری کۆتر و قومرییەکانمان کرد ، بەلاّم وادەزانم قسەکانی نێوان ئێوە لە گوڵ بۆن خۆشتر و لە قومری جوانتر بووە )

" ڕاز و لاڤە " بە ڕوویەکی گەش و هەستێکی پڕ لە خۆشی لە بەر داپیرە هەستان و فەرموویان لێ کرد ، بەلاّم داپیرە چایەکەی دانا و وتی: ( دەچمەوە بۆ لای " ئالان " ، دەمەوێ چەپکە گوڵێکی جوان بۆ مامۆستا " ئەحمەد و سێبەر خان " ئامادە بکەم )

دوای چەند کاتژمێرێك لە قسەی خۆش و سەربوردەی منداڵی و باسی ژیانی داهاتوویان ، "لاڤە " داوای مۆڵەتی کرد و لەگەڵ " ئالان " بۆ ماڵەوە گەڕایەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو پاش نیوەڕۆیە بۆ " ڕاز و لاڤە " کاتێکی زێڕین بوو ، تا درەنگانێکی شەو " ڕاز " بیری لە یەك بە یەکی قسەکانی نێوان خۆیی و " لاڤە " دەکردەوە ، بە دەم بیرکردنەوەوە خەیاڵ بردیەوە و چاوەکانی خەو دایگرت و نوست...

لە خەونیدا سەردانی ئەشکەوتەکەی کرد ، سەری بردە ناو ئەشکەوتەکە پیرەمێردەکەی نەبینی ، ئاوڕی دایەوە لە ئاسۆیەکی زۆر دوورەوە پیرەمێردەکە بە پۆشاکێکی سپی یەوە بانگی " ڕاز " ی دەکرد ، تەکانی دایە بەر خۆی تاکو بەرەو لای پیرەمێردەکە بڕوات ، بەلاّم بە ئاگا هات و بینی لە جێ ی نوستنەکەی دوور کەوتۆتەوە...

بەیانییەکەی کاریگەری خەونەکەی پێوە دیار بوو ، بەلاّم خەیاڵی لای ئەشکەوت و پیرەمێردەکە بوو ، نەیزانی ئەو ڕۆژەی خوێندنی چۆن بەسەر برد ، برادەرە نزیکەکانی لە تەندروستی ئەویان پرسی ، بەلاّم هیچی لا نەدرکاندن ، بۆ سبەینێ هەندێ لە فەزای خەونەکە دوور کەوتەوە و باشتر کەوتە بەر چاوی برادەرانی ، ئەو ڕۆژە قوتابییەك لە وانەی " فیزیا " دا پرسیارێکی دەربارەی " کات " لە مامۆستاکەی کرد کە: ئایا " کات " بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە؟ ئەگەر هەیە جێگیرە یان گۆڕاوە؟

مامۆستای فیزیا: ( جیاوازی چی یە لە نێوان بەرسیلە و ترێ ی پێگەیودا ؟ دیارە هۆکاری زەمەن واتە " کات " بەرسیلە دەگۆڕێ بۆ میوەیەکی پێگەیو ، " کات " هێلکەیەکی پیتراو دەگۆڕێت بۆ گیاندارێکی کاملّی تەواو ، " کات "ە هاوین دەگۆڕێ بۆ زستان ، ڕۆژ دەکات بە شەو.. بۆیە کات بوونێکی بابەتیانەی هەیە ، بەلاّم بوونێکی بەرجەستە نە ، بوونێکی واتایی )

قوتابییەکە: ( مامۆستا تۆ دەڵێ ی " کات " بەرسیلە بۆ ترێ دەگۆڕێت ، لە ڕاستی دا خواردنی بەردەوامی دار مێوەکەیە بەرسیلە بۆ ترێ دەگۆڕێ ، ئەگەر ئەو بەرسیلەیە لە دار مێوەکە بکەینەوە و ساڵێك بە سەریدا تێ بپەڕێ ، ناگۆڕێت بۆ ترێ )

مامۆستا: ( ڕاستە ، خۆراکی دار مێوەکە هۆکارێکە ، بەلاّم ئەو خۆراکە لە کاتێکی دیاریکراودا گەرەکە وەری بگرێت ، ئەگەر ئەو بڕە خۆراکەی لە سێ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مانگدا بەرسیلەکە وەری دەگرێت ، بە یەك جار بیدەین بە بەرسیلەکە نەك نابێتە هۆی پێ گەیاندنی ، بەڵکو دەبێتە هۆی فەوتانی دار مێو و بەرسیلەکەش )

قوتابییەکە: ( ئەو قسەش وەڵامی هەیە ، دەتوانم بڵێم کەم کەم و بڕ بڕ دەبێ خۆراك بە بەرسیلەکە بدرێ و هیچ پەیوەندی بە کاتەوە نی یە)

مامۆستا: ( دروستە ، کاتیش بریتی یە لەو ماوەیەی کە تۆ کەم کەم و بڕ بڕ خۆراکەکە بە بەرسیلەکە دەدەی )

قوتابیەکە: ( گریمان " کات " بوونی هەیە ، باشە جێگیرە یان گۆڕاو؟)

مامۆستاکە: (" کات " ئەگەر لە کار و ڕووداو و شوێنی دابڕین یەکەیەکی جێگیرە ، کاتێك تێکەڵ بە جووڵە و کار و ڕووداو دەبێ بە پێ ی شتەکان دەگۆڕێ ، لای " ئەنیشتاین " کات ڕێژەییە و دەگونجێ یەك ڕووداو بۆ دوو کەس دوو کاتی جیاواز بێت)

قوتابییەکە: ( من وا هەست دەکەم ئامێری کاتژمێر جووڵەی مرۆڤ دەپێوێ نەك کاتی تێ پەڕ بوو ، کات هێڵێکی درێژ کراوەیە و مرۆڤ لە سەری جووڵە دەکات ، کاتژمێریش ئەو جووڵانە نیشان دەدات )

مامۆستاکە: ( دروستر وایە بڵێین : ئامێری کاتژمێر ئەو بڕە گۆڕاوەی " کات " نیشان دەدات کە مرۆڤ جووڵەی تیادا کردووە)

قوتابییەکی تر: ( مامۆستا ئێمە هیچ لەم قسانە تێ ناگەین ، تکا دەکەم باسەکەتان بگۆڕن )

مامۆستا: ( مافی خۆتە باسەکەمان پێ ڕابگری ، ئێستا دەست بە وانەی ئەمڕۆمان دەکەین )

پرسیاری قوتابییەکە دەربارەی کات و وەڵامەکانی مامۆستا "ڕاز"ی گێڕایەوە بۆ ناو ئەو چەند ڕووداوە سەیرەی کە لێ ی ڕوویدا بوو: ( ئایا گەڕانەوەم لە ئەشکەوتەکەوە بۆماڵەوە چەندە کاتی بردووە؟ ئایا کاتم بە سەردا تێ پەڕی بوو؟ ئەی بۆ هەستم پێ نەکرد؟)

هەموو ئەو پرسیارانە لای ئەو بێ وەڵام بوون و هەر واش بە کراوەیی بەجێ ی هێڵان...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

عەسرەکەی کورسییەکەی برد بۆ بن دارگوێزەکە و لێ ی دانیشت، " خاڵە مەولود " ی باخەوان لە خوارەوە خۆی بە ڕێکخستنەوەی کەپری دار مێوەکانەوە خەریك کرد بوو، زۆری نەخایاند هات بۆ لای " ڕاز " و لە سەر بەردە سافەکەی بن دار گوێزەکە لێ ی دانیشت و پشتی نا بە دار گوێزەکەوە و وتی: (ژێری ئەم دار گوێزە شوێنی حەوانەوەی منە، بمبورە داوای مۆڵەتم نەکرد و لێ ی دانیشتم)

ڕاز: (" خاڵە مەولود " گیان ، دەزانم شوێنی تۆیە، بۆیە منیش هاتم هەندێ قسەی جوانت لێوەر بگرم)

خاڵە مەولود: (من تا پرسیارم لێ نەکرێت ناتوانم قسان بکەم)

ڕاز: (" خاڵە مەولود " هەست بە ئاڵۆزییەك دەکەم لە ناخ و بیرمدا، نازانم چۆن بگەم بە حەقیقەت، چۆن دروست لە ژیان بگەم؟ وا هەست دەکەم لە ناوەوە بە سەر چەند تەوەرەیەکدا دابەش بووم: تەوەرەی فیکرو مەعریفە، تەوەرەی ڕۆح، تەوەرەی عیشق و مەحەببەت، هەروەها تەوەرەی زانست، ئەم وانانەی بەرێزیشت تەوەرەی تەجروبەی ژیان، هەموو ئەمانە ئاڵۆزم دەکەن، چارەسەر چی یە؟ بە بۆچوونی بەرێزت چی بکەم باشە؟)

خاڵە مەولود: (کوری خاڵۆی لەوانەیە لە بەشێکی قسەکانت حاڵی نەبم، چونکە من پیاوێکی نەخوێندەوارم و سادە دەژیم و بیر دەکەمەوە، ئەگەر مەبەستت ئەوە بێ مرۆڤ چۆن خۆی بەختەوەر بکات، ئەوا هەمیشە " عەودالی حەق و ڕاستی ببە " و " خۆت خالی بکەرەوە لە ڕق " و " سادە لە ژیاندا بژی... "

ڕاز: (" خاڵە مەولود " ئەوەی بەرێزت فەرمووت سێ خاڵی زۆر کورت و بچووکن، بەڵام بە قەدەر مرۆڤ و ژیان فراوان و مەزنن)

خاڵە مەولود: (کوری خۆم ئەگەر بەو جۆرە بژیت کە بۆم باس کردیت دەست بۆ هەر شتێك ببەی بە حەق و ڕاستیت دەگەیەنێت)

ڕاز: (" خاڵە مەولود " گیان من دەمەوێ بزانم – جارێکی تریش پرسیارم لێ کردیت – ئەم هەموو حیکمەتە چۆن و لە کوێوە فێر بوویت؟!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

خاڵە مەولود: (کاکە "ڕاز" گیان، باوکی من عاریفێکی گەورە بوو، دەیتوانی مرۆڤ بخاتە سەر سکەیەك تاکو لە سەری بە دروستی بەگەڕ بکەوێت، ئەو دەستی منی گرت و لە زۆر هەڵەی ژیان قوتاری کردم)

ڕاز: (نابێتە بێ ئەدەبی ئەگەر بپرسم باوکت لە کوێوە فێری ئەو حیکمەتە بوو بوو؟)

خاڵە مەولود: (باوکم بەشێکی زۆر لە عومری بە گەشت و گەڕانەوە خەریك بوو، تا دوا جار لە گوندێکدا نیشتەجێ دەبێت و بیر لە ژن هێنان دەکاتەوە)

ڕاز: (یانی گەڕان فێری ئەو حیکمەتانەی کرد بوو؟)

خاڵە مەولود: (گەڕان بە تەنها بەس نی یە بۆ فێر بوونی حیکمەت، بەڵکو دەبێ مرۆڤ بزانێ بە دوای چیدا دەگەڕێ، دیار بوو ئەوەی باوکم بۆی دەگەڕا و لە پێناویدا ماندو بوو بوو بە دەستی هێنا بوو)

ڕاز: (حەز دەکەم زیاتر باسی ژیانی ئەو عاریفەم بۆ بکەی)

خاڵە مەولود: (ئەو شتەی باوکم دەستی کەوت بوو زۆر لە لای بە نرخ بوو، وەك خەزنەی چاوچنۆك دەیشاردەوە، پێ ی خۆش بوو خەڵکی بە گێل و نەزان و هەندێ جاریش خراپەکار تەماشای بکەن تاکو ئەوەی لە لایەتی بە دەر نەکەوێ...

شەوان بە ئاگا دەهاتم و باوکمم لە ژوورەکەیدا دەبینی بە ئاگایە و بە کاری خۆیەوە خەریکە، سەر لە ئێوارە دەنوست و کاتێك خەڵکی چاوانیان دەچووە خەو ئەو بە ئاگا دەهات، هەندێ شەو بۆ شۆخی سەرێکم دەکێشایە ژوورەکەی و دەموت: (وەك پارەی پیسکە بیشارەوە و بە تەنها بیژمێرە)

ئەویش سەیرێکی دەکردم و دەیوت: (هەتیوو بەم نیوەی شەوە بۆ بە ئاگا هاتووی؟)

منیش بە پێکەنینەوە دەموت: (دەمەوێ بزانم بەم نیوە شەوە چی دەکەی، لیرە دەژمێری، خەزێنەت هەیە؟!)

وەڵامی دەدامەوە و دەیوت: (بە خوا ئەگەر بە تەمای خەزێنە و لیرەی من بیت بە بێ شێو سەر دەنێیتەوە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" ڕاز " خاڵە مەولودی لە قسەكردن ڕاگرت و وتی: (ئەو كە شەوان بە ئاگا دەهات چی دەكرد و بە چی یەوە خۆی خەریك دەكرد؟!)

خاڵە مەولود: (نهێنی و ڕازی بابم دەتوت ڕازی مێش هەنگە، من لە هەموو كەس –تەنانەت لە دایكیشم– زیاتر لە باوكمەوە نزیك بووم، بەڵام كەمێكی كەم لەو تێگەیشتم، ئەو شارێكی مەزن بوو لە ئەسرار، من تەنها لە دوورەوە گڵۆپەكانی ئەو شارەم بەر چاو دەكەوت و نەگەیشتمە شەقام و كۆشك و تەلارەكانی)

ڕاز: (كارو كاسپی باوكت چی بوو؟)

خاڵە مەولود: (بەرگ دروو بوو، بە پارەیەكی كەم ژیانێكی زۆر نایابی بۆ ئێمە بەرهەم هێنا بوو)

ڕاز: (سەیر لەوەدایە لەم ژیانەدا هیچ كەسێك نی یە هەموو نهێنییەكانی خۆی دەربخات، باوكت هەموو شتەكانی خۆی بە تۆ نەگەیاند، تۆ هەموو ئەوەی كە لە لاتە بە منی ناگەیەنیت، من ئەوەی لە لامە بە برادەرەكانمی نالێم!)

خاڵە مەولود: (هەر دەبێ وابێ، تۆ دەبێ خۆت بۆ خۆت شار بونیاد بنێیت، شاری من بۆ تۆ شیاو نییە ، بینینی شاری من تەنها خەونێك لای تۆ دروست دەكات، بۆ بەدیهێنانی ئەو خەونە دەبێ خۆت هەوڵبدەیت و بكۆشیت)

ڕاز: (" خاڵە مەولود " سەیر ئەوەیە منێكی خوێندەواری هۆشیار لە بەردەم باخەوانێكی نەخوێندەواردا دەبم بە كەسێكی نەزان)

خاڵە مەولود: (دەبێ وردترو قووڵتر لە ژیان بڕوانی)

لێرەدا " خاڵە مەولود " هەستا و خواحافیزی لە " ڕاز " كرد و ڕۆیشت...

" ڕاز " بە تەنها لە ژێر دار گوێزەكە مایەوە و كەوتە بیركردنەوە: (ئەوەی زۆر گرنگ بوو بۆ من لە " خاڵە مەولود " م نەپرسی: ئەو ڕێچكە و سكەیە كامەیە مرۆڤ دەكەوێتە سەری و بە هۆیەوە جووڵە و ئاراستەی دروست وەردەگرێ، چۆن بكەومە سەر ئەو سكەیە؟ دڵنیام ئەگەر ئەو پرسیارەم بكردبایە دەیوت: ئەوە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە، سكەی هیچ كەسێك بە كەسێكی تر ناخوات، بەڵام خۆ " خاڵە مەولود " وتی: باوكم دەیتوانی مرۆڤ بخاتە سەر سكەی دروست، ئەو وتی: باوكم دەستی گرتم و لە زۆر هەڵەی ژیان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

قوتاری کردم؟! جارێکی تر پرسیاری ئەوەی لێ دەکەم: بە چ شێوازێك باوکت دەستی تۆی گرت و لە سەر سکەی دروستی ژیان ڕاوەستاوی کردیت؟ چۆن دەزانی ئەوەی تۆ لە سەری دەژیت دروست و بێ هەڵەیە؟ دروست و نادروست چی یە؟

ئێوارە لە سەر سفرەی نانخواردن "ڕاز" باسی وتووێژەکەی نێوان خۆی و "خاڵە مەولود"ی بۆ داپیرە کرد، داپیرەی لە وەڵامدا وتی: ("خاڵە مەولود" برا گەورەی منە و مامۆستا و مورشیدی "وەستا مەحمود"ی باپیرەتە)

بۆ یەکەمین جار بوو "ڕاز" قسەیەکی لەو جۆرە لە داپیرەی دەربارەی "خاڵە مەولود" ببیستێ، قسەکە ناخ و هەست و بیری "ڕاز"ی هەژاند، ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان سەیرێکی داپیرەی کرد و وتی: (داپیرە گیان مەبەستت چی یە لە برا گەورە و مامۆستا و مورشید؟)

داپیرە: (کوڕی خۆم من پەروەردەی دەستی یەکێك لەو ئافرەتانەم کە پیری مەزن پەروەردەی کرد بوو، بەر لە مەرگی وەسێتی بۆ کردم خاڵە مەولود بە برا گەورەی خۆم بزانم و لە مەیدانی ئاییندااری خۆمدا پرس و ڕای پێ بکەم، دەبێ بزانیت هیچ کەس لە خۆیەوە نابێت بە "کەس"، تۆ پێت وایە ئەم داپیرەی کە شوکر بۆ خودا پیر و گەنج و ژن و منداڵ و گەورە و بچووك خۆشیان دەوێت لە خۆیەوە بووە بەو کەسە؟ نا.. بەڵکو ڕێگای دروستی ژیانم بینیوەتەوە، لەگەڵ خۆمدا ماندو بووم تاکو گۆڕاوم بەم کەسە، خەڵکانێکی مەزن دەستیان گرتووم و ڕێگەی دروستیان نیشان داوم، "خاڵە مەولود" باخەوانمان بوو، نێوان خۆشییەکی لە ڕادەبەدەر لە نێوان "وەستا مەحمود"ی باپیرت و "خاڵە مەولود"دا هەبوو، من دەمزانی ئەو پیاوێکی ئاییندار و گەورەیە بەلام نەمدەزانی دەسەڵاتی ڕۆحی ئەو لەو ئاستەدایە، نەمدەزانی مامۆستا و مورشیدی "وەستا مەحمود"ە، تا شەوێك نیشانیان دام و بۆ بەیانی سوێندی "وەستا مەحمود"م دا تاکو ئەو ڕاستییەم لێ نەشارێتەوە و ئەویش پێی وتم کە "خاڵە مەولود" مورشیدی ڕۆحی ئەوە و لەوەوە زۆر مانای بەرز و بڵند فێر بووە و ڕێگای دروستی ژیانی بینیوەتەوە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (داپیرە نزیکترین کەس لە من تۆ بووی کەچی تۆشم نەناسی، نەناسینی " خاڵە مەولود " کە باخەوانمانە و ڕۆژانە دەیبینم بە هەر حاڵ، بەڵام چۆن تۆم نەناسیوە؟ چۆن لەوە نەگەیشتم کە تۆ مرۆڤێکی سادە نیت؟ بەڵکو شارێکی لە ئەسرار؟)

داپیرە: (کوڕی خۆم من هیچم بە تۆ نەوتووە؟!)

ڕاز: (با... بەو چەند قسەیە زۆر شتت بە من وت، ئەو چەند قسەیە گڵۆپی شاری نهێنی تۆیە کە من لە دوورەوە سەیری دەکەم، ئەو چەند قسەیە نهێنی پەیوەندی " خاڵە مەولود"ە لەگەڵ بابی خۆیدا، نهێنی پەیوەندی تۆیە بە " خاڵە مەولود " ی عاریفەوە، قسەکانی "خاڵە مەولود " قسەی خۆی نی یە بە تەنها، قسەی خۆی و باوکی و تۆ و دەیانی وەك ئێوەیە، داپیرە دەمەوێ لە ئێوە بگەم، دەمەوێ لە ئێوەوە لە ژیان بگەم، داپیرە توو ئەو شتەی لاتان پیرۆزە بمخەنە سەر ئەو ڕێگای ئێوەی لە سەرە، چۆن ئەم بەختەوەرییەتان بە دەست هێناوە؟ چی بکەم وەك ئێوەم لێ دێت؟ هەستم بەوە کرد بوو شتەکانی تۆ و " خاڵە مەولود " زۆر لە یەکترەوە نزیکن، بەڵام نەم دەزانی ناخێکی قووڵ ئێوەی بە یەکەوە گرێداوە، دەزانم ئێوە تەنها نین، کەسێکی تریش شك دەبەم وەکو ئێوە وایە...)

داپیرە: (کوڕی شیرینم ئەو پرسیارانە لە " خاڵە مەولود " بکە، من جگە لە خۆشەویستی شتێکی ترم لە لا نی یە بە تۆی ببەخشم..)

شەوەکەی دوای تەواو کردنی ئەرك و خوێندنی قوتابخانە کەوتە بیرکردنەوە لە " خاڵە مەولود " و داپیرەی، ئەو شەوە بڕیاری دا دەفتەرێك دابنێ و ڕۆژانە ئەو حیکمەتانەی تیا بنووسێتەوە، هەر ئەو شەوە دەستی کرد بە نووسینەوەی وت و وێژەکانی نێوان خۆی و پیرەمێردی ناو ئەشکەوتەکە، بڕیاری دا بوو دەفتەرەکە بۆ چەند بەشێك دابەش بکات، بەشی یەکەمی بۆ حیکمەتی پیرەمێردی ئەشکەوتەکە، ئەم بەشەی ناو نا " حیکمەتی پیران"، بەشی دووەمی تەرخان کرد بۆ حیکمەتەکانی " خاڵە مەولود " و ناوی لێنا " حیکمەتی باخەوان "، بەشی سێ یەم تەرخان کرا بوو بۆ قسەو ژیان و هەڵس و کەوتەکانی داپیرە و ناوی نابوو " حیکمەتی داپیرە "، بەشی چوارەم بۆ قسە و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گفتوگۆکانی نێوان خۆی و " لاڤە " ی خۆشەویستی تەرخان کرد بوو ناوی لێ نابوو " حیکمەتی ئەوین "، بەشی پێنجەم و کۆتایی بۆ قسەو باس و ژیانی ڕۆژانەی خۆی و مامۆستاکانی و برادەرانی لە قوتابخانە و دەرەوەی قوتابخانە دانا بوو ناوی " حیکمەتی لاوان " ی لێنا بوو، بە خەتێکی گەورەش لە سەر پشتی دەفتەرەکە نوسیبووی " کۆمارێك لە سێبەر "، دیار بوو هەر پێنج بەشەکەی بە سێبەر و خەیاڵ دەهاتە پێش چاو...

بە درێژایی دوو هەفتە شەوانە دەفتەرەکەی دەهێنا و ئەوەی پێشتر لە ژیانیدا تێپەڕی بوو دەینووسییەوە، ئەو بڕیاری دابوو پرسیار و پەیوەندی یەکانی ڕابگرێت بۆ ئەوەی باس و خواسەکان بە سەریدا کەڵەکە نەبێت و ئەوەی لەوەوبەر نەینوسیوەتەوە پیایدا بگات و تۆماریان بکات...

دوای نووسینەوەی هەموو حیکمەتەکان هەستی بە بارسووکی و ئارامییەك کرد، دەفتەرەکەی بە خەزێنەیەکی گەورە لە سەرمایەی مەعنەوی تەماشا دەکرد، جانتایەکی تایبەتی لە بازاڕ بۆ کڕی و بە جوانی دەفتەرەکەی بەرگ گرت و تیایدا هەڵی گرت...

ئەو شەوەی لە نووسینەوە بوویەوە شەوێکی پڕ لە ئارامی و بەختەوەری بوو، لە سەر پشت بە سەر جێگەکەیدا ڕاکشا و هەردوو دەستی خستە ژێر سەریەوە و لە بیری خۆیدا دەیوت: (ئەو حیکمەتانەی مرۆڤ دەیبیستێ تا نەیان نوسێتەوە لێیان تێ ناگات، من جاران بە جۆرێك لەو حیکمەتانە دەگەیشتم و ئێستا جۆرێکی تر، جاران تەنها توێکڵی حیکمەتەکانم لە بەر دەستدا بوو ئێستا کرۆك و جەوهەر، نووسین خۆ دواندنە، دەورکردنەوەی هەموو ئەو مانایانەیە کە ڕۆژانە مرۆڤ وەریان دەگرێت..)

بەیانی زوو بە ئاگا هات و لە ژوورەکەی چووە دەرەوە و ڕووی لە باخچەکە کرد، لە سەرەتاوە داپیرەی لە چێشتخانەکەدا بینی خەریکی داگیرسانی سەماوەرەکە بوو، خۆی گەیاندە لای گوڵە باخەکان و تێر تێر بۆنی کردن ، چەند جارێك پڕ بە سنگی هەوای خاوێنی بەرەبەیانی هەڵمژی، جریوە و دەنگی پاسارییەکان و خوێندنی چەند باڵندەیەکی سەوزی جوان تێکەڵ بە یەکتر بوو

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بوون، سەمفۆنیایەك بەرهەم هات بوو هیچ ئاواز دانەرێك نەی دەتوانی زمانەکەی پەی پێ ببات و نۆتەی بۆ دابنێت...

ئەو بەرەبەیانە بەختەوەری نم نم وەك باران بە سەر ژیاندا دادەباری، شەپۆلی ئاسودەیی لە لێوی تەڕی گوڵە باخەکانەوە هەڵ دەقووڵی، گوڵە خونچەکان بە بزەیەکی شیرینەوە پێشوازی ئەو ڕۆژە نوێیەیان دەکرد، نەسیمی بەرەبەیان دەچووە ژێر باڵی گەڵاکان و سەمای فێر دەکردن، لە بەرەبەیاندا ڕۆحی شتەکان دێنە لێوار و دەکەونە شنە و لەرە، کە خۆر هەڵدێ دەگەڕێنەوە بۆ ناخ و قووڵایی بوون و لێمان دەشارێنەوە، لە بەرەبەیاندا هەوا تامی هەیە، ئاسمان بۆنی هەیە، بەرد ڕووناکی دەبەخشێ...

دوای تێربوونی لە تام و بۆن و ڕەنگ، پڕ بوونی بیر و ئەندێشەی بە جوانی سروشت گەڕایەوە بۆ لای داپیرە و بەیانی باشێکی لێ کرد، داپیرە سەری هەڵبڕی و وتی: (ژیانت باش، گیانی داپیرە، چۆن بوو ئەو بەیانی یە زوو هەستای؟)

ڕاز: (ئەو بەیانی یە لەشم زۆر سووك بوو)

داپیرە: (دیارە زوو نووستووی؟)

ڕاز: (هەروەك جاران)

بێ دەنگییەك " ڕاز " و داپیرەی داگیر کرد و تا کاتی چوون بۆ قوتابخانە هیچ قسەیەك بە نێوانیاندا تێ نەپەڕی.....

** ** ** ** ** **

شەوی هەینی ماملۆستا " ئەحمەد " لەگەڵ خێزانی و منداڵەکانی میوانی ماڵی داپیرە بوون، ڕێ و ڕەسمی خواردن و خواردنەوە بە ڕسومی جاران بەڕێوە چوو...

ماملۆستا " ئەحمەد " و پوورە " فاتم " کەوتنە قسە و باسی سەردەمانی پێشوو، دیار بوو هەردووکیان لەزەتیان لە باس و خواسی پێشینان وەردەگرت و

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە ناخەوە مەیل و حەنینیان بۆ ئەو ڕۆژگارانە قوولپی دەدا، جار جاریکیش دەکەوتنە ناوهێنانی کەسانێك کە تەنها خۆیان دەیان ناسین و بە گەورە و مەزن یادیان دەکردن..

" سێبەر خان " بە خاوێن کردنەوە و ڕێکخستنی مالی پوورە "فاتم"ەوە خەریك بوو، "ئالان " بەری تەلەفزیۆنەکەی بەر نەدەدا، " لاڤە و ڕاز " یش لە لایەکەوە بە باس و خواسی خوێندنەوە خەریك بوون، لە ناو قسەکاندا – لاڤە بە دەنگێکی نزم – پرسیاری دیار نەبوونی " ڕاز " ی کرد، لە وەلامیدا وتی: (ئەو چەند هەفتەیە سەرقالی نووسین بووم)

لاڤە: (نووسینی چی؟)

ڕاز: (نوسینەوەی حیکمەتەکانی ژیان)

لاڤە: (دیارە نووسین منی لە بیر بردوویتەوە!)

ڕاز: (بە پێچەوانەوە بەشێك لە نووسینەکانم تۆی)

لاڤە: (مەبەستت ئەوەیە هۆنراوەم بۆ دادەنێ ی؟)

ڕاز: (نەخێر، هەموو ئەو حیکمەتانەی عیشقی تۆ فێرم دەکات دەینووسمەوە)

لاڤە: (مەبەستت بە حیکمەت چی یە؟)

ڕاز: (لای من هەر شتێ مرۆڤ داگیر بکات، بیخاتە بیرکردنەوە، گۆڕانی بە سەردا بهێنێ، ئاراستەی بگۆڕێ، ئەقلێ و ڕۆحی گەشە پێ بدات، حیکمەتە)

لاڤە: (جا من توانیومە ئەو کاریگەرییانە لە سەر تۆ بەجێ بهێلم؟)

ڕاز: (تۆ یەکێکی لەو حەکیمانەی حیکمەتت لێوە فێر دەبم)

لاڤە: (من بۆ خۆم وا هەست ناکەم فەلسەفەیەك لە پشت قسە و کار و هەلوێستەکانمەوە بوونی هەبێت!)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (خۆشەویستی مەزنترین فەلسەفەیە، ئەو گۆڕانەی خۆشەویستی دروستی دەکات هەزار " ئەرەستۆ " بەرهەمی ناهێنێ)

لاڤە: (ئەگەر من حەکیم بم ئەوا تۆ مامۆستای ئەو حەکیمەی)

ڕاز: (خۆ ئەگەر من عاریف بم ئەوا تۆ سەرچاوەی عیرفان و ئیلهامی منی)

ئەگەر کەسێك بهاتبایە و " ڕاز و لاڤە و مامۆستا ئەحمەد و پوورە فاتم " ی ببینیبایە، سەری لەو فەزایە سوڕ دەما کە ئەو چوارەی داگیر کرد بوو، " پوورە فاتم و مامۆستا ئەحمەد" لە قسە و باسەکەیاندا بوو بوون بە یەك ڕۆح، لە دەورو بەر دابڕابوون، دیار بوو باسی پێشینان دەستپێك و سەرەتای دەست پێ کردن بوو ئەگینا باسێکی تر بە نێوانیاندا تێ دەپەڕی...

" لاڤە و ڕاز " یش لە قووڵترین شوێنی دڵ و دەروونەوە گەوهەری قسەی پڕ لە مەحەببەتیان دەدۆزیەوە و پێشکەشی یەکتریان دەکرد...

هەر چواریان بە دەنگی " سێبەر خان " بە ئاگا هاتنەوە کە بە سینییەك کاکاوەوە هاتە ژوورەوە و داوای لێ کردن هەموو کۆ ببنەوە...

لەگەڵ خواردنەوەی کاکاودا بێ دەنگییەك هەموو لایەکی داگیر کرد بوو، دیار بوو هێشتا لە فەزای باسەکان نەهاتبوونە دەرەوە و کاریگەرییەکەی بەری نەدابوون ، " سێبەر خان " وتی: (داوای لێبوردن دەکەم ، خۆ قسە و باسەکانم پێ نەبڕیون؟)

مامۆستا ئەحمەد: (بڵێین قسە و باسمان پێ نەبڕاوە ڕاست ناکەین، بەڵام هەموومان دەبێ مەمنونی تۆ بین کە بە ئاگات هێناینەوە ئەگینا لەو فەزایە دانەدەبڕاین و وەکو کەشتی لە دەریادا نوغرۆ دەبووین)

هەموو دایانە قاقای پێکەنین و تا درەنگانێکی شەو بە خۆشی بە سەریان برد...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی " ڕاز " لەگەڵ برادەرانی: (ڕاوێژو شاروخ و جوتیار) سەردانی "یوسوف " یان کرد کە دوو ڕۆژ بوو بە هۆی پێکرانی لە یاریدا دەوامی قوتابخانەی نەکرد بوو...

" جوتیار " لە سەر تەرزی جارانی خۆی هەندێ بە " یوسوف " ی ڕابوارد: (کاك " یوسوف " یاری تۆپی پێ چیرۆك نووسین نی یە... یاری هێزی لاق و بازوی دەوێ و چیرۆکیش بیری قووڵ)

یوسوف: (باوەڕ بکە کاك " جوتیار " کەوتنەکەم زۆر ئاسایی بوو، نازانم چۆن بوو لاقم زەبری پێ گەیشت)

شاروخ: (تۆ ڕۆڵی کەروێشکت پێدرا بوو، کەروێشکیش ڕەمزی ترس و کەم بەختی یە، بۆیە ئەم پێکرانەش بەشێکە لە ڕۆڵی کەروێشك)

ڕاوێژ: (سبەینێ بۆ قوتابخانە دەگەڕێیتەوە؟)

یوسوف: (پێم وایە بتوام)

ڕاز: (خەمی وانەکانت نەبێ بۆمان نووسیویتەوە، مامۆستایان هەواڵیان دەپرسیت)

یوسوف: (سوپاسیان دەکەم، دەستی ئێوەش خۆش بێت بۆ ماندوبوونتان)

شاروخ: (من دەمەوێ بپرسم ئەم " پێنج " کەسە چ شتێك کۆی کردووینەتەوە و پێکەوە گرێ ی داوین، ئەگەر ڕۆژێك یەکێکتان نەبینم هەست بە خەمۆکی و بێزاری دەکەم)

جوتیار: (بۆی هەیە بیر و ئایدۆلۆژیامان لە یەکترەوە نزیك بێت)

شاروخ: (بە ڕای تۆ پەیوەندیەکەی ئێمە پەیوەندیەکی فیکری و ئایدۆلۆژی یە؟)

جوتیار: (بەڵێ)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاوێژ: (وا نازانم بیر و باوەڕ ئێمەی پێکەوە گرێ دابێت، لەوانەیە تەنها ئولفەت و تێکەڵاوی قوتابخانە بێت)

جوتیار: (ئەگەر ئولفەت و تێکەڵاوی قوتابخانەیە بۆ لەگەڵ کەسانی تردا ئەو جۆرە پەیوەندی یە دروست نەبووە؟)

یوسوف: (لەوانەیە خولیاکانمان، خۆزگەکانمان، خەمەکانمان ئێمەی کۆ کردبێتەوە)

ڕاز: (من وا هەست دەکەم ئێمە لە سەرەتای پەیوەندیەکداین هێشتا خۆشمان لە مانا و مەرامی ئەو پەیوەندی یە نەگەیشتووین)

شاروخ: (بۆچوونەکەت زۆر ڕوون نی یە)

ڕاز: (دەمەوێ بڵێم نهێنی یەك ئێمەی کۆکردۆتەوە کە هێشتا پەی پێ نەبراوە)

جوتیار: (هۆی پەی پێ نەبردنەکەی چی یە؟)

ڕاز: (وا دەزانم سەرەتای بوونی ئێمە بێت لە ناو ڕستی پەیوەندییەکدا)

شاروخ: (نازانم بۆ هەمیشە " ڕاز " تەفسیری میسالی بۆ شتەکان دەکات؟!)

ڕاز: (، چونکە هەست بە شتێك دەکەم، لەوانەیە تۆ هەستت پێ نەکردبێ)

شاروخ: (حەقیقەتی ئەو شتە چی یە؟)

ڕاز: (من بەر لەوەی ئێوە ببن بە دۆست و برادەرم یەك بە یەکی ئێوەیان لە خەوندا پێ ناساندووم، پێشیان وتووم سەرئەنجامی ئێمە بەرەو کوێ دەچێت)

ڕاوێژ: (مردوو مرێ خۆتم لێ مەکە بە شێخی تەریقەت)

یوسوف: (ببوورە کاك ڕاوێژ، باس لە خۆکردن بە شێخی تەریقەت نی یە، منیش هەندێ شتم لە هاوشێوەی ئەوەی لای کاك " ڕاز "ە لە لایە)

شاروخ: (دەترسم بچینەوە بۆ دارستان و ببین بە گاجووت و کەروێشك و کەڵەشێر و بولبول...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (من بە پێچەوانەوە دەیبینم، وا دەزانم لە دارستان هەڵدێین)

یوسوف: (کاك " ڕاز " مەبەستت بە دارستان جەنگەڵستانی کۆمەڵگەیە؟)

ڕاز: (بەڵێ، چونکە بیر و خولیا و خەیاڵی ئێمە بەرەو ڕووگەیەکە و کۆمەڵگەش ڕوو بە ڕووگەیەکی تر پاڵمان پێوە دەنێت)

ڕاوێژ: (ئێمە ناتوانین ڕووبەڕووی کۆمەڵگە بوەستینەوە)

یوسوف: (، بۆیە یان دەبێ ڕووگەی خۆمان وەك ئەوان لێ بکەین، یان کۆمەڵگە بەجێ بهێڵین)

شاروخ: (یان کۆمەڵگا بەو جۆرە لێ بکەین کە خۆمان دەمانەوێ)

جوتیار: (مەبەستت ئەوەیە ڕووگەی کۆمەڵگە بگۆڕین بۆ ڕووگەی خۆمان؟!)

شاروخ: (بەڵێ)

ڕاوێژ: (ئەوە کارێکی زۆر سەخت و دژوارە و پێویستی بە تەمەنێکی درێژی هەزارانی وەك ئێمەیە)

ڕاز: (هەرچۆنێك بێت، دەبێ چاوەڕوان بین، بەلآم چاوەڕوانییەکی پڕ لە ئارامی... هەریەکەمان با سەرقاڵی خەون و خولیای خۆی بێت، دوو تووێ ی داهاتوو هەواڵی سەیرو مەزنی لە خۆ گرتووە)

ڕاوێژ بە شۆخییەوە: (ئەم هەتیوە ئاوا بڕوات تێکمان دەدات)

هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد، جگە لە " یوسوف " کە زۆر بە حوزنەوە سەیری دەم و چاوی " ڕاز " ی دەکرد...

ڕۆژی شەممە لە وانەی کوردی دا گفتوگۆیەکی گەرم لە مەڕ زمان بە گشتی و زمانی کوردی بە تایبەتی کرا، لە سەرەتاوە لە مەڕ یەکەم زمان لە سەر زەویدا ڕاوبۆچوونی جیاواز ئاڵوگۆڕ کرا، یەکێك پێ ی وابوو مرۆڤ لە دەنگە جۆرا و جۆرەکانەوە فێری زمان بووە، [illegible]

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

سەریدا تێپەڕیوە ئەوجا بووە بە زمان، چونکە وردە وردە مرۆڤ ناوی لە شتەکان ناوە و ناوەکەی بە زمان گۆ کردووە، لە ناو ئەوانەشدا کەسانێك هەبوو پێی وابوو خودا بۆ خۆی مرۆڤی فێری زمان کردووە، مامۆستای وانەی کوردی هەموو ئەو بۆچوونانەی بە کراوەیی بەجێ هێلاو وتی: (تا ئێستا ساغ نەبووەتەوە مرۆڤ چۆن فێری زمان بووە، چاکتر وایە لە گۆشەیەکی ترەوە لە زمان قسە بکەین ئەویش: هۆکارەکانی گەشەسەندنی زمانە، بۆچی زمانێك گەشە دەکا و زمانێکی تر دەپووکێتەوە؟

قوتابیان لە مەڕ ئەم پرسیارەش بۆ چەند گروپێك دابەش بوون، هەندێك هۆکاری گەشەسەندنی زمانی بە گەشەسەندنی فەرهەنگ و کولتوورەوە دەبەستەوە، هەشبوو دەسەلاتی سیاسی و بوونی دەولەتی بە هۆکارێك دادەنا و لە ناو ئەوانەشدا هەبوو گەشەسەندنی زانستی و تەکنۆلۆژی بەهۆکاری گەشەی زمان لێك دەدایەوە...

مامۆستا هەموو ئەوانەی بە ڕاست و دروست لە قەلەم دا و پێ ی وابوو ڕێژە و ژمارەی قسەکەرانی هەر زمانێك کاریگەری خۆی هەیە لە سەر پێشکەوتن و دواکەوتنی زمان، چونکە کەم قسە پێ کردنی زمانێك سەر دەکێشێ بۆ پووکانەوە و ئاوابوون و تیا چوونی ئەو زمانە...

" ڕاز " ئاڕاستەی باسەکەی بە پرسیارێك گۆڕی: (ئایا ئێمەی مرۆڤ تەنها زمان – مەبەستم ئەم پارچە گۆشتەی ناو دەممانە – شك دەبەین بۆ یەکتر تێ گەیاندن، یاخود بە چەندین ڕێگەی تر دەتوانین یەکتر حالّی بکەین؟)

مامۆستا: (بە دلّنیاییەوە جگە لە قسەکردن چەندین زمانی تر بۆ ئاخافتن هەیە، نووسین زمانە، هێماکانی ترافیك لایت زمانە، سوور بوەستە، سەوز بڕۆ، ئیشارەتی دەست و دەم و چاو زمانێکی تایبەتە، کەڕولالەکان زمانی ئاماژەی تایبەت بە خۆیان هەیە)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (ئایا دەکرێت بە بێ قسە و ئاماژە و جووڵە یەکتری حاڵی بکەین؟ ئایا لە پشت هەموو ئەو زمانانەوە کە بەڕێزت باسی لێوە دەکەیت زمانێکی تر بوونی هەیە؟)

مامۆستا: (پرسیارەکەت لە لام ڕۆشن نی یە)

ڕاز: (دەمەوێ بڵێم ئایا دەکرێ تۆ لە ماڵی خۆت و من لە ماڵی خۆمەوە بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە ئامێرێك بەکاربهێنین گفتوگۆ بکەین، بە بێ ئەوەی مەبەستەکانمان بگۆڕین بۆ دەنگ و وشە یەکتری حاڵی بکەین؟)

مامۆستا: (تاکو ئەمڕۆ داهێنانێکی زانستی وا نەکراوە و نەبیستراوە، لەوانەیە لە داهاتوودا بتوانرێ کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدرێ)

قوتابییەك: (وا دەزانم ئەو پرسیارەی " ڕاز " لە دەرەوەی زانستە و ئەقڵ و بیری مرۆڤ ناتوانێ وەڵامی بداتەوە)

مامۆستا: (بۆ ناتوانێ؟ لەوانەیە چەندین توانا و هێزی شاراوە لە مرۆڤدا هەبێت و تاکو هەنووکە پەی پێ نەبرابێت)

باسەکە تا زەنگی پشوو درێژەی کێشا و هەتا قسەی لەسەر بکرابایە لق و پۆپی لێ دەبوویەوە، مامۆستا لە خاڵێکدا وەستا و داوای لێبوردنی لە قوتابییەکان کرد...

عەسری ڕۆژی دووشەممە بوو " ڕاز " بە نیازی دواندنی " خاڵە مەولود " ڕووی لە باخچەکە کرد و داوای لە " خاڵە مەولود " کرد ڕێگەی پێ بدا چەند پرسیارێکی لێ بکات، ئەویش ئامادەیی خۆی دەربڕی و فەرمووی لە لێ کرد...

سەرەتا پرسیارەکەی بەم جۆرە دەست پێ کرد: (" خاڵە مەولود " بەڕێزت پێشتر فەرمووت: باوکم دەستی گرتم و چوومە سەر سکەی دروستی ژیان و لە زۆر هەڵە منی پاراست، وات نەفەرموو؟)

خاڵە مەولود: (بەڵێ وام وت)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (ئێستا پرسیارەکەی من ئەوەیە: چۆن چۆنی و بە چ شێوازێك تۆی هێنایە سەر ئەو سکە دروستە؟)

خاڵە مەولود: (باوکم بە خۆشەویستی مامەڵەی لەگەڵ ئێمە دەکرد، لەپاڵ ئەوەش دا نموونەیەکی کرداریی و زیندووی قسەکانی خۆی بوو، شتێکی بە من نەدەوت خۆی ئەنجامی نەدابایە، سەرباری هەموو ئەوانە باوکم قسە و داواکاری زۆر کەم بوو، ئەوەندەی بە ڕۆحی باڵای کاری دەکردە ئێمە ئەوەندە قسە و بڕۆ و مەکەی نەبوو، ئەو شتەی لای باوکم بوو ئەوەندە شیرینی کرد بوو هەر کەسێك ماوەیەك لە گەڵی بژیابایە بۆی تامەزرۆ دەبوو)

ڕاز: (" خاڵە مەولود " هێشتا ئەوەی من عەودالیم باست نەکردووە، ئەو مانا و شتە جوانانە چی بوون کە لە باوکتەوە فێری بووی؟)

خاڵە مەولود: ( لە باوکمەوە فێری زۆر شت بووم:

* فێر بووم ڕقم لە هیچ کەس و هیچ شتێك نەبێتەوە...

* فێربووم بە ڕۆحێکی گەش و پڕ لە هیواوە ژیان بەسەر بەرم...

* فێربووم ڕاستگۆ و ڕاست ڕەو بم...

* فێربووم بەزەییم بە هەژار و لاواز و لێ قەوماواندا بێتەوە...

* فێربووم هەڵپە نەکەم و بە ژیانێکی سادە ڕازی بم...

* فێربووم لە هیچ شت و هیچ کەسێك نەترسم...

* فێربووم چەند کاتژمێرێك بەر لە بەرەبەیان بە ئاگا بم و لێشاوی نوور و ئارامی هەڵ بمژم...

* فێربووم هەموو شەوێك سەر دەکەمە سەر سەرین بە تەواوی قسە و کردارەکانی خۆمدا بچمەوە و ئەگەر مافی کەسێکم پێشێل کرد بێت سبەینێ بچمە لای و مافەکەی بۆ بگێڕمەوە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

* فێربووم هیچ قسە و کردارێك ئەنجام نەدەم تاکو بە باشی بیر لە سەرئەنجامەکەی نەکەمەوە...

* فێربووم هیچ کەسێك نەکەمە دۆست و برادەری خۆم تا هەڵی نەسەنگێنم...

" ڕاز " داوای کرد لە " خاڵە مەولود" گوێ ی بۆ بگرێ تاکو ئەو " دە " یاسا زێڕینەی بۆ بڵێتەوە و بزانێ بەو جۆرە لێی گەیشتووە کە " خاڵە مەولود " وتی...

" خاڵە مەولود " گوێ ی بۆ گرت و " ڕاز " یەك لە دوای یەك هەر " دە " یاساکەی بۆ دووبارە کردەوە و " خاڵە مەولود " ئافەرینی لە " ڕاز " کرد و داوای لێ کرد تەنها قسە نەبێ و کاریان پێ بکات...

ڕۆژی هەینی بە مەبەستی بینینی پیرەمێردی ناو ئەشکەوتەکە " ڕاز " شاری بەجێ هێلاّ و ڕووی لە چیای پڕ لە نوور و ئارامی کرد، ئەو هەر کاتێك بەرەو ئەو چیایە بەڕێ دەکەوت ڕۆحی لە دەریایەکی ئاسودەیی هەڵ دەژەنرا، چیاکە شوێنێکی ئاسایی نەبوو، دەتوت موگناتیسێکی زەبەلاحە و مەعدەنی وجوودی " ڕاز " ڕادەکێشێ، " ڕاز " نەی دەزانی نهێنی ئەو کەمەندکێش بوونە لە چیاکەدایە یان لە ئەشکەوتەکەدا، یاخود لە هیچ کامێکیاندا نییە و نهێنی یەکە پەیوەستە بە پیرەمێردەکەوە، ئەمجارەیان " ڕاز " زۆر بە پەرۆشەوە ڕووی لە ئەشکەوتەکە دەکرد، ئەو وای دەزانی ژیان دەریایەکە و ئەشکەوتەکە گەمێ ی ڕزگاریە و پیرەمێردەکەش زەریاوان...

" ڕاز " موسافیرێکی بیابان بوو ئاوی لێبڕا بوو، تەنها سەرچاوەیەك لێ ی پاراو ببێ کانیاوی ئەشکەوتەکە بوو...

گەیشتە بەردەم ئەشکەوتەکە و بیری لە ناو ئەشکەوتەکە دەکردەوە (بلێ ی پیرەمێردەکە لەوێ بێ؟ دەبێ بە چی یەوە خەریك بێت؟ لەوانەیە ئاگادار بێ بە هاتنی من، ئەمجارەیان چی لە گەڵدا باس بکەم؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بە دەم بیرکردنەوەوە خۆی بە ئەشکەوتەکەدا کرد، ئەشکەوتەکە سارد و سڕ بوو، ئاگری تیادا نەکرابوویەوە، دەستی خستە ناو خۆڵەمێشی کۆ ئاگرەکە، هەستی بە هیچ جۆرە گەرمییەك نەکرد، لەوەوە بۆی دەرکەوت پیرەمێردەکە چەندین ڕۆژە ئەشکەوتەکەی بەجێ هێلاوە، بە وردی ناو ئەشکەوتەکەی پشکنی، لە سەر بەردێکی ناو ئەشکەوتەکە دەفتەرێك دانرا بوو، بەردێك خرابوویە سەری، " ڕاز " دەستی بۆ برد و لاپەڕەی یەکەمی هەڵدایەوە و لە سەری نوسرابوو: " بۆ دەستی هاوەڵی ئەشکەوتم، ڕاز "

دەفتەرەکەی بە سنگییەوە نووساند و بە پەلە هاتە دەرەوە و بڕیاری دا بۆ بینینی پیرەمێردەکە ڕوو لە گوندەکەی لاپاڵی چیای ئەو سەر بکات، گوندەکە کاتژمێرێك ڕێگا بە پێیان لە ئەشکەوتەکەوە دوور بوو، بە گردێکدا سەرکەوت و گەیشتە سەر تەپۆڵکەکەی و بە دیوی خۆرئاوایدا گوندەکە بەدەرکەوت، بە لاپاڵی گردەکەدا دابەزی و لە دوورەوە و نزیك بە مزگەوتی گوندەکە خەڵکێکی زۆری کەوتە پێش چاو، ڕووی کردە خەڵکەکە و بینی هەموو چاو بە گریانن، پیاو و ژن و گەورە و بچووکی گوندەکە ڕاوەستاون و لە دەریای حوزن و فرمێسکدا نوقم بوون...

" ڕاز " لە ناخەوە زەنگێکی بۆ لێ درا و دڵەڕاوکێ و نائارامی ڕووی تێ کرد، لەگەڵ گەیشتن بە یەکەم کەس پرسیاری لێ کرد: (چی ڕوویداوە؟ کێ مردووە؟ ئەم خەڵکە بۆ دەگرین؟)

پیاوەکە بە چاوێکی پڕ لە حوزنەوە سەیرێکی ئەو مرۆڤە نامۆیەی کرد و وتی: (مەولانا...)

ڕاز: (مەولانا؟ چی بە سەر هاتووە؟!)

پیاوەکە: (مەولانا مرد)

ڕاز (ئەی ئەو کەسەی تر کێ یە لەگەڵ ئەودا مردووە؟)

پیاوەکە (دەڵێن برای ژنەکەی "مەولانا " بووە، ماوەیەك لەمەوبەر هاتە ئەم گوندە و هەواڵی "مەولانا " ی پرسی و ئێمەش شوێنەکەمان پێشان دا، لە...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

کاتەوە لە ئەشکەوتەکەدا لەگەڵ " مەولانا " دا پێکەوە دەژین، دیارە ئەویش مەرگ ڕاپێچی لای "مەولانا " ی کردووە..)

ڕاز: (بۆ " مەولانا " مرد؟ چۆن دەبێ بمرێ؟ بە چی مرد؟)

پیاوەکە: (تۆ کێیت؟ چۆن " مەولانا " دەناسی؟)

ڕاز: (" مەولانا " باوکی ڕۆحی من بوو)

لەگەڵ وتنی ئەو قسەیەدا بارانی فرمێسك لە چاوەکانی داباری و بەرەو تابووتەکەی "مەولانا " بەڕێکەوت، سەری نا بە تابووتەکەیەوە و بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە وتی: ( بۆ بەجێت هێشتم ؟ من زۆر تەنهام، تۆ باوکم بوویت، من وام دەزانی ژیان زۆری بەدەمەوە ماوە، کۆچەکەت بۆ من ناوەخت بوو، لێم ببوورە درەنگ گەڕامەوە بۆ لات، لەوانەیە چاوەڕوانم بوو بیت)

خەڵکەکە لە نێو خۆیاندا دەیانپرسی: (ئەم لاوە کێ یە؟)

دیار بوو هیچ کام لەوانە " ڕاز " یان نەدەناسی، بەڵام لایان سەیر نەبوو کەسێکی نەناسراو بۆ " مەولانا " فرمێسك بڕێژێ، چونکە ئەوان مەزنی دەسەڵاتی ڕۆحی " مەولانا " یان بۆ دەرکەوت بوو کە دەیان و سەدان مرۆڤ وەك پەروانە بە دەوری شەمعی پڕ لە نووری ئەودا دەسوڕانەوە...

دەم دەم قەرەباڵغیەکە زیادی دەکرد، چونکە لە هەموو گوندەکانەوە خەڵکی پۆل پۆل بە دەم بیستنی مەرگی " مەولانا " وە دەهاتن، هەر کەسێك بە جۆرێك خەم و پەژارەی خۆی ڕادەگەیاند...

" ڕاز " لە تابوتەکەی " مەولانا " کەمێك هاتە دواوە و پرسیاری لە پیاوێکی ڕیش سپی کرد: (کامانەن کەس و کاری " مەولانا "؟)

پیرەمێردەکە: (ئێمە هەموو کەس و کاری ئەوین)

ڕاز: (مەبەستم کوڕ و برا و خزمە نزیکەکانیەتی)

پیرەمێردەکە: (ئەو پیاوێکی غەریب بوو، خوشك و برا و کوڕ و کچی نەبوو)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ڕاز: (ئەدی لە کوێوە هات بوو؟)

پیرەمێردەکە: (نزیکەی " سی " ساڵە هاتۆتە ئەم گوندە)

ڕاز: (نەیوت لە کوێوە هاتووە؟)

پیرەمێردەکە: (مەولانا کوڕی عاریفی مەزن " مەنسووری عەتتار "ە کە خاوەنی بنەماڵەیەکی گەورە و گرانن، دوای مردنی بابی شار بەجێ دەهێڵێت و لەگەڵ " مەعسومە " خانی دایکی لەم گوندەدا نیشتەجێ بوون، مەولانا ناوی "موهتەدا " یە و لە شار خاوەنی موڵك و سەروەت و سامانێکی بێ وێنەیە، بەلاَم ئەو بڕیاری دا ژیانی زوهد و دونیا نەویستی هەڵ ببژێرێ، ئەو بەر لە مەرگی داوای لە من کرد بەڵگە و تاپۆی موڵك و سەروەت و سامانەکەی لەگەڵ ئەو شتانەی لە بنەماڵەکەیەوە بۆیان بەجێ ماوە بگرمە لای خۆم و تەسلیمی دەستی کەسێکی بکەم کە کوڕەزایەتی و لە داهاتوودا سەر هەڵ دەدات)

ڕاز: (کەسێك هەیە کوڕەزاکەی بناسێت؟)

پیرەمێردەکە: (نەخێر، بەلاَم دڵنیام سەر هەڵ دەدات، چونکە " مەولانا " لە خۆیەوە قسە ناکات)

" ڕاز " لەگەڵ خەڵکەکەدا جەنازەکەی " مەولانا " و " سمکۆ " یان هەڵگرت و بەرەو گۆڕستانی " گردی یاران" بەڕێکەوتن ، لەو جێگەیە " مەولانا " و " سمکۆ " ئەسپەردەی خاك کران و خەڵکی گوندەکان دەستە دەستە بەرەو شوێنی خۆیان گەڕانەوە، " ڕاز " یش دوای خواحافیزی لە گڵکۆی " مەولانا " بەرەو پێ دەشتەکە بەڕێ کەوت، بەر لە خۆرئاوابوون گەیشتە ماڵەوە...

سلاَوی لە داپیرە کرد و پێی وت: دەیەوێت ماوەیەك لە ژوورەکەی خۆیدا تەنها بێت، خۆی گەیاندە ژوورەکەی و لە دوای خۆیەوە دەرگاکەی داخست، لە سەر جێگەکەی دانیشت و دەفتەرەکەی دەرهێنا و لە سەرەتاوە هەندێك بۆنی کرد و چەند دڵۆپە فرمێسکێکی بە سەریدا باباراند، دەفتەرەکە بۆنی " مەولانا " و ئەشکەوتەکەی لێ دەهات، لە بەرگەکەی زۆر ورد بوویەوە، ڕەنگێکی شینی تۆخ: (بلێ ی لە هەڵبژاردنی ئەم ڕەنگەدا مەبەستێکی بوو بێ؟)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەفتەرەکەی کردەوە و لاپەڕەی یەکەمی هەڵدایەوە و بەم جۆرە نامەکەی دەست پێ کرد بوو:

: (کوڕی شیرینم، " ڕاز " هیوام ئاسودەیی و بەختەوەریتە...

چاوەڕوانت بووم ، بەڵام دیار بوو لەو ماوەیەدا تۆ سەرقاڵ بوویت...

ئازیزەکەم بەشێکی داستانەکە مابوو، دەبوا تەواوم بکردبایە، لەم نامەیەدا دوایین بەشت بۆ باس دەکەم: وتمان " ئاهو " ی مەزن " ئادۆ و ئاوا " ی هاوسەری و " ئەهرا "ی نەفرەت لێ کراوی ڕەوانەی هەرێمی یەك و ناوچەی " ئەرسا " کرد، " ئادۆ و ئاوا " هاتنە ناو ژیانێکی نوێوە، ئەوان مانگی هەنگوینیان لە باخ و دارستانە چڕو پڕەکەی هەرێمی "حەوت" دا بەسەر برد و ئێستا لە مانگی هەنگوینی گەڕاونەتەوە و دەیانەوێ ململانێ لەگەڵ ژیاندا بکەن، بۆ ڕەواندنەوەی غوربەتی تەنهایی خۆشترین شتێك بۆ " ئادۆ و ئاوا " لە دایك بوونی منداڵ بوو، " ئاوا " دوو دوو منداڵی دەبوو، هەر دوانەیەك کوڕ و کچێك بوو، پاشان لەگەڵ دوانەیەکی تردا خێزانیان لێ پێك دەهێنان و کوڕ و کچەکان ئاڵ و گۆڕ دەکران، بەو جۆرە هەرێمی " ئەرسا " بە نەوەی " ئادۆ " ئاوەدان کرایەوە، " ئاهو " ی مەزن پەیامەکانی خۆی بە " جابۆ " دا بۆ " ئادۆ " ڕەوانە دەکرد، منداڵەکانی " ئادۆ " ناکۆکی و ململانێ کەوتە نێوانیانەوە، هەندێکیان بە دەستی هەندێکی تریان خوێنیان ڕژا، " ئاهو " ی مەزن ئاگاداری شەڕ و خوێن ڕێژییەکان بوو، " ئاهو " ی مەزن دوای مردنی " ئادۆ و ئاوا " بەزەیی بە نەوەکانیاندا هاتەوە و لە ناو ئەوانەدا کەسانێکی دیاری دەکرد و " جابۆ " ی بۆ لایان ڕەوانە دەکرد، " ئاهو " ی مەزن لە پەیامەکانیدا داوای بوو نەوەکانی " ئادۆ و ئاوا " ژیان لە خۆیان تێك نەدەن و زەوی بە خوێن سوور نەکەن، بەڵام ئەوان لە شەڕەنگێزی خۆیان دەستیان نەکێشایەوە، " ئاهو " ی مەزنیش لە ناردنی پەیام بە " جابۆ " دا بەردەوام بوو، ئەو لە پیلانەکانی " ئەهرا " و پیرِ و دەستەکەی بە بەردەوامی " ئادۆ " و وەچەکانی ئاگادار دەکردەوە، پێ ی دەوتن: " ئەهرا " بوو ئێوەی لە هەرێمی "حەوت" بە دەرکردن دا، بە گوێ ی " ئاهو " ی مەزن و پەیامەکانی بکەن و لە فێڵ و پیلانەکانی " ئەهرا " خۆتان بپارێزن...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نەوەکانی " ئادۆ " بە ناوچەی " ئەرسا " دا بڵاو بوونەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شوێنە نادیارەکانی " ئەرسا " یان دەدۆزییەوە، پەییان بە نهێنی یەکانی دەبرد، ژمارەیان زیادی دەکرد، بەرانبەر بەوەش " ئاهو " ی مەزن پەیامنێرەکانی بۆ لایان زۆرتر دەکرد...

نەوەکانی " ئادۆ " هەندێ جار لە ڕادەبەدەر سنووریان دەبەزاند و گاڵتەیان بە دەسەڵاتی "ئاهو " ی مەزن دەکرد، ئەویش بۆ دەرخستن و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ڕۆڵەکانی "ئادۆ " دا لێیان دەهاتە دەست و با و باران و هەورە تریشقە و بوومەلەرزەی بە گەڕ دەخست و سەدان و هەزارانی لێ بەرباد دەکردن...

زنجیرەیەکی دوور و درێژ لە نەوەکانی " ئادۆ " سەری هەڵدا، بە هەناوی زەمەن دا هەزاران ساڵیان بڕی و بە فراوانی زەوی " ئەرسا " پەلیان هاوێشت و بڵاو بوونەوە...

دوای هەزاران ساڵ سەرکردەیەك بەناوی " مەروان " — کە سوپا سالاری میرێکی مەزن بوو — پەیدا دەبێت، بنەماڵەیەك لە دوای ئەو و لە وەچەکانی ئەو سەر هەڵ دەدا، لەو بنەماڵەیە پیاوێکی مەزن بە ناوی " مەنسووری عەتتار " لە شارێکی گەورەدا پەیدا بوو، ئەو پیاوە بە چوار پشت دەچوەوە سەر " مەروان " ی باپیرە گەورەی...

" مەنسوور " بە زانایی و عیرفان بە ناوبانگ بوو، خاوەنی تەنها کوڕێك بوو بە ناوی "موهتەدا "، ئەو زۆر حەزی دەکرد گەورەیی بنەماڵەکەی و ڕەگ و ڕیشەی خۆی بە " موهتەدا" بناسێنێت، بۆیە لە هەوڵی شەو و ڕۆژیدا مێژووی ئەو بنەماڵە مەزنەی بۆ " موهتەدا " ی تاقە کوڕی دەگێڕایەوە..

ئافرەتێك بەناوی " مەریەم " بوو بە هاوسەری " موهتەدا "، یەکتریان زۆر خۆشدەویست، خودا کوڕێکی پێ بەخشین و بە ناوی باپیرە گەورەیانەوە ناویان نا " مەروان "، دواتر "موهتەدا " بە جیلوەکردنی نووری خودا کە لە چاوی کیژۆڵەیەکەوە — بە ناوی میهری — هەڵ دەقولاَ ئەقڵی لە دەست دا و وەکو شێتێك کەوتە ناو کوچە و سەر شەقامەکان، " میهری " ش هەروەك " موهتەدا "

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

هاوسەنگی بیر و دەروونی نەما و پاش " پێنج " ساڵ مانەوە لە خەستەخانەی نەخۆشە دەروونییەکاندا کۆچی دوایی کرد..

" حەوت " ساڵ شێتێتی " موهتەدا " ی لە زانایەکەوە گۆڕی بۆ کەسێك منداڵانی شار یارییان پێ دەکرد و بەردیان لێ دەدا، لەو ساڵانەدا " مەنسووری عەتتار " کۆچی دوایی کرد و "مەریەم " یش بە منداڵەکەیەوە بۆ ماڵی بابی گەڕایەوە، پاش "حەوت" ساڵ لە شێتێتی هاوسەنگی بۆ ئەقڵی " موهتەدا " گەڕایەوە و بوویەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی، بەڵام مرۆڤێك کە هەموو شتێکی لە دەست دا بوو: باب، ژن، منداڵ، مامۆستایی، ناوبانگ، تەنانەت "میهری خوێندکاریش، هتد...

لە بیرت نەچێت تاکو ئەم جێگە و لێرە بە دواوەش من داستانەکەی " ئاهو " ی مەزنت بۆ دەگێڕمەوە...

" موهتەدا " شاری بەجێ هێلا و لەگەڵ دایکی ڕووی لە لادێیەك کرد و پاش " دە " ساڵ ژیان لەو لادێ یەدا " مەعسومە " ی دایکی کۆچی دوایی کرد، " موهتەدا " لە دوای مردنی دایکی کەمتر بۆ ئاوەدانی دەگەڕایەوە و ژیانی تەنهایی ناو ئەشکەوتی لا پەسەند بوو...

" مەریەم " ی ژنی " موهتەدا " لە سەردەمی شێتێتی "موهتەدا " دا مێردی کردەوە، بەڵام — وەك ئافرەتێکی مەرد – " مەروان " ی تاقە کوڕی بە باشترین شێوە پەروەردە کرد، ماڵی بۆ پێکەوە نا و لە تەمەنی " هەژدە " ساڵی دا ژنی بۆ هێنا، خودا وای کرد " مەریەم " لە هاوسەری دووەمی منداڵی نەبێت، بە چەند مانگێك دوای ژن هێنانی " مەروان " ی تازە لاو " مەریەم " کۆچی دوایی کرد، پێشتریش "نازداری دایکی و عەبدولای بابی" بە خەمی "مەریەم و موهتەدا " وە کۆچیان دوایی کرد بوو...

هاوسەرەکەی " مەروان " ناوی " ژیان " بوو، دوای ساڵێك لە هاوسەرگیری ژنەکەی دووگیان بوو، هێشتا منداڵەکەی نەبوو بوو "مەروان " ی هاوسەری بە بۆمبی فڕۆکە گیانی لە دەست دا ، ژنێکی سك پڕی بەجێ هێلا ، دوای " شەش " مانگ لە مردنی مێردەکەی کاتی منداڵ بوونی ئافرەتەکە هاتە پێشەوە ، لەبەر

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ترسناکی حاڵەتی منداڵبوونەکەی فڕێنرایە خەستەخانەی پارێزگا ، لە شەوێکی ساردی زستاندا لەگەڵ " سێ " ئافرەتی تردا و لە یەك کاتدا منداڵەکانیان لێ بوویەوە ، منداڵەکەی "ژیان " کوڕ بوو ، سستەر و پزیشکەکان منداڵەکەی " ژیان " یان لێ گۆڕا و دایان بە ئافرەتێکی تر بە ناوی "تابان "...

" ژیان " لەگەڵ منداڵی ئافرەتێکی تردا گەڕایەوە و منداڵەکەی ئەویش لە باوەشی "تابان" نرا و هەردوو – زۆر بە خۆشحاڵییەوە – بۆ ناو خانەوادەی خۆیان گەڕانەوە ، " تابان " منداڵەکەی ناو نا "ڕازۆ"...

پاش "هەشت" ساڵ لە منداڵبوونەکەی " تابان " ی بەناو دایکی "ڕازۆ " کۆچی دوایی کرد و " ڕازۆ " ی بەجێ هێلا...

خەسووی " تابان "، واتە " فاتیمە " خان ئافرەتێکی میهرەبان بوو ، وەك کوڕەزای خۆی باوەشی میهری بۆ " ڕازۆ " کردەوە و پەروەردەی کرد ، ئەو نەیدەزانی داپیرەی ڕاستەقینەی "ڕازۆ " نییە و " ڕازۆ " ی بەناو کوڕەزا منداڵی کەسێکی ترە...

لە بیرت بێت تاکو ئێستا لەسەر گێڕانەوەی داستانەکەی " ئاهو " ی مەزن بەردەوامم...

" ڕازۆ " گەورە بوو ، ناردیانە بەرخوێندن و قوتابییەکی زیرەك بوو، ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێکانیدا بۆ سەیران ڕوویان لە چیایەك کرد ، " ڕازۆ " هاوڕێکانی بەجێ هێلا و لێیان دوور کەوتەوە ، پاشان لە سەر چیاکە دابەزی و ڕووی لە ئەشکەوتێك کرد، لە ئەشکەوتەکەدا ڕێ ی کەوت لە پیرەمێردێك بە ناوی " مەولانا " تۆ بلێ " موهتەدا "...

ناردنی پەیام لە لایەن " ئاهو " ی مەزنەوە بۆ نەوەکانی " ئادۆ " بەردەوامە و ئەو زنجیرە ڕۆحی یە کۆتایی پێ نەهاتووە ، دوای هەزاران ساڵ پیاوێك بە ناوی "پیری مەزن " ئەرکی پەیامی دەکەوێتە سەر شان و لە دوای خۆی سێ کەس جێگەی دەگرنەوە:

یەکێکیان دەبێتە سەرچاوەی عیرفان بۆ باخەوانێك بە ناوی "خاڵە مەولود"، دووەمیان بە ڕۆحی مەزنی خۆی لە شارۆچکەیەکدا ئافرەتێکی میهرەبان پەروەردە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

دەکات و دەیکات بە داپیرەی " ڕازۆ " بەڵام لە ڕاستیدا ئەو داپیرەی " ڕازۆ " نەبوو، سێ یەمیان باپیری "ڕازۆ " ناوێك پەروەردە دەکات ، کەوابوو پیری مەزن سێ کەسی لە دوای خۆی بەجێهێڵا ، سێ کەسەکە بریتی بوون لە: باوکی " خاڵە مەولود" و باوکی " موهتەدا " و ئافرەتێك بە ناوی "حەبیبە خان"، ئەم سێ کەسەکەش هەریەکەیان کەسێکی پەروەردە کرد کە بریتی بوون لە "خاڵە مەولود و موهتەدا و فاتیمە خاتوون"، ئەو سێ کەسە پەروەردەکراوە دەبوا یەك کەس سەرۆکاری بکەن و پێی بگەیەنن کە "ڕازۆ " بوو...

" ڕازۆ " بۆ پەیامێك ئامادە دەکرا ، دەبوایە سێ سەرچاوەکەی تر لە سەرچاوەی ئەودا یەکانگیر ببوونایە ، واتە هەر سێ سەرچاوەکە لە یەك کەس دا – کە " ڕازۆ " ی لاو بوو – تێکەڵ ببوونایە...

" ئاهو " ی مەزن بە جۆگەلەی باخەوانێك دا بە ناوی "مەولود"سەرچاوەی یەکەمی گەیاندە " ڕازۆ "، بۆ سەرچاوەی دووەم " ڕازۆ " بە زۆر کرایە کوڕەزای ئافرەتە مەزنەکە و بە ڕۆحێکی لێوان لێو بە میهرەبانی – وەکو کوڕەزای خۆی – " ڕازۆ " ی پەروەردە کرد، بۆ سێیەم سەرچاوەش " ڕازۆ " درایە بەرو سەری لە ئەشکەوتێکەوە دەرچوو، پیرەمێردێك لە ئەشکەوتەکەدا بوو، فەرمان بەو پیرەمێردە کرا بوو تاکو عیرفان و نهێنی یەکانی بە "ڕازۆ" بگەیەنێت...

ئەو پیرەمێردە لە چەند ئەڵقەیەکدا داستانێك بۆ " ڕازۆ " دەگێڕێتەوە کە ئەم بەشە دوایین ئەڵقەیەتی...

" ڕازۆ " دوو جار سەردانی پیرەمێردەکەی کرد و ئەویش دوو بەشی داستانەکەی بۆ گێڕایەوە و لە گێڕانەوەی بەشی سێ یەم و کۆتایی دا مەرگ لە پیرەمێردەکە نزیك بوویەوە و هەر ئەوەندە فریا کەوت بە نووسین بەشی کۆتایی بۆ بگێڕێتەوە و دوا لاپەڕەکانی دەفتەرەکەش تەرخان بکات بۆ نهێنی عیرفان کە دەبوا وەك ڕاسپاردەیەك بە "ڕازۆ"ی بگەیەنێت...

بە مردنی پیرەمێردی ناو ئەشکەوتەکە زویر مەبە ، چونکە " ئاهو " ی مەزن لە داستانەکەیدا هەر ئەوەندە ڕۆڵی پێ بەخشی بوو، من لە ژیاندا چێژم لە مەرگ بینیوە ، ڕۆحم ڕۆحی ئەو شاعیرە بوو کە دەیوت:

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

مردن لە بوونی شەوی گونددا قسە لە سبەی دەکات ،

مردن لەگەڵ هێشوە ترێ دا دێتە ناو دەم ،

مردن لە قورگی " سوورگەروو " دا دەخوێنێت ،

مردن بەرپرسی جوانیی پەڕی " شاپاڵە " ،

مردن زۆرجار ڕێحانە دەچنێ ،

زۆرجار لە سێبەر ڕۆنیشتووە ، لێمان دەڕوانێ...

تۆش چەند ڕۆڵێکت لەو داستانە مەزنەدا پێ دەبەخشرێ و چەند لاپەڕەیەکت پێ ڕەش دەکرێتەوە ، بۆ ئەوەی خۆت و ڕۆڵی خۆتت لێ نەبێت بە خەیاڵی ڕۆماننووسێك لەو نهێنیانە بگە لە کۆتایی دەفتەرەکەدا ئاماژەم پێ کردوون...

ئەم چیرۆکە کورتەش بە ناوی " خەونی مێروولەیەك " دەکەمە دیاری ، هیوادارم لە مانا و مەبەستە شاراوەکانی بگەیت:

شا مێروولەیەك لە پەنای چیایەکی مەزندا کۆمەڵێك گەرای کرد بە ژێر خاکەوە و پاش ماوەیەك شا مێروولەکە ڕووبەڕووی مەرگ بوویەوە و کۆتایی بە ژیانی هات ، زۆری نەبرد گەراکان ترووکان و لە پەنای چیا مەزنەکەدا چاویان بە دونیا هەڵهێنا...

یەکێك لە گەراکان گەرای شاهانە بوو ، گەورە و بەهێز بوو ، خۆی کرد بە شای مێروولەکان و شاریان دروست کرد ، ئەوان چیاکەیان بە پشت و پەنای خۆیان دەزانی ، مەزنی ئەو چیایە سەرسامی کرد بوون ، شەو و ڕۆژ باسی چیاکە ویردی سەر زمانیان بوو، لە بەردەم شکۆمەندییەکەیدا بە چۆکدا دەهاتن و کڕنووشیان دەبرد...

مێروولەکان دەستیان بە زۆر بوون و نەوە خستنەوە کرد ، نەوەیەکی مێروولە لە دایك بوو پاش چەند ڕۆژێك لە بینین چاوەکانیان دەپووکایەوە و نابینا دەبوون ، مێروولەکان چاوەکانی خۆیان لە دەست دەدا و بۆ هەتا هەتایە چیا مەزنەکەیان

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لەبەرچاوان ون دەبوو، ئەوان چاویان نەبوو تاکو چیاکەی پێ ببینن ، بۆیە کوێرییەکەیان سەری کێشا بۆ حاشا کردن لە بوونی چیا مەزنەکە ، هەرچەند مێروولە چاوساغەکانی تر هەوڵیان دەدا بینینەکانی پێشوویان بە بیر بهێننەوە و پێیان دەوتن: ئێوە سەردەمانێك کەسانێکی بینا بوون و لە پەنای چیا مەزنەکەدا دەحەوانەوە ، بەڵام بیرهێنانەوە سوودێکی نەبوو...

مێروولەکان لە دەربڕینی هەستی خۆیان بەرانبەر بە چیاکە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە ، یەکێکیان دەیووت: پێویستە پەیکەرێك لە شێوەی چیا مەزنەکەدا دروست بکەین و کڕنووشی بۆ ببەین ، یەکێك دەیووت: هەر ئەوەندە بەسە کە دان بە بوونی چیا مەزنەکەدا دەنێین و شکۆمەندی دەدەینە پاڵی ، دانەیەکی تریان دەیوت: ئێمە و چیا مەزنەکە هیچ پەیوەندییەك لە نێوانماندا نییە و ئەوە ئێمەین خەیاڵ دەکەین و ئەندێشەی جۆراوجۆر لەمەڕ چیا مەزنەکە دەخولقێنین و دەیدەینە پاڵی ، بەڵام چیا مەزنەکە گەورەترە لە هەموو ئەو ئەندێشانەی ئێمە خولقاندوومانە و داومانەتە پاڵ ئەو ، مێروولەیەکی تر خەونی بینی و تیایدا چیا مەزنەکە کۆمەڵێك ڕاستی لەمەڕ خۆی و مێروولەکان درکاند بوو ، داوای لە مێروولەکانی تر کرد: وەرن با لەم خەونەوە چیاکە بناسین و خۆشەویستی خۆمانی بۆ دەربڕین ، هەندێك ملکەچی داواکەی بوون و هەندێکی تریان پشتیان تێکرد ، ژمارەی ئەو مێروولانەی خەونیان دەبینی زۆر بوو، هەریەکەیان پەردەی لەسەر نهێنییەکی چیا مەزنەکە لا دەدا ، فرەیی تێڕوانینیان بۆ چیا مەزنەکە جیاوازی لە شارە مێروولەکەدا دروست کرد ، هەر مێروولەیەکی خەونبین دەستەیەك شوێنکەوتەی بۆ پەیدا بوو، مێروولە خەونبینەکان کارەکانیان بە تەواوکەری کاری یەکتری دەزانی و لەگەڵ یەکتر لە ئەوپەڕی خۆشەویستی و تەباییدا بوون ، بەڵام شوێنکەوتەکانیان خەونی مێروولەکانیان بە پێچەوانە و سڕێنەرەوەی یەکتر لێك دەدایەوە، ناکۆکی نێوانیان سەری کێشا بۆ یەکتر تیا بردن و ڕژاندنی خوێنی یەکتری...

کەسانێکی زۆر کەم هەبوون کۆی ئەو ناکۆکیانەیان بە ناکۆکی ڕووالەتی لێك دەدایەوە و پێیان وابوو ململانێکان دەستەیەك مێروولەی هەلپەرست و بەرژەوەندیپەرست خولقاندوویانە ئەگینا گەر مێروولە خەونبینەکان جیاوازی لە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

نێوانیاندا نەبێت و خۆیان بە تەواوکاری کاری یەکتری بزانن ئیتر ئەم گشت ململانێ و خوێنڕێژییە چ مانایەکی بۆ دەمێنێتەوە؟!

مێروولەیەك لەو گشت قسە و باسەی نێوان مێروولەکان کە لەمەڕ چیا مەزنەکە دەیان کرد بێزار بوو ، بڕیاری دا شار بەجێبهێڵێت و بە چیا مەزنەکەدا سەر بکەوێت ، ئەو باکێکی بە سەختی ڕێگەکە و دژواری سەرکەوتنەکە نەبوو، بەردەوام بوو لە سەرکەوتن: بە پێی قۆناغە جیا جیا کانی سەرکەوتن بە چیاکەدا وێنا و تێگەیشتنی بۆ چیایەکە دەگۆڕا، لە سەرەتای سەرکەوتنەوە وێنایەك و لە ناوەڕاستی چیاکەدا وێنایەك و لەسەر لوتکەی چیاکەش وێنایەکی تر، کە گەیشتە لوتکە چەند ڕاستییەکی بۆ دەرکەوت ، یەکەم: ئەوەی ئەوان بە چیا مەزنەکەیان دەبینی تەنها بەشێکی کەمی بوو، چونکە چیاکە تا چاو هانا بکات درێژ بووبوویەوە و سنوورەکانی دیار نەبوو ، دووەم: ئەو سەرکەوتنە کە ئەم سەردەێکە پێیەوە خەریکە سەرکەوتن بووە بە ئەندێشە و خەیاڵ ، لە ڕاستیدا ئەو بە جەستە شارە مێروولەکەی بەجێنەهێڵاوە و تەنها خەیاڵی سەرکەوتنی کردووە ، سێ یەم: چیا مەزنەکە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەوێتە گفتوگۆ کە دەگەنە ترۆپك و بە لوتکەکەی شاد دەبن ، چوارەم: ئەو گفتوگۆ و قسەکردنەش لە ناخی مێروولەکە خۆیدایە و پەیوەست نییە بە هەستەکانی دەرەوە لە بیستن و بینین...

مێروولەکە لە دوای گەڕانەوەی لە گەشتە ڕۆحییەکەی هەندێك لەو نهێنیانەی درکاند ، باس کردنی ئەو نهێنیانە شارەمێروولەی لێخڕ کردەوە و دوای لێدانی مۆری بێ باوەڕی پارچە پارچەیان کرد...

مێروولەیەك کەوتە بیرکردنەوە لەم گشتە قەیرانەی بەرۆکی یەك بە یەکی شارە مێروولەکەی گرت بوو، بڕیاری دا سەری خۆی هەڵبگرێ و شارەکە بەجێ بهێڵێت ، ئەو دەیزانی دوورکەوتنەوە لە شارە مێروولەکە کارێکی ئاسان نییە ، ئەو گەرەکە برسی بێت ، گەرەکە تینوێتی هەناوی هەڵی بقرچێنێت ، ئەو دەبێ لە تەنهایی نەترسێت ، بەڵکو بگاتە چێژ وەرگرتن لە تەنهایی ، بیری کردەوە لە دوای دەرچوون لە شارە مێروولەکە لە چییەوە دەست پێ بکات؟ دوای سەردەمێك ڕۆچوون لەناو بیرکردنەوەدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت لە هەموو ئەو شتانە ڕابمێنێ کە لە چیا مەزنەکەوە سەرچا

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لە لاپاڵی چیا مەزنەکەوە بۆ پێدەشتەکە شۆڕ دەبوویەوە ، کەوتە شوێن پێی ئاوی کانیاوەکە ، بەشێکی بە لاپاڵ و دەشتەکە بلاو بوو بوویەوە و لێوی وشکی گژ و گیای تەڕ دەکردەوە و هەناوی تینوی گوڵەکانی پاراو دەکرد ، گوڵێك سەرنجی ڕاکێشا ، لێی نزیك بوویەوە ، ئولفەتی پێوە گرت ، ئولفەت گۆڕا بۆ خۆشەویستی، خۆشەویستی زیادی کرد و بەسەر دڵی مێرووڵەدا زاڵ بوو، پاش ماوەیەك خۆشەویستی گۆڕا بۆ عیشق ، عیشق زیادی کرد و ناوەوەی مێرووڵەکەی بە خۆی لێوان لێو کرد ، مێرووڵە بوونی خۆی لێگۆڕا بە بوونی گوڵ ، ئەو نەیدەزانی مێرووڵە بووە ، وایدەزانی گوڵبوون لە ناخیدا هەرهەرییە و بە گوڵی لە دایکبووە و وەکو گوڵیش سەردەنێتەوە ، مێرووڵەکە سەردەمێك وەکو گوڵ ژیا ، بەیانییەك لە خەو هەستا و بینی مێرووڵەیە ، لەوە گەیشتن ئەو گوڵ نەبووە و خەیاڵی بە گوڵ لێوان لێو بووە و خۆی بە گوڵ لێگۆڕراوە ، لە گەڕان ماندو بوو، لەو ڕاستییە گەیشت بە هەوڵی خۆی ناتوانێت لە چیا مەزنەکە تێبگات ، ڕێگەچارەی لەبەردەمدا نەما ، دوای تەمەنێك گەڕان ڕوو بە دەرگایەکی کلۆم هەڵشاخا ، خەمی بێئەنجامی هەوڵەکانی داگیری کرد ، لە خواردن و خواردنەوە دابڕا ، لە ژێر دار گوڵەکەدا کونێکی دروست کرد و لە ناویدا ڕاکشا ، هانای بردە لای چیا مەزنەکە و داوای لێکرد بە هانەیەوە بێت و چارەیەك بۆ دەردەکەی ببینێتەوە ، ئەو بە تەواوی تەسلیم بوونی خۆی بۆ چیا مەزنەکە ڕاگەیاند، حەز و ویست و پەلکوتینی واز لێ هێنا ، خۆی دایە دەستی ویست و بڕیاری چیا مەزنەکە ، شەوێك چیاکە هاتە خەونی و پێی وت: دەتەوێت خۆمت پێ بناسێنم؟

مێرووڵەکە زۆر بە تامەزرۆییەوە وتی: بەڵێ..

چیاکە پێی وت: سبەینێ لە گوڵەکە ڕابمێنە ، من لەناو ئەو گوڵەدا خۆم تەجەلا دەکەم و تۆش بمبینە..

بەیانی تاریك و لێڵە هەستا بۆ تێڕامان لە گوڵەکە ، ئەو بۆ تەنها ساتێکیش نەیدەویست لە گوڵەکە دوور بکەوێتەوە ، یاخود لێی بێ ئاگا ببێت ، هەتا نیوەڕۆ هیچ گۆڕانێك بەسەر گوڵەکەدا نەهات ، دوانیوەڕۆ خەریك بوو ماندو دەبوو ، جار جارێکیش بیری لە خەونەکەی دەکردەوە و لە خۆی دەپرسی: بڵێی خەونەکەم ڕاست دەربچێ و ئەمڕۆ بێتە دی؟! لـ

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

گوڵە سوورەکە زەرد هەڵگەڕا و وردە وردە بوونی گوڵەکە گۆڕا بۆ پارچە نوورێك ، پارچە نوورێك کە مانای چیا مەزنەکەی دەگەیاند ، مێروولەکە کە ئەو نوورەی بینی و لە حەقیقەتی چیا مەزنەکە گەیشت هۆش و ژیری لە دەست دا و بوو بە یەکێك لە شێتەکانی سارای بەردەم چیا مەزنەکە ، پاش ماوەیەك هۆشی بەرهاتەوە و ژیری بۆ گەڕایەوە ، هەموو ئەوەی لە تەجەلیاتی چیا مەزنەکەوە بەدەستی هێنا بوو لە دڵ و بیریدا تۆمار کرا بوو، بیری کردەوە ئەو پێویستە بۆ ناو شارە مێروولەکە بگەڕێتەوە، گەڕانەوەی ئەو شادییەکی گەورەی بە شاری مێروولەکان بەخشی ، چونکە ئەو ڕاستییەیان بۆ ساغ بوویەوە کە مێروولە لە دەرەوەی شار ناتوانێت بژیت ، ئەگەر ماوەیەکیش کەنارگیری بکات ئەوا دواجار دەبێت خۆی بە شاری مێروولان تەسلیم بکاتەوە ، بیری کردەوە چۆن ئەو ڕاستییانە بە مێروولەکان بگەیەنێت ، وتنی ئەو ڕاستییانە بوێرییەکی گەورەی دەوێت ، ئەو پێویستە لە پاڵ بوێریدا زمانێك بۆ گەیاندنی ئەو ڕاستییانە بدۆزێتەوە ، دەربڕینی ئەوەی دەرکی کرد بوو بە زمانێکی سادە زۆر گران بوو ، بۆیە هاتە سەر ئەوەی ڕاستییەکان بە زمانی ئاماژە و نموونە بۆ هێنانەوە بۆ مێروولەکان دەربڕێت ، " زمانی ئاماژە و نموونە هێنانەوە" ئەو دووپایەیە بوون کە تەواوی قسە و باسەکانی ئەوی لە ئامێز دەگرت ، مێروولەکان بە زمانی ئاماژە و نموونەکانی مێروولەی زانا ڕاهاتن ، بە ئاسانی لێی تێدەگەیشتن ، ئارامی و ئاسوودەیی بۆ شاری مێروولەکان گەڕایەوە ، ئایا ئەو نەوانەی بە دوای ئەواندا دێن دروست لە پەیامەکەی مێروولەی زانا تێدەگەن و پارێزگاری لە ئارامی و ئاسوودەیی شارەکەیان دەکەن ، یاخود دەکەونە لێکدانەوەی بێ بنەما و ئارەزووبازی و بەرژەوەندگەرایی بۆ پەیامەکە؟ پرسیارێکە و گەرەکە بیری لێ بکەیتەوە ...

تەواو...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو کەسەی تر کە لەگەڵ من ئەسپەردەی خاك دەکرێت ناوی "سمكۆ" یە خاڵی ڕاستەقینەی تۆیە...

مامۆستا "ئەحمەد" لە خاڵ بۆ تۆ لەبەرترە ، داوای دەستی "لاڤە"ی کچی بکە ، هەتا مردن لەگەڵ داپیرت "پوورە فاتم" بمێنەرەوە...

من بەجێت دەهێڵم ، بەڵام هێشتا دوو کەسی تر ماون: " خاڵە مەولود و پوورە فاتم...."

تێبینی / موڵك و ماڵ و بەجێماوی بنەماڵەکەمان لەگەڵ تەواوی بەڵگەنامەکان و قەواڵە و تاپۆدا لە ژوورێکی ماڵەکەمان دا یە و لە ناو سندوقێکی گەورەدا پارێزراوە، بۆ وەرگرتنیان پەیوەندی بە بنەماڵەی "حاجی موحسین"ە وە بکە ئەوان لەو گوندەن من تێیدا ژیام..

بابم سێ بەڵێنی لە من وەرگرت کە ئەمانەن ( یەکەم : بەڵێن دەدەم پارێزگاری لە هەموو ئەو شتانە بکەم لە بنەماڵەکەمەوە بۆم بەجێماوە، دووەم : بەڵێن دەدەم ڕێگە و ڕەوگەی ئەوان بزر نەکەم کە ڕێگەی پیاوچاکان و جوامێرانە ، سێیەم : بەڵێن دەدەم هەرچی لە توانامدا بێت بۆ خزمەتی میللەت و نەتەوەی خۆمی بەخت بکەم.. من دەیانخەمە بەردەمی تۆ ، بەڵام بوێری ئەوەم نییە داوات لێ بکەم بەڵێنم پێ بدەی جێبەجێیان بکەی...)

شاد و بەختەوەر بیت...

باپیری ڕاستەقینەت

مەولانا ( موهتەدا )

* دەیهێنمەوە بیرت تاکو نووسینی ئەم بیرهێنانەوەیە من داستانی "ئادۆ"ی مەزنم بۆ تۆ باس کردووە ، لە دوای ئەم دێرەش هەرچی لە تۆ ڕوو دەدات بەشێکە لە داستانە مەزنەکە...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

لەگەڵ تەواوکردنی خوێندنەوەی داستانەکەدا خۆی و هەموو شتەکانی دەوروبەری لێ بوو بە بوونەوەری خەیاڵی: ( من چی دەکەم لەم ژوورەدا ، ئەمە ژووره یان خەیاڵە ، بوونی من لە کوێدایە؟! لە بنچینەدا "من" بوونی هەیە؟ "بوون" چ مانایەکی هەیە ؟! ئەم دەفتەرە خەیاڵە یان واقیع؟! ئەو پیرەمێردە بوونەوەرێکی ئەندێشەیی بوو یان بوونێکی راستەقینەی هەبوو؟ ئەی من لە کوێم؟ کوا داپیرەم؟ کوانێ جوانی ، خۆشەویستی ، ناسکی؟! مانای هەموو ئەمانە لە کوێیە؟! بۆ شتەکان لە مانا خاڵی دەبنەوە؟! بۆحەقیقەت باڵی گرتەوە؟! کوانێ "لاڤه" ؟! بۆ بوو بە سەراب؟! کوا نوکتە خۆشەکانی خاڵە "ئەحمەد"؟ کوا حیکمەتەکانی "خاڵە مەولود"؟! هەموو ئەوانە لە کوێن؟! بۆ ئەم گشتە جوانی و راستییە لە داستانی ئەو پیرەمێردەدا بوو بە ئەفسانە ؟! ئەو قسانە قسەی ئەو بوون یان قسەی رۆماننووس؟ کوا شەرم و شکۆ؟ شەرم و شکۆ چ مانایەکی هەیە؟!

ئەو هەتا رۆژی لێ بوویەوە لە سەر کردنی پرسیاری بێ وەڵام بەردەوام بوو ، بەیانی لەگەڵ سپێدەی بەرەبەیاندا خۆی رووت کردەوە و هەموو پۆشاکەکانی بەری فڕێ دایە ناو باخچەکە و بە رووتی کەوتە ناو بازاڕەوە ، خەڵکی بە بینینی قسەی سەیر و سەمەرەیان دەکرد ، یەکێك دەیوت: ( شێتی ئایین بووه)

یەکێکی تر: ( خوێندنەوەی کتێب بەو دەردەی بردووە)

سێیەمیان: ( دەڵێن عاشق بووە )

لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەنگ و باسی " ڕاز " هەموو شاری داگیر کرد...

هاورێکانی بەپەلە خۆیان گەیاندە مامۆستا " ئەحمەد " و لە حاڵی " ڕاز " ئاگاداریان کردەوە ، هەر زوو بە زوو خۆیان گەیاندە " ڕاز " و ویستیان سواری ئۆتۆمبێلەکەی مامۆستا "ئەحمەد " ی بکەن ، بەلام لە دەستیان هەڵهات و بەرەو "مەزاری مەردان" لە رۆژهەلاتی شار بە ڕاکردن بۆی دەرچوو ، ئەو پڕ بە قورگی هاواری دەکرد: ( خەڵکینە ، ئەو بەرگە پەلاسە لەبەر خۆتان بکەنەوە ، وەرن با شارێك لە رووتان دروست بکەین... وەرن... وەرن...)

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

ئەو پێنج هاوڕێیە ڕۆح و سۆز و هەستیان بوو بوو بە یەك کەس ، ئەو شەوە ئەوانیش هەریەك لە ماڵی خۆی تا بەیانی نەنووستبوو ، دەنگ و سەدای "ڕاز" لە گوێی هاوڕێکانیدا دەنگ و سەدایەکی ئاسایی نەبوو ، ئەوان بە ئاوازی دەنگی ئەو مەست بوو بوون ، لەگەڵ بینینی ئەو دیمەنە نامۆیەدا هەر چوار هاوڕێ ئازیزەکەی "ڕاوێژ ، یوسوف ، شاروخ ، جوتیار" پۆشاکی بەریان فڕێ دا و کەوتنە هاوار و ڕاکردن : (مەڕۆ ، " ڕاز " ، مەڕۆ ، بەجێمان مەهێڵە...)

ئەویش بەدەم ڕاکردنەوە ئاوڕی دایەوە و بانگی دەکردن: ( ڕابکەن وەرن ، با خۆمان بە شاری ڕووتان دڵئارام بکەین.. دوام بکەون... ڕابکەن...)

مامۆستا " ئەحمەد " بە نائومێدی گەڕایەوە و " ڕاز " و هەرچوار هاوڕێکەی بەرەو زنجیرە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی شار بەڕێ کەوتن ، شێوان گەیشتنە ئەشکەوتێك کە ناوی "ئەشکەوتی ڕووتان" بوو ، لە ئەفسانەیەکدا باس لەوە کراوە گوایە شەوێك کاروانی کۆمەڵێك مرۆڤی ڕووتیان لەو ئەشکەوتەدا بینیوە و دواتر بزر بوون ..

دوای کەمێك پشوو خەویان لێ کەوت کاتێ بەئاگا هاتن "خاڵەمەولود"ی باخەوانیان لە ئەشکەوتەکەدا بینی ، جل و بەرگی هەر پێنجیان و دەفتەرەکەی " مەولانا " کە بۆ " ڕاز " ی بەجێ هێلا بوو لەگەڵ خۆی هێنا بوو ، داوای لە " ڕاز " کرد گوێی بۆ بگرێ و ڕاڤەی نهێنی لاپەڕەکانی کۆتایی دەفتەرەکەی بۆ بکات ، ئەو نهێنییانەی "مەولانا " بۆ " ڕاز " ئاماژەی پێ کرد بوو...

" ڕاز " بە وردی گوێی بۆ لێکدانەوەکانی "خاڵەمەولود" گرت ، وشە زێڕینەکانی "خاڵە مەولود" بەقووڵی کاری کردە سەر ناخ و بیری "ڕاز".

"خاڵەمەولود" لە بەشی کۆتایی دەفتەرەکەی " مەولانا " چەند دێڕێکی بۆ " ڕاز " و چوار هاوەڵەکەی خوێندەوە :

" ڕۆمان بەشێکی دانەبڕاوە لە بوونی "ڕۆماننووس" ، گەر بڵێین : ڕۆمان "ڕۆماننووس"ە بە هەڵەدا نەچووین ، چونکە کۆی بیر و ئەندێشەکانی ئەو لە ناو

ڕۆمانەکەدایە ، بیر و ئەندێشە بە

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بـوونێکی سـەربەخۆیە و لـە دوای نووسـینی بـە کەسـی "ڕۆمـاننووس"ە وە پەیوەندی نامێنێت ، بەڵام ڕۆمان بوونێکە کە "ڕۆماننووس" دەیخاتە دەرەوەی خۆیەوە ، بۆیە ئێمە و تەواوی بوون بەشێکین لە بوونی "ڕۆمـاننووس" ، ڕۆمـان بـریتی یـە لـە بـیر و هەسـت و نەسـت و خـەیاڵی کەسـێك کـە بـە نووسـین بەرجەستەیان دەکات ، ئێمە و ژیـان و گـەردوون — لـە لایـەن ڕۆماننووسـەوە — نووسـراوینەتەوە ، سـەراپای بـوون ڕۆمـانێکی نووسـراوی دەسـتی "ئـاهو"ی مەزنە...

"ڕۆمـاننووس" و زانـست و بـیر و خـەیاڵ و هەسـت و نەسـتی و "قەڵـەم و کاغـەز" و "ڕۆمـانی نووسـراو" هـەموو یـەك بـوونی زەبەلاحـە و ناتوانین لە یەکتریان دابڕین ، بەڵام هەریەکەیان لە ئاستێکی تایبەتی بووندایە ، بوونی "ئاهو" ی مـەزن لـە بـوونی "ڕۆمـان"ەکـەی بـاڵاترە ، بـەڵکو "ئـاهو" ی مەزن لە لوتکەی کەماڵی بێ سنووردایە ، "ڕۆماننووس" دەیەوێت لـە خەزێنـەی ئەسراری بوونی باڵای خۆی بخاتە دەرەوە ، ئەو دەیەوێت خۆی لـە شـکۆمەندی خۆیدا نـوقم ببێـت ، دەیـەوێت خـۆی بناسـێنێت ، خـۆی بـە کـێ بناسـێنێت لـە کاتێکـدا تـەنها "ئـەو" بـوونی هەیـە و بوونـەکانی تـر سـێبەری ئـەو بوونـەن؟ دەیەوێت خۆی بە خۆی بناسێنێت ، واتە خۆی ببێت بە ئاوێنـە بـۆ خـۆی، بۆیـە وتراوە: "هەرکەس خۆی بناسێت خوداش دەناسێت"، دەزانن بۆ؟ چونکە گـەر مرۆڤ بیەوێت خۆی بناسێت دەبێت خۆی هەڵ بکۆڵێت ، دەبێت لـە نهێنییـەکانی نـاوەوەی خـۆی بخاتـە دەرەوە ، پـەی بـە شـاراوەکانی خـۆی ببـات ، تاریکستانەکانی ناوەوە ڕۆشن بکاتەوە ، دەریای خامۆش بشڵەقێنێت و شەپۆلی هەڵچوو بە کەنارەکانی وجوودی خۆیدا بدات..

جیلوەکردنەکانی "ڕۆماننووس" کۆتایی نایەن ، ئەو لە ئەزەلـەوە "ڕۆمـان" دەنوسێت ، لە ئەزەلەوە جیلوە دەکات و مرواریەکانی دەریای نـاوەوەی خـۆی دەخاتە دەرەوە ، کردنی جیلوە و دەرهێنانی مـرواری لـە بـەرزی و بڵنـدی ئـەو خودە شکۆمەندە کەم ناکاتەوە ، ئەو کاملە و کەم ناکات ، بەکارهێنانی چەمکی

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

" کەم و زۆر " بۆ " ئاهو"ی مەزن — کە لە کەماڵێکی ڕەهادایە — بێ مانابییەکی گەورەیە...

ئەو هەر ڕۆژێکی نوێ لە شان و شکۆمەندییەکی بێ وێنەدایە: ( كل يوم هو في شأن ) ، هەموو شکۆمەندییەکانی ڕەها و بێ سنوورە و ئەمڕۆی لە دوێنێی کاملّ تر نییە ، چونکە گەر وابێت " دوێنێ " بۆ "ئاهو " ی مەزن دەبێت بە ناتەواوی ، ئەمەش بۆ گەورەیی و شکۆمەندی ئەو نەشیاوە..

"ڕۆماننووس" بوونی بەڕۆمان بەخشی ، " ڕۆمان " یش ناو و ناوبانگی "ڕۆماننووس"ی بە " ئاهو " بەخشی...

"ئاهو"ی مەزن — لە بوونی خۆی — ئێمەی هێنایە بوون ، ئێمەیش بوونی ئەومان ئاشکراکرد ، ئێمە " ڕۆماننووس " ین لە دۆخێکی تریدا، ئێمە بەفری کەوتووی قەراغ دەریایەکین لە وەرزێکی گەرما دا دەتوێینەوە و — وەك دلّۆپی ئاو — دەچۆڕێینەوە ناو دایکی دەریا...

"ڕۆماننووس" لە ڕۆمانەکەیدا خۆیشی بە یەکێك لە کەسایەتیەکانی ناو ڕۆمانە زەبەلاحەکەی باس کردووە.."

"ئاهو" ی مەزن "ڕۆماننووس"ە و کەچی خۆی کردووە بە یەکێك لە کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمانەکە ، ئایا بوون بە کارەکتەری ناو ڕۆمان بۆ "ئاهو" ی مەزن چ مانایەك دەگەیەنێ ؟ ئەو بوون بە کارەکتەرە "ئاهو" ی مەزن دەکات بە بوونێکی خەیاڵیی؟ یان دەیەوێت پێمان بڵێت : بوونی ئێوە بەشێکە لە بوونی "ئاهو"ی مەزن و بە هەموومان کار و ڕۆڵی ڕۆمانێك ڕادەپەڕێنین..؟

لەکۆتایدا هەموو ڕازیبوون پۆشاکەکان بە بەریاندا بکەنەوە ، دانیان بە بوونی خۆیاندا نا و باوەڕیان بە ژیان بۆ گەڕایەوە ، ئەوان لەگەڵ "خاڵەمەولود" بۆ شار گەڕانەوە ، گەڕانەوەی ئەوان بۆ شار گەڕانەوەی " ڕووتەکان " بوو بۆ ناو کەڵپۆست پۆشەکان ، گەڕانەوەی "شێتەکان" بوو بۆ ناو " ئاقڵان " ، تەسلیم بوونەوەی "یاخییەکان" بوو بە دەسەلات ، هاتنەوەیان بۆ شار رووخانی "شاری ڕوتەکان" بوو، هاتنەوەیان بۆ کۆمەڵگە ڕمانی کۆمارەکەیان بوو ، بەلام

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

بەڕووت بوونەوەیان سەلماندیان مرۆڤ دەتوانێ بەسەر هەموو خووخدەیەکدا زاڵ بێت ، سەلماندیان شارێکی تر هەیە ناوی شاری ڕووتەکانە ، ڕووت بوونەوەی ئەوان دابڕانیان بوو لە هەموو ئەوەی مرۆڤ خوڵقاندوویەتی...

"کۆمارێك لە سێبەر" کە تیایدا بوونی ڕاستەقینە تەنها بوونی ڕۆماننووسە ، ئێمە خاڵ و پیت و وشەین ، ئێمە ژیانمان لەگەڵ یەکتر چەند ڕستەیەکە ، ئەو ڕستانەی مانای نوێ بە وشەکان دەبەخشن ، ئەو وشانەی کە هەریەکەیان لە خودی خۆیدا مانایەکی هەیە و زۆرجار لە دوو توێی ڕستەدا مانا بنچینەییەکەی خۆی لە دەست دەدا ، "کۆمارێك لە سێبەر" کە هەموو شتێکمان بە خەیاڵ لێ دەگۆڕێ و تەنها " حیکمەتی پیران "ە مانا بە بوونمان دەبەخشێتەوە...

لەو ڕۆژەوە دەسەڵات و کۆمەڵگە نەیاندەوێرا فشار بخەنە سەر لاوەکان ، چونکە دەترسان خۆیان ڕووت بکەنەوە ، دەترسان شاری ڕووتان ئاوەدان بکەنەوە و تیایدا "کۆماری ڕووتەکان " ڕابگەیەنن...

تەواو...

An evaluation version of novaPDF was used to create this PDF file.
Purchase a license to generate PDF files without this notice.

